# فەرهەنگا گولی

## فارسی ـ کوردی

مسعود خالد گولی

دەزگەها سپیریز یا چاپ و وەشانێ

**خودانێ ئمتیازێ: حافظ قاضی**

**سەرنڤیسەر: مؤید طیب**

* کتێبا هژمار (٢)
* فەرهەنگا گولی (فارسی ـ کوردی)
* مسعود خالد گولی
* دەرهێنانا هونەری و کومپیوتەر: م. خ. گولی
* بەرگ: بەیار جەمیل
* خوەشنڤیسی: یوسف بەرواری
* چاپا ئێکێ
* ژمارا سپاردنێ: (٣٤) سالا ٢٠٠٢
* چاپخانە: وەزارەتا پەروەردێ ـ هەولێر
* تیراژ: (٥٠٠) دانە

# پێشـگۆتن

نڤیسەر و هۆزانڤانێن مە یێن کلاسیک مشە پەیڤێن فارسی بکار ئینایینە د نڤیسینێن خوە دا و ئەو ژی ڤەدگەڕت بۆ کاودانێت وی سەردەمی. ئیرۆ دەمێ ئەو دەستنڤیسێن وان دکەڤنە بەر دەستێن مە، ئەم دکەڤین ئالوزیان ژ بەر کو زمانێ وان تێکەلەک بوو ژ زمانێن: (کوردی، فارسی، تورکی وعەرەبی)، و تنێ تشتێ کو مە ژ ڤان ئالوزیان بینتە دەر دێ قاموس بن. ئەڤە ب نسبەت نڤیسینێن کلاسیکێن مە، ژ لایەکێ دیڤە ئەم(کورد) وەک مللەتەکێ زولم لێکری، هەردەم مالێت مە ل ملێن مە بووینە و ئەم یێت دەربەدەری وەلاتێن خەلکی بووین، ب تایبەتی ل نیڤا دووێ ژ چەرخێ بۆری کو ڤێ دەربەدەریێ سنوور بەزاندن و گەهشتبوو دوورترین جھ ل سەر رویێ ئەردی. پرانیا ڤان دەربەدەران ل ئیرانێ ئاکنجیبوون و بۆ ماوەیێ پتر ژ بیست سالان دگەل ئیرانیان ژیان و زاروکێن وان د خواندنگەهێن ئیرانیان ڤە و ب زمانێ ئیرانیان(فارسی) خواندن و نڤیسین. ئەڤرۆ پشتی قوربانیدانەکا زێدە، نیمچە ئازادی یەک ل هەرێما کوردستانا عیراقێ هاتیە دەست و ب رەف رەف ئەڤ دەربەدەرە یێ قەستا وەلاتێ خوە یێ خوشتڤی دکەنەڤە. ئاڤەدانی و پێشڤەچۆن ژ گەلەک ئالیانڤە ئەڤرۆ ل کوردستانا عیراقێ یا گەهشتی یە ئاستێن بلند و بەردەوامن ژی لسەر، بەلام ژ لایێ بزاڤا رەوشەنبیری ڤە هێشتا نەگەهشتیە ئاستێ پێویست، و وەکی ئەم دبینین هەر رەوشەنبیرەک ژ ئالیێ خوەڤە یێ بزاڤێ دکت کو ڤێ بۆشاییێ داگرت و ژ وان ژی زارۆکێن وان دەربەدەرا یێن کو ل ئیرانێ ب زمانێ فارسی خواندین و ئەڤرۆ دڤێن ب رێکا قەلەمێ خوە، خزمەتا رەوشەنبیری یا وەلاتێ خوە بکەن.. ئەڤ خەمخورە دو جوینن؛ جوینەک ژ وان ئەون کو دڤێن ب رێکا وەرگێڕانێ(وەرگێران ژ فارسی بۆ کوردی) خزمەتێ بکەن، کو ئەو دبینن نوبترین و گرنگترین پەرتوکێن جیهانێ ب زمانێ فارسی کەفتینە بەر دەستێن فارسی زانان، لەورا ئەو ژی حەز دکەن زوی وان پەرتوکان ب زمانێ کوردی داننە بەر دەستێن مللەتێ خوە. جوینێ دووێ ژی ئەون یێن کو ب قەلەمێ خوە و ب هزرا خوە، خوە

ئاڤێتینه مەیدانێ، بەلام هندەک ژ ڤی جوینێ دووێ ب زمانێ فارسی هزر دکن و ب کوردی وێ هزرێ دادرێژن.. دیارە ژی ئەڤ هەردو جوینە گەلەک پێدڤی قاموسەکێ نە کو بۆ وان ببتە هاریکار، بۆیە ژی مە پێکۆل کر بۆ دانانا ڤێ قاموسێ.

ژ بۆیی کو خوەندەڤان ئاگەهداری چەوانیا بەرهەڤکرنا ڤێ قاموسێ بن، من ل ژێر ب چەند خالان تێبینی یێن خوە رێزکرینە:

* یا زانایە کو زمانێ ئیرانی(نەکو یێ فارسی)، تێکەلەکە ژ گەلەک زمانان، وەکی(ئنگلیزی، تورکی، روسی، سریانی، سانسکریتی، عەرەبی، عبری، فرەنسی، یوونانی، مەغولی، هندی، ئوردویی، فارسی، کوردی و......هتد) و هەگەر من ڤیابا قاموسا (ئیرانی ـ کوردی) چێکەم، دا هینگێ مەجبوور بم کو هندی پەیڤێن ب زمانێن سلال من ناڤ لێ ئینایین د قاموسا خوە دا دەستنیشان بکەم ب مەرجەکی کو ئیرانیان ئەو ب کار ئینابن و خویایە ژی کو ب تنێ ئەو پەیڤێن ب زمانێن (عەرەبی، فرەنسی، تورکی، ئنگلیزی و یوونانی)، د ناڤ قاموس و نڤیسینێن ئیرانیان دا ب بەرچاڤ دکەڤن، رەنگە گەلەک پتر بن ژ پەیڤێن فارسی بخوە، بۆیە ژی من خوە ژ قاموسا (ئیرانی ـ کوردی) دوور خست، ئەو تێ نە کو ئەو پەیڤێن ئیرانیان ژ بیانیان وەرگرتین و وەکی خوە دارشتین، یان ژی ئەو پەیڤێن کو وەکی خوە ماین لێ بۆ هندەک واتایێن دی لکار بن، من وەرگرتینە، ژ بەر کو نهۆ ئەو مولکێ فارسا بخوەنە.

* من نەڤیا ئەز سێ چارێکێن پەیڤێن ڤێ قاموسێ ب هەمی پێشگر و پاشگر و کورتکری و......هتد) بینمە خوار، چێتر بێژین: پەیڤەک کو هەمان پەیڤ چەندین پێشگر و پاشگران وەردگرت و هەمان پەیڤ دهێتە سڤککرن و پشتی دهێتە سڤککرن، دیسان دگەل وان هەمی پێشگر و پاشگران دهێتەڤە و دوبارە و سێ بارە و چەندبارەبوونا هەمان پەیڤ ب چەند رەنگێن دی و......، من ئەڤ چەندە ب پێدڤی نەدیتیە و نابینم ژی، لێ بۆ ساناهی ئێخستن من هەر د ڤێ قاموسێ دا(ل بەرپەرێن ١٨ـ٣٠)، بابەتێ (چەند خالێن گرنگ و پێدڤی ژ دەستوورا زمانێ فارسی) بەرهەڤکریە، بۆ زانین.

* هەر دیسـان ب نسـبـەت ژێدەرەکی و کـا چەند کـار ژێ دەردکەڤـن، وەکی نموونە ژێدەرێ(رفتن: چۆن)، ئەو کارێن کـو ل هەمی دەمان و بۆ هەمی کەسان ژ ڤی ژێدەری دەردکەڤن ب تنێ پـتر ژ شێست کـارانە، ئەڤە و ژ بلی کـارێن فرمان و تێپەڕ و تێ نەپەڕ و......هتد. د ڤێ قـامـوسێ دا مـن چەندەک ژێ ئینایـنە و ئەڤـێن دی ژی لسـەر خواندەڤانی فەر دبت کو خوە بگەهینتە دەستوورا زمانێ فـارسی، و ژ بۆ ئاسـانکرنا کارێ خواندەڤانی مە د ڤێ قاموسێ دا هندەک ژ دەستوورێن دەستپێکی و د هەمان دەم دا گرنگ و بنگەهێن بەرهەڤکرینە.

* ب نسبەت بلێڤکرن(تلفظ)ا پەیڤێن فارسی:

ـ پرانیـا پەیڤـان ب چەندین رەنگان دهێنە بلێڤکرن، کو ئەڤ جیـاوازیا بلێڤکرنێ ژی، ب بەرفرەهیـا ئاخـا ئیـرانێ و ب مشـەیی یا نەتەوان ڤە گرێدایە و هەر کەسـەکی یان هەر دەڤـەرەکێ ب رەنگەکێ ئەو پەیڤ بلێـڤکرینە.. لێ من لڤـێـرە پێکـۆل کـریە بلێـڤکرنا ژ هەمـیـان بەربەلاڤـتـر دەسـتـنیـشـان بکەم و بۆ ڤێ چەندێ ژی من مـفـا ژ قـامـوسـان وەرگرتیـە. ئەڤە سـەرەرایی کـو من مـفـا ژ دوازدە سـالێن خواندنا خـوە ب زمانێ فارسی و تێکەلیا خوە یا هەڤدە سالان دگەل ئیرانیـان دیتیە. و سەرەرایی ڤێ چەندێ ژی، من نەشیایە و نەشێم ژی بدروستی چەوانی یا بلێڤکرنا پەیڤێن فارسی، ب نڤیسین، بۆ گوهێن وە بدەمە ناساندن، ژ بەرکو من مفا ژ رێنڤیسا لاتینی دیتییە ـ یا کو من چێترین رێک دیتی بۆ ڤی ئەرکی ـ و ئەڤ رێنڤیسە رەنگە بدروستی تێرا زمانێ کوردی نەکربت، ئەڤجا چ بگەهتە زمانەکێ بیانی کو ئەو ژی فـارسی بت. بۆ نموونە مە چوار رەنگێن (و)ا د رێنڤیسا لاتینی دا بۆ زمـانێ کوردی بکارئینایـنە کـو ئەو ژی (O- Û- U- W)نە، هەرچەنـدە چێدبت د زمـانێ کوردی دا بەس بۆ ڤێ تیپـێ ب تنێ ئەم پێـدڤی چـەند رەنـگێن دی ژی بـبن، ئەڤـە و د زمانێ فارسی دا ئەڤ گومـانە نـامـینت و دێ بێژین: ئەڤ چوار رەنـگە و ئەو چوارشێوە بلێڤکرنە تێرا تیـپـا (و)ا فـارسی ناکن. هەرچەندە مـەرەم ژ دانانا ڤێ قـامـوسێ نە ئەوە کـو ئەم چەوانیا بلێڤکرنا پەیڤان بدەینە ناساندن و چێدبت ژی هند گرنگیی یا خوە نەبت.

* دیسـان بۆ هندەک تیـپـان ئەز مـامـە مـەحتل کـا کـیـژان تیـپـا لاتینی بـکار بینم، وەکی: (ث، ح، ذ، ص، ض، ط، ظ، ع، غ). هندەک ژ وان من وەکی ئیـرانیـان کـا

چەوان بلێڤ دكن، تیپەكا لاتینی ب هەمان بلێڤكرن ژێرە دانایە، وەكی:

- بۆ تیپێن (ت، ط) من تیپا (T)یا لاتینی بكار بربە، ژ بەركو ئیرانی هەر دو تیپان ب یەک ئاوایی بلێڤ دكن.

- بۆ تیپێن (ث، س، ص) من تیپا (S)یا لاتینی نڤیسی یە، ژ بەركو ئیرانی هەر سێ تیپان ب یەک ئاوایی بلێڤ دكن.

- بۆ تیپێن (ذ، ز، ض، ظ) من تیپا (Z)یا لاتینی دانایە، ژ بەركو ئیرانی هەر چوار تیپان ب یەک ئاوایی بلێڤ دكن.

- بۆ تیپێن (ح، ه) من تیپا (H)یا لاتینی وەرگرتیە، ژ بەركو ئیرانی هەر دو تیپان ب یەک ئاوایی بلێڤ دكن.

هەروەسا بۆ هەر دو پەیڤێن (ع، غ) كو مە د رێنڤیسا لاتینی دا نینن، ئەز ڤەگەریامە سەر دەستوورا مە یا كوردی و كا ئەم د كوردیێ دا ل شوینا ڤان هەردو پەیڤان ب رێنڤیسا لاتینی چ بكار دئینین، من هەمان د فارسیێ دا ژی بكار ئینانینە، ئانكو:

- هەگەر تیپا (ع)، (فتحە) لسەر بت، من تیپا(E)یا لاتینی ژێرە دانایە.
- هەگەر تیپا (ع)، (كسرە) لبن بت، من تیپا(Ê)یا لاتینی ژێرە دانایە.
- هەگەر تیپا (ع)، (ضمّە) لسەر بت، من تیپا(U)یا لاتینی ژێرە دانایە.
- هەگەر لدویڤ تیپا(ع) را، تیپا(و) هاتبت، من تیپا(Û)یا لاتینی ژێرە دانایە.
- هەگەر لدویڤ تیپا(ع) را، تیپا(ا) هاتبت، من تیپا(A)یا لاتینی ژێرە دانایە.
- هەگەر تیپا(ع) ل نیڤا پەیڤێ یان دویماهی یا پەیڤێ هاتبت، من (') ژێرە دانایە.

- بۆ تیپێن (غ، خ) هەردووان من تیپا (X) یا لاتینی وەرگرتی یە. هەرچەندە ل دەڤەرێن ژێک جیاوازێن ئیرانێ هەر دو تیپێن (غ، ق) ب رەنگێن ژێک جیاواز دهێنە بلێڤ كرن، بۆ نموونە: ل باكورێ ئیرانێ هەردووان (غ) بلێڤ دكن، ل باشوورێ دەڤەرا (فارس) هەردووان (ق) بلێڤ دكن و ل دەڤەرا (كرمان) هەردووان ب (ق)ەكا وەسا بلێڤ دكن كو دەنگێ (خ) ژی ژێ دهێت، لێ ل ڤێرە مە بۆ تیپا (ق)،

تیپـا لاتینی یا (Q) ئینایه و بۆ هەردوویێن دی(خ، غ) ژی ب یەک ئاوایی (X) دانایە.

* دێ ئێینه سەر هەڤواته یان شرۆڤا کوردی کو بەرامبەر پەیڤێن فارسی یێن ڤێ قاموسێ هاتینه دانان.

مخابن، هێدی هێدی پەیڤێن رەسەن و خومالی یێن کوردی بێ بن گورێ دبن، نەخاسمه خەم هلگر دکێمن کو ڤان پەیڤان بپارێزن و نڤیسینێن مە یێن نهۆ و بێ سەروبەریا قاموسێن(کوردی ـ کوردی«زاراڤێ بەهدینی» ) شەهدەڤانێن ڤێ راستییێ نە.

ب نسبەت ڤێ خالێ، دەمێ من ڤیای هەڤواتاییێن کوردی بۆ پەیڤێن فارسی دەینم، ئەو هەڤواتا لبەر من د غەریب بوون، لەورا ژی من ل گەلەک جهان شرۆڤە بۆ پەیڤان ب فەری دیتی یە، بۆ نموونە: دەمێ دبێژین (کۆد)، ژ بەر نەبوونا (کۆد)ی ل دەمێ نهۆ و بکار نەئینانا ڤێ پەیڤێ، ل بەر من و خوەندەڤانان چێدبت ئەڤ پەیڤە غەریب بت، لێ هەگەر مە شرۆڤە کر و گۆت: (کۆد، ئانکو ترارکێ کو ژ داری هاتبته چێکرن) هینگێ فێمکرنا وێ دێ ژ نوی دەست دت. ئەڤ نموونە د مشەنە و دڤێت ژ بیر نەکین ژی کو ل گەلەک جهان مە تنێ شرۆڤە نڤیسی یە، ئەو ژی ژ بەر بدەست نەکەفتنا هەڤواتاییێ ب زمانێ کوردی(زاراڤێ بەهدینی)، ژ بەر کو هندەک ژ وان نینن و هندەکێن دی ژی یێن بەرزە بووین ژ بەر بکارنەئینانا وان. من باوەری ب خوەندەڤانان هەیە کو دێ بۆ چاپێن داهاتی ڤێ قاموسێ زەنگین تر کەن ب دانانەبەردەستا ڤان هەڤواتاییێن بەرزەبووی.

ل دویماهییێ سوپاسیا هەردو خوبشک و برایان(ژیان طاهر احمد و ئامر طاهر احمد ـ کو هەردو دەرچۆیێن کولیژا ئادابێ نە ل زانکۆیا دهۆکێ و نێزیکی بیست سالێن ژییێ خوە ل ئیرانێ بۆراندینە و هەر سێ قوناغێن خواندنێ(سەرەتایی، ناڤنجی و ئامادەیی) ل ئیرانێ و ب زمانێ فارسی خواندینە ـ) دکەم بۆ راستڤەکرنا ڤێ قاموسێ و ئامۆژگارییێن وان ل جهێن پێدڤی.

**مەسعود خالد گولی**

**دهۆک ـ ٢٠٠١/٧/٣**

## سەرچاوێن زمانێ فارسی

دەستەیەکا گرنگ ژ زمانان ب زمانێن (هندوئەوروپی) هاتینە ناڤکرن، کو ئەو ژی ئەڤەنە: هیتی ـ ئەرمەنی ـ بالتی و سلاڤی ـ ئەلبانی و ڤەنیزی و ئیلیری ـ یەونانی ـ تورکی و فریژی ـ کلتی(سلتی)ـ لاتینی ـ تخاری(اگنی و کوچی) ـ ژێرمەنی و هندوئیرانی(ئاریایی).

و پشکەکا گرنگ ژ زمانێن هندوئیرانی، کۆمێن زمانێن ئیرانی نە کو ل پەی گۆرانکاریێن کو ب سەردا هاتین، لسەر سێ جوینێن ژێری هاتینە دابەشکرن:

أ) زمانێن ئیرانی یێن کەڤن

ب) زمانێن ئیرانی یێن ناڤین

ج) زمانێن ئیرانی یێن نهۆ

هەر ئێک ژ ڤان هەر سێ جوبنا بخوە ژی، ژ چەند زمانەکان پێک دهێن کو دێ لخوارێ بەرچاڤ کەین:

### أ) زمانێن ئیرانی یێن کەڤن

زمانێن ئیرانی یێن کەڤن ژ ڤان زمانان پێک دهێت:

**١ـ میدی:** زمانێ شاهێن سنسلا میدی و خەلکێ رۆژئاڤا و ناڤەراستا ئیرانێ بوو. ژ سالا (٨٣٥)ێ بەری زایینێ و هێرڤە د نڤیسارێن شاهێن ئاشوور دا ناڤێ میدی یان هاتیە.

**٢ـ پارسی یا باستان:** ئەڤ زمانە یێ تایبەت بوو ب خەلکێ دەڤەرا (پارس)ڤە و پشتی شاهێن هەخامەنشی یا هاتینە سەر حوکمی، ئەڤ زمانە ل سەرانسەری ئیرانێ بەلاڤە بوو. نڤیسارێن داریوشێ مەزن و شاهێن دی یێن هەخامەنشی کو لسەر بەرا هاتینە نڤیسین، ب ڤی زمانی نە.

**٣ـ ئاڤێستایی:** زمانێ ئاڤێستایی زمانێ پشکەک ژ خەلکێ دەڤەرێن رۆژهلات و باکورێ رۆژهلاتێ ئیرانێ بوو و پەرتوکا پیرۆزا زەردەشت پێغەمبەری (ئاڤێستا) ب ڤی زمانی یە.

**ب) زمانێن ئیرانی یێن ناڤین**

ئەڤ کۆمەزمانە دکەڤنە د ناڤبەرا زمانێن کەڤن و نهۆ یێن ئیرانی دا. زوی ب زوی مرۆڤ نکارت بێژت کا ل کیژان دەمی ئەڤ زمانە هاتیە قادێ، لێ ژ نڤیسارێن شاهێن هەخامەنشی یان دیار دبت کو ل دویاهیا سەردەمێ دەستهەلاتداری یا هەخامەنشی یان(دۆرێت چەرخێ چوارێ بەری زایینێ)، کۆمە زمانێن ئیرانی یێن ناڤین هاتبنە مەیدانێ، ژ بەر کو ل ڤی دەمی بوو کو هێدی هێدی زمانێ پارسی یا باستانی بەرەڤ چونەیێ ڤە دچۆ، نەخاسمە ژ لایێ دستووری ڤە مشە شاشی کەتبوونە ڤی زمانی.

زمانێن ئیرانی یێن ناڤین کو هندەک پاشمای ژێ ماینە، ئەڤێن ژێرینە:

**١ـ پارتی(پەهلەڤی یا ئەشکانی):** ئەڤ زمانە تایبەت بوو ب خەلکێ دەڤەرا خوراسان کو د ناڤدار بوون ب (پارت). دەمێ کو ئەشکانی ژ ڤی مللەتی هاتینە سەر حوکمی، ئەڤ زمانە ل هەمی ئیرانێ بەلاڤ بوو و پشتی وان ساسانی ژی هەر ب ڤی زمانی ئاخفتن و نڤیسین. ژ زمانێ پەهلەڤی یا ئەشکانی چو نەمایە، دبێژن سەردەمێ ئەشکانیان حەفتێ پەرتوک ب ڤی زمانی هەبوون و ژ وان پەرتوکان: (مروک ـ سندباد ـ یوسیفاس ـ سیماس و......هتد)، لێ نهۆ چو ژ وان نەماینە و ب تنێ پەرتوکەکا بچویک یا مای ب ناڤێ (درخت آسوریک).

**٢ـ پارسی یا ناڤین:** ئەڤ زمانە، زمانێ فەرمی یێ وەلاتێ ئیرانێ بوو ل سەردەمێ ساسانیان. ژ ڤی زمانی مستەک ژ خرارەکێ ماینە. پێتڤی یە ڤێ ژێ بزانین کو پشتی عەرەبان ب سەر دەڤەرێ دا گرتی، پەرتوکێن پەهلەڤی مانە د جه دا و سەد و چەند سال بۆرین هەتا کو (ابن مقفع)ی پەرتوکێن (کلیله و دمنه) و (خداینامە) ژ پەهلەڤی کرینە عەرەبی و هندەک پەرتوکێن دی هەتا سەدسالا

حەفتێ(ئانکو شەش سەدسالا پشتی هینگێ)ژێ هێشتا خواندەڤانێن خوە هەبوون ب تایبەت ل دەڤەرا خوراسانێ، بەلێ ئەو تشتێ کو عەرەبان بێ سەروبەر کرین، مەغولیا ئەو بێ بنیات کرن. سەرەرایی ڤێ وێرانییێ، هندەک پەرتوک نهو ژێ ماینە، وەکی: [کارنامەء اردشیر بابکان ـ یادگار زریران(کو شەرناما گەرشاسبی یە دگەل ئەرجاسبی)ـ زردهشت نامە ـ خسرو گواتان(خسرو قباد)ـ پشکێن ئاڤێستایێ(کو هەر پێنج پشکێن: «یسنا، یشتها، وندیداد، ویسپرد و خردە ئاڤێستا»نە)ـ پەرتوکێن ئۆلی و چەند پەرتوکێن دی ژێ].

**٣ـ سغدی:** ئەڤ زمانە ل وەلاتێ (سغد)ـ کو «سەمەرقەند و بوخارا» سەنتەرێن ڤی وەلاتی بوون ـ بەربەلاڤ بوو و دهاتە هژمارتن زمانێ نێڤ نەتەوی یێ ئاسیایا ناڤەراست و سەرچەڤێن ڤی زمانی دگەهشتنە وەلاتێ چینێ ژی. ئەڤ زمانە ل ژێر کارتێکرنا زمانێن فارسی و تورکی هێدی هێدی ژ مەیدانێ رابوو.

**٤ـ خوتەنی:** ئێک ژ زمانێن ئیرانی یێن ناڤینە کو ل کەڤنە وەلاتێ(خوتەن ـ ل باشوورێ رۆژهلاتێ کاشغەرێ یە ـ) ب ڤی زمانی دئاخفتن.

**٥ـ خوارەزمی:** زمانێ دەڤەرا خوارەزم و دەور و بەرێن رویبارێ جەیحون بوو و خویایە کو تا چەرخێ هەشتێ یێ کۆچی ژی هێشتا مابوو و پاشان جهێ خوە دایە زمانێ فارسی و زمانێ تورکی. شوین مایێن زمانێ خوارەزمی هەمی ب خەتێ عەرەبی نە، بەلێ هێشتا هەمی بدروستاهی نەهاتینە راکرن، ژ بەر کو ئەو خەتێ پێ هاتیە نڤیسین یێ بێ خال و بێ لڤاندن(تحریک) بوو.

### ج) زمانێن ئیرانی یێن نهۆ

ئەڤ کۆمەزمانە ژ ڤان زمانێن ژێری پێک دهێت:

**١ـ فارسی یا نوی(دەری):** ئەڤ زمانە سەرەتا ل دەڤەرا خوراسانێ لکار بوو، و هێدی هێدی گەهشتە ناڤ پایتەختێ ساسانیان و پاشان بوو زمانێ دەرباری(کوچکا شاهی) ژی و بۆیە ب ڤی ناڤی(دەرباری: دەری) هاتە ناڤکرن، و نوکە ژی هەر ب ڤی زمانی دئاخڤن. ژ وان ناڤدارێن کو هەر ل سەرەتا ب ڤی زمانی نڤیسین و هاتینە

پێش؛ (رودەکی، دەقیقی، کەسایی و فیردەوسی) بوون.

یا خویایە کو پشتی زمانێ دەری بوویە زمانێ فەرمی یێ سیاسی و ئەدەبی ل هەمی ئیرانێ، ئەڤ زمانە وەک خوە نەما، ب تایبەت پشتی هوزانڤانێن دەڤەرێن ناڤەراست، رۆژئاڤا، باکور و باشوورێ ئیرانێ ب ڤی زمانی نڤیسین و ب رێکا نڤیسینێن خوە گەلەک پەیڤ و زاراوێن خوە یێن ناوچەیی یێن تایبەت ئینانە د ناڤ زمانێ دەری دا. ژ لایەکێ دیڤە زمانێ عەرەبی ژی هەر ل دەستپێکا بسەرداگرتنا ئیسلامێ ل سەر دەڤەرێ جهێ خوە د ناڤ ڤی زمانی دا کر.

**٢ـ ئاسی(ئەستی):** ئەڤ زمانە ل پشکەک ژ دەڤەرێن چیایی یێن قەفقاسێ بکار دهێت و دو زاراڤێن گرنگ و سەرەکی ڤی زمانی پێک دئینن، کو ئەو ژی: زاراڤێ(ئیرون)ی و زاراڤێ(دیکورون)ی نە.

ئەڤ مللەتێ (ئاسی) یان (ئالانی) کو ل سەر بەرپەرێن مێژوویێ مشە ناڤێ وان بەرچاڤ دبت، د بنەڕەت دا خەلکێن ئالییێ رۆژهلاتێ دەریایا خەزەرن کو کۆچ کرینە و ل ڤێ دەڤەرێ(چیاییێن قەفقاس) ئاکنجی بووینە، لەورا ژی زمانێ وان گەلەک نێزیکی زمانێن (سغدی و خوارەزمی)یە.

**٣ـ پشتو(پختو):** زمانێ ناوچەیی یێ رۆژهلاتێ ئەڤغانستانێ و پشکەکێ ژ خوجهێن سنوورێن باکورێ رۆژئاڤاییێ پاکستانێ یە. ئەڤ زمانە ژ چەند زاراڤەییێن جیاواز پێکدهێت، وەکی: (ڤەزیری، ئافەریدی، پیشاڤەری، قەندهاری ـ غلزەئی ـ بنوچی و......هتد). د زمانێ پشتو دا هێشتا (نێر و مێ) مایە.

**٤ـ بەلووچی:** ئەڤ زمانە ل پشکەکێ ژ بەلووچستانێ و هندەک دەڤەرێن تورکمەنستانا روسی لکارە.

**٥ـ کوردی:** ئەڤ زمانە تایبەتە ب مللەتەکیڤە ب ناڤێ کورد، کو وەلاتێ وان ل سەر وەلاتێن: (ئیران، تورکیا، عێراق و سوریا)یا نهۆ هاتیە پارڤەکرن.

## کەرەستێن سەرەکی یێن پێکهینەرێن زمانێ فارسی

زمانێ فارسی، زمانەکە کو ئەڤە چەند هزار سالن ل وەلاتێ ئیرانێ پێ دئاخڤن و بۆرینا دەمی گەلەک گهۆڕین لێ کرینە و هندەک ژ ڤان گهۆڕینا ل سەر پەیڤان بووینە و هندەک ژی ل دەستوورا زمانی بووینە و ئەڤ گهۆڕینە ب رێکا تێکەلبونا هندەک زمانێن دی دگەل زمانێ فارسی هاتینە کرن کو هندەک ژ وان هەڤ رە و ریشالن دگەل زمانێ فارسی و نێزیکاتی یەک یا د گەلێک هەی و هندەکێن دی ژی د بیانی نە. لخوارێ مە لبەرە وان زمانا بدەینە نیاسین یێن کو هەر ئێک ب رەنگەکی و ژ بۆ مەرەمەکێ هاتینە دناڤ زمانێ فارسی دا و بووینە کەرەستێن سەرەکی یێن پێکهێنەرێن زمانێ فارسی.

**١ـ دەری یا کەڤن:** بەلگەنامە دیار دکەن کو ل سەردەمێ ساسانیان و دەستپێکا ئیسلامەتیێ، زمانێ دەری ژی وەکی زمانێ پەهلەڤی هەبوویە و ژ وان بەلگەیان هندەک نڤشت و رستەنە کو د پەرتوکێن عەرەبی دا ژ زاردەڤێ شاهێن ساسانی و مەزنێن وی سەردەمی و ل دەستپێکا ئیسلامەتیێ هاتینە تومارکرن کو ئەڤ نڤیسینە ب زمانێ دەری یا کەڤن بووینە نەکو ب زمانێ پەهلەڤی. بۆ نموونە مرۆڤ دشێت بنێڕتە پەرتوکێن: (المحاسن والاضداد) یا (جاحظ)ی، (تاریخ)ا (طبری) و (عیون الاخبار) یا (ابن قتیبە)ی.

**٢ـ پارتی:** مشە پەیڤێن پارتی د ناڤ زمانێ فارسی دا دهێنە دیتن، وەکی: افراشتن، اندام، جاوید، خاست، فرشتە، مرغ، پور، پهلوان، چهر، شاهپور، شهر، فرزانە و......هتد.

**٣ـ پارسی یا ناڤین(پەهلەڤی):** پڕانیا پەیڤێن کو ژ ڤی زمانی هاتینە د ناڤ زمانێ فارسی دا، پەیڤێن ئۆلی(زەردەشتی)نە، وەکی: آبان، آفرینگان، ارد، اردش،

اردیبهشت، اشتاد، امرداد، انیران، اوستا، خورشید، سروش، شهریور و......هتد.

**٤ـ هندی:** ل سەردەمێ ساسانیان و ئیسلامێ، چەندین پەیڤێن هندی هاتنە د ناڤ زمانێ فارسی دا، وەکی: انبه، برشکال، جمدر، جنگل، جنم، جوکی، چاپ، چمپا، دهره، کافور، کپی، کتاره، نارگیل، نیلوفر، هلاهل و......هتد.

**٥ـ عەرەبی:** ژ ئەنجامێ هێرشێن عەرەبان و ب رێکا ئیسلامێ، مشە پەیڤێن عەرەبی هاتنە د ناڤ زمانێ فارسی دا، و هێژایی گۆتنێ یە کو، کا زمانێ عەرەبی ب چ گەرماتی و ب چ هێزەک بسەر مصرێ و سوریێ دا گرت، ب هەمان گەرماتی و هەمان هێز بسەر ئیرانێ ژی داگرت، لێ زمانێ فارسی تا حەددەکی خوە لبەر گرت و ب رێکا زمانێن: (قبطی، نبطی، ئارامی و سریانی)دا نەچۆ.

سەرەتا (هەر ژ چەرخێ ئێکێ تا چەرخێ پێنجێ)، تنێ ئەو پەیڤێن عەرەبی هاتنە د ناڤ زمانێ فارسی دا کو هەڤواتاییێن بەرامبەر وان د زمانێ فارسی دا نەبوون، وەکی: زکاة، حج، مسلم، مؤمن، کافر، جهاد، فاسق، منافق، قرآن، متعه، طلاق، قبله، شیطان، کوثر، وسوسه، دعا، عزرائیل، میکائیل، شهید، لعنة، رجیم، شنبه، جمعه و.....هتد.

هەروەسا هندەک پەیڤێن ئیداری و گەلەک پەیڤێن جۆراوجۆرێن دی ژی هاتنە دناڤ زمانێ فارسی دا، وەکی: اوّل، ثاني، غزا، غزو، سلطان، حرس، شرطة، امیر، رعیة، کاتب، کتاب، رسول، حبس، خادم، خلیفة، اتفاق، فرار، سبب، اختیار، حاکم، ادعا، راتب، حمد، شکر و......هتد.

**٦ـ تورکی:** پشتی فەرمانرەوایی یا ئیرانێ کەتیە دەستێ هندەک سنسلێن تورکا (غەزنەوی، سەلجوقی، خوارەزمشاهی و ئیلخانی)یان و مانا سوپایێ تورکا ل شار و باژێرک و گوندێن ئیرانیان، د ڤی دەمی دا زمانێ تورکی هاتە دناڤ زمانێ فارسی دا، بۆ نموونە: اتا، اتابیک(اتابک)، اطاق، باشی، بیگ(بگ)، تاش، چاروق، چخماق، خاتون، خاقان، خان، سنجاق، قاپچی، قربان(قماندان، کماندان) و.....هتد.

**٧) مەغولی:** ژ چەرخێ حەفتێ و هێرڤە، پشتی مەغولان بسەر ئیرانێ دا گرتی،

گەلەک پەیڤێن مەغولی هاتنە دناڤ زمانێ فارسی دا، وەکی: آقا، آلتون، اردو، الاغ، ایل، ایلخان، ایلچی، بهادر، تومان، سوغات، سیورمیش، قراغچی، نوکر، یاسا، یاغی و......هتد.

**٨) ئەوروپی:** ل سەردەمێ صەفەوی یان و ژ بەر هاتن و چۆنا بالیوز و بازرگانێن بیانی بۆ ئیرانێ و بەروڤاژی، هێدی هێدی پەیڤێن بیانی هاتنە دناڤ زمانێ فارسی دا. ل سەردەمێ قەجەرا ژی، ژ بەر ڤرێکرنا بالیوزێن ئیرانی بۆ وەلاتێن ئەوروپی و دامەزراندنا بالیوزخانە و کنسولی یێن وان ل تەهران و باژێرێن دی، و ب تایبەت پشتی ڤرێکرنا قوتابیان بۆ ئەوروپا ل سەردەمێ دەستەلاتداری یا (ناصرالدین شاه)ی، مشە پەیڤێن رۆژئاڤایی هاتنە دناڤ زمانێ فارسی دا.

پشتی (مشروطیت)ێ و خوەشبوونا پەیوەندی یان ل ناڤبەرا ئیرانێ و وەلاتێن رۆژئاڤایی، هێرشا پەیڤێن ئەوروپی و ئەمریکی بۆ سەر زمانێ فارسی ب هێزتر لێ هات، بۆ نموونە دێ هندەک ژ وان پەیڤان ژ ڤان هەر سێ زمانێن ژێری ئینین:

ـ **فرەنسی:** آدرس، آرتیکل، آژان، اتومبیل، ارگ، بانک، بلیط، پارتی، پارک، پارلمان، پرگرام، پلیس، پیانو، تروریست، تلفن، تلگراف، دیپلماسی، رادیکال، سالن، سانسور، سندیکا، کابینە، کمیسیون، کنفرانس، موزیک و......هتد.

ـ **ئنگلیزی:** استوپ، اسموکینگ، باسکت بال، ساندویچ، فوتبال، کتری، کوکتل، گلاس، واگن، هاف بک، گاف تایم و......هتد.

ـ **روسی:** استکان، اسکناس، بلشویک، چتور، درشکە، روبل، سماور، کالسکە، وتکا و......هتد.

## زمانێ فارسی
## پشتی دیاربوونا ئیسلامەتیێ

پشتی دیاربوونا ئیسلامەتیێ و دەمێ ڤی دینی ئیران ژی ڤەگرتی، زمانێ عەرەبی ل ڤی وەلاتی بەلاڤە بوو، و هوسا زانایێن ئیرانی یێت موسلمان ژ بەر ئولێ خوە کەتنە د ناڤ زمانێ عەرەبی دا و هەر هینگێ بوو کو نڤیسین و تۆرێ ئیرانیان بوو زمانێ عەرەبی و زمانێ عەرەبی ل ڤی وەلاتی ب درێژی یا دو چەرخا گەهشتە گوپیتکێ، ب تایبەتی ژ لایێ زانستی و ئەدەبی ڤە. و هەر د هەمان دەمدا ژی زمانێ فارسی ما زمانێ ئاخفتنێ و دانوستاندنێت رۆژانە لسەر ئاستێ مللی.

دەستپێکا چەرخێ سییێ یێ کۆچی، هندەک دەڤەرێن رۆژهلاتا ئیرانێ، وەکی: (خوراسان و سگستان و......) لبن سیبەرا خیلافەتا ئیسلامی سەرخوەبوونا خوە وەرگرتن و رێڤەبرنا دەڤەرێ کەتە د دەستێن میرێن ناڤخویی یێن بنەمالێن ناڤدارێن ئیرانی یێن کەڤن دا.. هەر هینگێ زمانێ فارسی سەروژنوی سەرهلداڤە ب تایبەتی د بیاڤێ هوزان و ئەدەبی دا، بەلآم ئەڤ زمانێ فارسی یێ نوی ل ژێر کارتێکرنا زمانێ عەرەبی بۆ ماوەیەکی درێژ گەلەک هاتبوو گوهارتن.

هەر ل ڤی دەمی بوو کو بۆ جارا ئێکێ هوزانا فارسی یا ئیسلامی ل سەردەمێ (یعقوب بن لیث ـ دامەزرێنەرێ دەولەتا صەففاری ل سگستانێ ـ) دیار بووی، ئەو ژی پشتی وان سەرکەفتنا بوو یێن کو (یعقوب بن لیث)ی بدەستڤە ئینایین، ل وی دەمی هوزانڤان و پەسنکەرێن (یعقوب)ی رابوون ب ڤەهاندنا هوزانا و پەسندانا وی ب زمانێ عەرەبی.. (یعقوب)ی گۆت: بۆچی هوبن ب وی زمانی هوزانا ب من ڤەدهینن یێ کو ئەم تێ نەگەهین ـ ژ بەر کو وەکە مە گۆتی زمانێ عەرەبی زمانێ فەرمی یێ دەولەتێ و زمانێ زانست و ئەدەبی بوو و خەلک هەر ب زمانێ خوە یێ فارسی دئاخفتن ـ، و هوزانڤان ل زمانێ فارسی زڤرین و هوزان ب زمانێ فارسی

نڤیسین و ب زمانێ فارسی پەسنێن وی دان و پشتی هینگێ زمانێ فارسی دیسان هاتەڤە مەیدانێ و زمانێ هوزانێ و نڤیسینێ ل سەردەمێ دەولەتا (سامانی) ل خوراسانێ گەلەک پێش کەت و هەر ل ڤی دەمی بوو کو ئێکەمین هوزانڤانێ مەزنێ فارسان دیار بووی کو ئەو ژی (جعفر بن محمد رودکی یێ سەمەرقەندی ٢٦٠-٣٢٩کۆچی) بوو. هەروەسا گەلەک نڤیسینێن فارسی یا نوی ل ڤی سەردەمی هاتنە مەیدانێ کو خودانێت ناڤدارترینێن وان ئەڤ زانایە بوون: (ابو علی محمد بلعمی - ابو ریحان بیرونی و ابو علی بن سینا).

دڤێ ڤێ ژی ژ بیر نەکین کو ئەڤ شورەشا ئەدەبی و رەوشەنبیری کو ب هاتنەڤا زمانێ فارسی لسەر ئاستێ ئەدەب و هونەری دیار بوویەڤە، ل دژی زمانێ عەرەبی نەراوەستیا، بەلکو زمانێ عەرەبی هەر ما زمانێ عەرەبیێ جاران و دشێین بێژین هێژ وێڤەتر ژی.

هەروەسا ل سەردەمێ سەلجوقیان ژی کو دهێتە هژمارتن گرنگترین و ناڤدارترین سەردەم بۆ مێژووا زانست و ئەدەبی ل ئیرانێ، نەبەس ب زمانێ فارسی، بەلکو ب زمانێ عەرەبی ژی، مشە زانا و نڤیسەران ب هەردو زمانان خوە بەردانە قادێ کو کێمتر نەبوون ژ ناڤدارێن چەرخێ چارێ(بیرونی و ابن سینا)ی، و هەگەر بێژین ل وی سەردەمی تۆرێ فارسی گەهشتبوو پلا گەهشتنێ، ئەڤە بەرهەمێ وێ گەهشتنێ ل چەرخێن پێنجێ و شەشێ کۆچی دیار بوو، کو بۆ نموونە ژ هوزانڤانان دکارین ڤان ناڤان بینین: (ناصر خسرو - عمر خیام - الحکیم السنائي - شیخ عطار - الخاقاني الشرواني و نظامي گنجوي)، و ژ مێژوونڤیسان: (راوندي)یێ خودانێ پەرتوکا «راحة الصدور»، و ژ فەقە و زانایان: (حجة الاسلام الامام محمد الغزالي و القشیري) و ژ وەزیر و نڤیسەران ژی، ناڤدارێن مینا: (عمید الملك الکندري و نظام الملك - وەزیرێ ناڤدار د مێژووا شارستانیا ئیسلامی دا کو گەلەک خواندنگەه ل باژێرێن وەکی: بلخ، نیشابور، هرات، اصفهان، بغداد و......هتد، ب ناڤێ وی (نظامیه) هاتینە ناڤکرن -)، ییێن ڤی سەردەمی نە.

* * *

بەری هێرشا مەغولا دەستهەلات ژ دەستێ سەلجوقی یان هاتبوو دەر و کەتبوو د دەستێن دەولەتا خوارەزمشاهی یان دا. و د هەمان دەمدا ژی دەستهەلات ژ چەنگیزخانێ مەغول کەتبوو دەستێن کورِ و نەڤیێن وی، کو ل سەردەمێ هولاکوخانی، هێرشێن وی بۆ سەر دەڤەرێ دویماهیک ب خیلافەتا ئیسلامی ل دەڤەرێ ئینا و هوسا دەستهەلاتداری ل ئیرانێ کەتە دەستێ ڤێ بنەمالێ کو ب (ئیلخانی) د ناڤدار بوون و ئێکەم کەس ژ ڤێ بنەمالێ کو ل ئیرانێ حوکم گرتیە دەست (غازان خان) بوو.

هێژ دەڤەرێ بدروستاهی بێهنا خوە نەدای ژ بەر هێرشێن مەغولا، جارەکا دی هێرش هاتنەڤە سەر دەڤەرێ و ڤێ جارێ ژ لایێ تەیموور لەنگی ڤە بوو کو ب ژێک بژالەبوونا دەولەتێ بدویماهی هات و ویرانی و پاشڤەمانێن ئێکجار زۆر بجی هشتن، کو شابیتێن ڤێ مالویرانییێ هەتا چەرخێ دەهێ کۆچی ژی مابوون، ئەو دەمێ کو دەولەتا صەفەوی دەستهەلات ئێخستی د بن رکێبا خوە و وەلات کریەڤە ئێک پارچە و ب هەمان سنورێن خوە یێن کەڤن و ل ژێر حوکمەکێ ئێکانە.

بەلاّم ژ لایێ ئەدەبی و نڤیسینێ ڤە د ڤان چەرخێن رەش دا، نڤیسەر و هوزانڤان د دەست داهێلای نەبوون، بەلکو هوزانڤانێن مەزنێن وەکی سعدی شیرازی ل چەرخێ حەفتێ و حافظ شیرازی ل چەرخێ هەشتێ خوە کرن سەمبول کو حەتا نوکە ژی وەلاتێ ئیرانێ و ئیرانی ب وان سەرفیرازن و شانازیێ ب ئەدەبێ وان دبەن. هەروەسا ژ لایێ صۆفیاتی و خودێناسیێ ڤە، هوزان ل ئیرانێ گەهشتە گوپیتکێ، ئەو ژی لسەر دەستێن هوزانڤانێن مینا: جلال الدین محمد رومی، حافظ شیرازی، عبدالرحمن جامی و......هتد.

# چەند خالێن گرنگ و پێدڤی
# ژ
# دەستوورا زمانێ فارسی

ژ بۆیی کو ئەم ژ دوبارە و چەند بارەکرنا هندەک پەیڤ و ئەنجامـێن ژێدەرێن زمـانێ فارسی خوە بدەینە پاش، مە ب فەر دیت ئاماژێ بکەینە چەند خالێن گرنگ و پێدڤی ژ دەستوورا زمانێ فارسی. بۆ نموونە مە ژ ژێدەرێ (رفتن) ب تنێ چەندین ئەنجام یێت ل خوارێ وەرگرتین کو هەگەر کت کتا وان مە د ڤێ قاموسێ دا ئینابانە خوار، پێدڤی بوو ئەڤ قاموسە ب قەبارێ خوەڤە چەند بەرامبەری ئەڤا نهۆ بایە، بۆیە ژی پێدڤی یە لسەر خواندەڤای ئاگەهداری ڤان پێزانینان بت، بەری خوە بەردەتە دناڤ قاموسێ دا.

**ژێدەر**

ژێدەر (یان ژێدەرێ سـادە)، ئەوە کـو ژ پەیڤـەکێ ب تنێ پێک دهێت، وەکی: (گرفتن ـ بردن ـ شنیدن).

د زمانێ فـارسی دا نیشـانێن ژێدەری (تن ـ دن)ن، کو ل دویماهیا پەیڤێ دهێن، ئەڤە ب مەرجەکی کو هەگەر تیپا (ن) ژ داویا پەیڤێ بهێتە راکرن، کارێ بۆری هەر ژ وێ پەیڤێ بمینتە د جه دا، وەکی:

رفتن (چۆن) «ژێدەر» --> رفت (چۆ) «کارێ بۆری»

گفتن (گۆتن) «ژێدەر» --> گفت (گۆت) «کارێ بۆری»

آمدن (هاتن) «ژێدەر» --> آمد (هات) «کارێ بۆری»

**ژێدەرێ لێکدای**

ژێدەرێ لێکدای ئەوە کو ژ دو یان چەند پەیڤان پێکهاتبت، وەکی: سخن گفتن ـ بازآمدن ـ در برگرفتن.

**ژێدەرێ دارشتی**

ژێدەرێ دارشتی، ئەوە کو هەر د بنیات دا ژێدەر نەبوویە، بەلکو (یدن) ل داوییا پەیڤا فارسی یان عەرەبی هاتیە زێدەکرن و ژێدەر ژێ چێبوویە، وەکی:

هراس + یدن = هراسیدن(ترسیان)

فهم + یدن = فهمیدن(تێ گەهشتن)

**ژێدەرێ بێ داوی**

ژێدەرێ بێ داوی یان ژێدەرێ کوری بڕی ئەو ژێدەرە کو تیپا (ن) ژ داوییا وی هاتبتە لادان، وەکی: رفت و آمد ـ گفت و شنید ـ خرید و فروخت.

**ژێدەرێ دویەمین**

هندەک کارا د زمانێ فارسی دا، دو ژێدەر یێن هەین، وەکی: (خفتن ـ خوابیدن)، (رستن ـ روییدن) و (گداختن ـ گدازیدن).

**ناڤێ ژێدەری**

ناڤێ ژێدەری ئەوە کو ئەنجام، ئانکوا ژێدەری بدەت، کو چەند جۆرن:

١) ناڤێ ژێدەری یێ کو ب تیپا (ش) ب داوی دهێت، وەکی: آموزش ـ آسایش ـ بخشش ـ پرورش و......هتد.

٢) ناڤێ ژێدەری یێ کو ب تیپێن(ار) ب داوی دهێت، وەکی: گفتار ـ کردار ـ دیدار ـ رفتار و......هتد.

٣) ناڤێ ژێدەری یێ کو ب تیپا (ی) ب داوی دهێت، وەکی: خستگی ـ آسودگی ـ تشنگی ـ زندگی و......هتد.

٤) ناڤێ ژێدەری یێ کو ل سەر کێشا کارێ بۆری یێ کت دهێت، کو دهێت وەکی ژێدەرێ بێ داوی ژێ، وەکی: گذشت ـ نشست ـ خرید ـ برید و......هتد.

٥) ناڤێ ژێدەری کو ژ رەگەزێ (کارێ فرمان بۆ کەسێ کت) پێک دهێت، وەکی: (رم ـ هراس ـ خرام ـ خراش ـ پسند) کو ژێدەرێن (رمیدن ـ هراسیدن ـ خرامیدن ـ خراشیدن ـ پسندیدن) ژێ هاتینە چێکرن.

هەژی گوتنێ یە کو ناڤێ ژێدەری ژ هەمی ژێدەران ناهێتە دروستکرن، بۆ نموونە ژ ژێدەرێ (خواندن) ناڤێ ژێدەری دروست نابیت.

**کـــار**

کار، ئەو پەیڤە یا کو ئەنجامدانا کارەکی بگەهینت د ئێک ژ هەر سێ دەمێن سێکانە دا(بۆری ـ نهۆ ـ ئایندە). دابەشبونا کاری لسەر شەش کەسانە، کو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە:

| | | |
|---|---|---|
| ـ کەسێ ئێکەم یێ ئاخفتنکەر | «من» | (ئەز ـ من) |
| ـ کەسێ دووەم یێ کو دگەل دئاخڤن | «تو» | (تو ـ تە) |
| ـ کەسێ سێ یەم یێ کو د ئاخفتنێ دا بەحسێ وی دهێتەکرن | «او، وی» | (ئەو ـ وی، وێ) |
| ـ کەسێن ئێکەم یێن ئاخفتنکەرێن | «ما» | (ئەم ـ مە) |
| ـ کەسێن دووەم یێن کو دگەل دئاخڤن | «شما» | (هوین ـ وە) |
| ـ کەسێن سێ یەم یێن کو د ئاخفتنێ دا بەحسێ وان دهێتەکرن | «ایشان، آنها» | (ئەو ـ وان) |

**کارێ بۆری**

ئەو کارە یێ کو لدەمێ بۆری هاتیە ئەنجامدان و پێنج جۆرن:

١) **کارێ بۆری یێ خوەسەر:** ئەو کارە یێ کو ل دەمێ بۆری هاتیە ئەنجامدان

بێ ی دیارکرنا چەوایەتییێ، وەکی:

رفتم --> (ئەز) چۆم

رفتی --> (تو) چۆی

رفت --> (ئەو) چۆ

رفتیم --> (ئەم) چۆین

رفتید --> (هوین) چۆن

رفتند --> (ئەو) چۆن

**٢) کـــارێ بۆری یێ بەردەوام:** ئەو کـــارە یێ کـــو ل دەمێ بۆری ب رەنگەکێ بەردەوام هاتبتە ئەنجامدان، و نیشانا وی (می ـ همی)یە لسەرێ کاری، وەکی:

می رفتم ـ همی رفتم --> (ئەز) دچۆم

می رفتی ـ همی رفتی --> (تو) دچۆی

می رفت ـ همی رفت --> (ئەو) دچۆ

می رفتیم ـ همی رفتیم --> (ئەم) دچۆین

می رفتید ـ همی رفتید --> (هوین) دچۆن

می رفتند ـ همی رفتند --> (ئەو) دچۆن

**٣) کـارێ بۆری یێ نەقلی:** کـارێ بۆری یێ نەقلی دو جـۆرن، ئێـک ژێ ئەوە کـو کار ب دروستاهی ب دوماهی هاتبت، وەکی:

خواندەام --> (من) یێ خواندی، یا خواندی

خواندەای --> (تە) یێ خواندی، یا خواندی

خواندە است --> (وی) یێ خواندی، (وێ) یا خواندی

خواندەایم --> (مە) یا خواندی

خواندەاید --> (وە) یا خواندی

خواندەاند --> (وان) یا خواندی

ئانکو؛ بێت خواندین و بێت ژ خواندنێ ب دویماهی هاتین.

**جۆرێ دووێ** ئەوە کو ب دروستاهی کار ب دوماهی نەهاتبت، وەکی:

ایستادەام --> (ئەز) یێ راوەستیایمە، یا راوەستیایمە

ایستادەای --> (تو) یێ راوەستیایی، یا راوەستیایی

ایستادە است --> (ئەو) یێ راوەستیایە، یا راوەستیایە

ایستادەایم --> (ئەم) یێت راوەستیاینە

ایستادەاید --> (هوین) یێت راوەستیاینە

ایستادەاند --> (ئەو) یێت راوەستیاینە

ئانکو؛ یێت راوەستیاین و هێشتا ژی د راوەستیاینە.

**٤) کارێ بۆری یێ دویر:** ئەو کارە یێ کو ل دەمەکێ بۆری یێ دویر هاتبتە ئەنجامدان، وەکی:

رفتە بودم --> (ئەز) چۆبووم

رفتە بودی --> (تو) چۆبووی

رفتە بود --> (ئەو) چۆبوو

رفتە بودیم --> (ئەم) چۆبووین

رفتە بودید --> (هوین) چۆبوون

رفتە بودند --> (ئەو) چۆبوون

**٥) کارێ بۆری یێ ئیلتیزامی:** ئەو کارە یێ کو ب ئەنجام گەهشتنا وی، جهێ شک و گومانێ بت، وەکی:

باید رفتە باشم --> پێویستە (ئەز) چۆبم

باید رفتە باشی --> پێویستە (تو) چۆبی

باید رفتە باشد --> پێویستە (ئەو) چۆبت

باید رفتە باشیم --> پێویستە (ئەم) چۆبین

باید رفته باشید --> پێویسته (هوین) چۆبن

باید رفته باشند --> پێویسته (ئەو) چۆبن

ئانکو؛ پێدڤی یه چۆبن، لێ چێدبت ژی نەچۆبن.

هەروەسا ل نموونا سلال ل شوینا (باید) ئالاڤێ گومانێ (شاید: چێدبت) ژی دهێت، ئانکو؛ چێدبت ئەز چۆبم، چێدبت تو چۆبی و.........هتد.

**کارێ نهۆ**

د زمانێ فارسی دا ژ بۆ کارێ نهۆ چۆ دارشتنێن تایبەت نینن و هندەک جارا کار، کارێ نهۆیه و هندەک جارا ژی دبته کارێ ئاینده و ب ڤان هەردو رەنگایه:

**١) کارێ نهۆ یێ ئخباری:** ئەو کاره یێ کو د ئەنجامدانێ دایه و هێشتا ب دوماهی نەهاتیه، وەکی:

می روم --> (ئەز) یێ دچم

می روی --> (تو) یێ دچی، یا دچی

می رود --> (ئەو) یێ دچت، یا دچت

می رویم --> (ئەم) یێ دچین

می روید --> (هوین) یێ دچن

می روند( --> (ئەو) یێ دچن

هەر وەکی مه پێشتر ژی گۆتی، د زمانێ فارسی دا رەوایه کو تو بۆ (دێ چم) ژی، کو کارێ ئاییندەیه، بێژی: (می روم).

٢) کارێ نهۆ یێ ئیلتیزامی: وەکی:

بروم --> (ئەز) بچم

بروی --> (تو) بچی

برود --> (ئەو) بچت

برویم --> (ئەم) بچین

بروید --> (هوین) بچن

بروند --> (ئەو) بچن

**کارێ ئایندە**

کارێ ئایندە ئەو کارە یێ کو هێژ دەست ب ئەنجامدانا وی نەهاتبتە کرن، وەکی:

خواهم رفت --> (ئەز) دێ چم

خواهی رفت --> (تو) دێ چی

خواهد رفت --> (ئەو) دێ چت

خواهیم رفت --> (ئەم) دێ چین

خواهید رفت --> (هوین) دێ چن

خواهند رفت --> (ئەو) دێ چن

**کت و کۆم**

**کت:** ئەو پەیڤە کو کەسەکی یان تشتەکی ب تنێ نیشـان بدەت، وەکی: مرد ـ زن ـ کتاب ـ قلم.

**کۆم:** ئەو پەیڤە کو پتر ژ دو یان چەند کەسان یان تشتان نیشان بدەت، و د زمانێ فارسی دا (ان) و (ها) هێمایێت وێنە. هندی گیاندارن ب (ان) دهێنە کۆمکرن، وەکی: مردان ـ زنان ـ شیران. و هندی بێ جانن ب (ها) دهێنە کۆمکرن، وەکی: کتابها ـ قلمها ـ شمشیرها. هەروەسا شینکاتی و هندەک ئەندامێن لەشی ژی ب (ان) دهێنە کۆمکرن، وەکی: (درختان ـ چشمان ـ ابروان و......هتد). هەروەسا پەیڤێن (روز ـ شب ـ روزگار) ژی هندەک جارا ب (ان)ێ کۆم دبن و دبنە: (روزان ـ شبان ـ روزگاران). هەگەر دویماهیا پەیڤەکی ب تیپێن (ا) و (و) داوی هاتبت و بڤێن ب (ان)ێ کۆم بکن، تیپا (ی) ل بەری هێمایێ کۆمکرنێ دهێتە

زێدەکـرن، وەکی: (دانا: دانا + ی + ان = دانایان)، (بینا: بینایان)، (پارسـا: پارسایان) و (سخنگو: سخنگویان). ئەڤە و ئەڤ قاعیدە ژ هندەک پەیڤان ناگرت، وەکی: (بانو: بانوان)، (گیسـو: گیسـوان)، (آهو: آهوان)، (بازو: بازوان) و (جادو: جادوان).

هەگەر دوماهیکا هندەک پەیڤان ب (ە)ا کو بلێڤ نەبت(غیر ملفوظ) ب داوی هاتبت و بڤێن ب وێ پەیڤێ ب (ان)ێ کۆم بکن، ئەو تیپا (ە) دهێتە گوهارتن ب تیپا (گ)، وەکی: (دایە: دایە + ان = دایگان)، (خفتە: خفتگان)، (آیندە: آیندگان) و (مورچە: مورچگان). و هەگەر بڤێن هەمان رەنگە پەیڤان ب (ها)ێ کۆم بکن، هەرچەندە دبنە دو (ە) لدویڤ ئێک، بەلاّم پێدڤی یە هەردو بهێنە نڤیساندن، ژ بەرکو هەگەر نەئێنە نڤیسین، ئانکوێن وان دهێنە گوهارتن، وەکی: (نامەها ـ نامها)، (گلەها ـ گلها) و......هتد.

ئەڤە و دڤێ ژ بیر نەکین کو گەلەک جاران روی دایە کو پەیڤێن فارسی ب هێمایێن کۆمکرنێ یێن عەرەبی(ون، ین، ات) هاتینە کۆم کرن کو ئەڤە شاشی یەکە بەردەوام خەلک کەفتینە تێدا و ئەو شاشی ژی نهو لسەر زمانێ فارسی کرینە مال. هەروەسا هندەک پەیڤێن کۆم یێن عەرەبی دیسان ب هێمایێن کۆمکرنا فارسی کۆم کرینەڤە و ب تایبەت ئەو پەیڤێن کو د زمانێ عەرەبی دا هاتینە کۆمکرن ب رێکا (جمع تکسیر)، کو ئەڤە هەما هەر ئێکجار شاشی یەکا غەریبە.

**پێشگر و پاشگر**

پێشگر و پاشگر، هندەک تیپ یان پەیڤن کو ل سەرێ پەیڤان، یان دوماهیا پەیڤان دهێن و مایێ خوە د ئانکوا وان پەیڤان دا دکەن.

پێشگر د زمانێ فارسی دا ئەڤەنە:

نا --> ناتوان، ناجور

بی --> بیدل، بیباک

هم --> همنشین، همزانو

فرا --> فراخور، فرابر

فرو --> فرومایه، فروبردن

بر--> برانگیختن، برنشاندن

پاشگر د زمانێ فارسی گەلەکن کو ئەو ژی ئەڤەنە:

**- پاشگرێن وەکهەڤی و سالۆخدانێ:**

ین --> زرین - سیمین - نمکین

ینه --> زرینه - سیمینه - پشمینه

گان --> دهگان - بازرگان - گروگان

گین --> شرمگین - غمگین - سهمگین

ناک --> دردناک - غمناک - ترسناک

مند --> هوشمند - خردمند - هنرمند

یار --> هوشیار - بختیار - دادیار

ور --> تاجور - هنرور - کینەور

**- پاشگرێن وەکیاتیێ:**

وار --> پریوار - بندەوار - شاهوار

انه --> خردمندانه - دوستانه - مردانه

سان --> پیلسان - دیوسان - شیرسان

آسا --> مهرآسا - مەآسا - پلنگآسا

وش(فش) --> ماهوش(ماەفش) - پریوش(پری فش)

**- پاشگرێن جهی:**

گاه --> رزمگاه - بزمگاه - کمینگاه

ستان --> گلستان - نخلستان - بوستان

کده --> دهکده - بتکده - آتشکده

لاخ --> سنگلاخ ـ دیولاخ

زار --> لالەزار ـ گلزار ـ مرغزار

بار --> رودبار ـ جوببار

سار --> کوهسار ـ چشمەسار

دان --> یخدان ـ جامەدان ـ نمکدان

سیر --> گرمسیر ـ سردسیر

**ـ پاشگرێن دەمی:**

ان --> بهاران ـ بامدادان ـ برگریزان

گاە --> شبانگاە ـ شامگاە ـ صبحگاە

گاهان --> شامگاهان ـ صبحگاهان ـ سحرگاهان

**ـ پاشگرێن بکەرینیێ:**

ندە --> زندە ـ گویندە ـ دهندە

ان --> گریان ـ خندان ـ شتابان

ار --> پرستار ـ خواستار ـ دوستار

گار --> پروردگار ـ آموزگار

کار --> ستمکار ـ درستکار ـ بزەکار

گر --> دادگر ـ ستمگر ـ آهنگر

**ـ پاشگرێن خاوەنداری و پارێزڤانیێ:**

دار --> سرایدار ـ راهدار ـ پردەدار

بان --> باغبان ـ دشتبان ـ دربان

وان --> ساروان ـ گاروان

بد --> کهبد ـ سپهبد ـ هیربد

**تیپێن کو دهێنە گوهارتن ب هندەک تیپێن دی**

د زمانێ فارسی دا هندەک تیپ دهێنە گوهارتن ب هندەک تیپێن دی، کو لخوارێ ئەم دێ دیار کەین:

تیپا (ا) دبتە (ی) --> ارمغان: یرمغان

تیپا (ا) دبتە (د) --> بآن: بدان

تیپا (ا) دبتە (ه) --> انبان: هنبان

تیپا (ب) دبتە (و) --> باز: واز

تیپا (ب) دبتە (ف) --> زبان: زفان

تیپا (پ) دبتە (ف) --> پیل: فیل

تیپا (ت) دبتە (د) --> کتخدا: کدخدا

تیپا (ج) دبتە (ژ) --> کج: کژ

تیپا (ج) دبتە (ک) --> آخشیج: آخشیک

تیپا (چ) دبتە (ش) --> کاچی: کاشی

تیپا (خ) دبتە (ه) --> خستو: هستو

تیپا (خ) دبتە (غ) --> ستیخ: ستیغ

تیپا (د) دبتە (ت) --> زردشت: زرتشت

تیپا (ر) دبتە (ل) --> سوراخ: سولاخ

تیپا (ز) دبتە (ج) --> سوزیدن: سوجیدن

تیپا (ز) دبتە (چ) --> پزشک: پچشک

تیپا (ز) دبتە (غ) --> گریز: گریغ

تیپا (ز) دبتە (س) --> ایاز: ایاس

تیپا (ژ) دبتە (ش) --> باژگونه: باشگونه

تیپا (س) دبتە (چ) --> خروس: خروچ

تیپا (س) دبته (ه) --> آماس: آماه

تیپا (س) دبته (ش) --> فرسته: فرشته

تیپا (ش) دبته (س) --> شار: سار

تیپا (ش) دبته (ج) --> کاش: کاج

تیپا (غ) دبته (گ) --> لغام: لگام

تیپا (ف) دبته (و) --> فام: وام

تیپا (ف) دبته (پ) --> سفارش: سپارش

تیپا (ک) دبته (غ) --> کژغاو: غژغاو

تیپا (ک) دبته (خ) --> شاماکچه: شاماخچه

تیپا (گ) دبته (غ) --> گلوله: غلوله

تیپا (گ) دبته (د) --> آونگ: آوند

تیپا (گ) دبته (و) --> گرگ: ورگ

تیپا (ل) دبته (ر) --> زلو: زرو

تیپا (م) دبته (ن) --> نردبام: نردبان

تیپا (ن) دبته (م) --> کجین: کجیم

تیپا (و) دبته (ب) --> نوشته: نبشته

تیپا (و) دبته (پ) --> وام: پام

تیپا (و) دبته (ف) --> یاوه: یافه

تیپا (ه) دبته (ح) --> هیز: حیز

تیپا (ه) دبته (ج) --> ماه: ماج

تیپا (ه) دبته (همزه) --> هست: است

**کورتکرنا پەیڤان**

کورتکرنا پەیڤان د زمانی دا ئانکو سڤک کرن و سڤک کرن ژی ئانکو راکرنا تیپەکێ ژ پەیڤێ، بۆ نموونە: (همارە ـ نگە ـ شە) کورتکریێن پەیڤێن (هموارە ـ نگاە ـ شاە)ن. ل خالێن ژێری دێ پتر ب سەر چەوانیا کورتکرنا پەیڤان هل بن:

١) تیپا (ا)ئەلیفا ل سەرێ پەیڤێ دهێتە راکرن، وەکی: (اشتر ـ استخر ـ افکندن)، دێ بنە: (شتر ـ ستخر ـ فکندن).

٢) تیپا (ا)ئەلیفا بەری (ە)ا کو ب لێڤ دبت دهێتە راکرن، وەکی: (شاە ـ گاە ـ راە)، دێ بنە: (شە ـ گە ـ رە).

٣) تیپا (و)واوا بەری (ە)ا کو ب لێڤ دبت دهێتە راکرن، وەکی: (اندوە ـ انبوە)، دێ بنە: (اندە ـ انبە).

٤) تیپا (و)واوا دناڤ پەیڤێ ڕا دهێتە راکرن، وەکی: (گوهر ـ بیهودە ـ بود)، دێ بنە: (گهر ـ بیهدە ـ بد).

٥) تیپا (ە)ا کو ب لێڤ دبت دهێتە راکرن هەگەر ل پشت (ا)ئەلیفێ بت، وەکی: (گیاە ـ گناە ـ شاە)، دێ بنە: (گیا ـ گنا ـ شا).

٦) تیپا (ە)ا کو ب لێڤ نەبت(غیر ملفوظ) دێ ژ دوماهیا بەرکارناڤی(اسم مفعول) هێتە راکرن، وەکی: (سالخوردە ـ سرآمدە ـ کارآمدە)، دێ بنە: (سالخورد ـ سرآمد ـ کارآمد).

٧) تیپا (ە)ا کو ب لێڤ نەبت دناڤ پەیڤا لێکدای دا، وەکی: (کەاندر ـ کەاین ـ چەتوان)، دێ بنە: (کاندر ـ کاین ـ چتوان).

٨) و هندەک نموونێن تایبەت ژی یێت هەین، وەکی: (زمین ـ زانسوتر ـ چون او ـ هر زمان)، دێ بنە: (زمی ـ زاستر ـ چنو ـ هزمان).

## ژێـدەر

بۆ دەستنیشانکرنا پەیڤێن فارسی و شرۆڤە و لێ زڤرینا پەیڤان، و بابەتێن زمانەڤانی یێن ڤێ قاموسێ، من مفا ژ ڤان ژێدەران وەرگرتیە:

١) فرهنگ فارسی عمید(دو جلدی)، تألیف: حسن عمید ـ چاپ هفتم(١٣٦٩)، مؤسسهء انتشارات امیر کبیر ـ چاپخانهء سپهر، تهران

٢) فرهنگ فارسی معین(شش جلدی)، تألیف: دکتر محمد معین ـ چاپ یازدهم(١٣٧٦)، مؤسسهء انتشارات امیر کبیر ـ چاپخانهء سپهر، تهران

٣) فرهنگ سعدی(فارسی بفارسی)، تألیف: اصغر حامدی ربّانی ـ چاپ هەشتم(زمستان ١٣٦٩)، انتشارات مهتاب ـ چاپ مهارت

٤) واژەنامە(فارسی ـ کردی)، تألیف: دکتر محمد تقی ابراهیم پور ـ چاپ اوّل(١٣٧٣)، انتشارات ققنوس ـ چاپخانهء دنیا، تهران

٥) هەنبانە بۆرینە، فرهنگ(کردی ـ فارسی)، تألیف: هەژار ـ چاپ اوّل(١٣٦٩)، انتشارات سروش ـ چاپخانهء پویا، تهران

٦) المعجم الذهبي(فارسي ـ عربي)، تألیف: الدكتور محمد التونجي ـ الطبعة الاولى(آذار ١٩٦٩)، دار العِلم للملايين، بيروت

٧) الادب الفارسي، تأليف: الدكتور محمد محمدي ـ الطبعة الثانية(١٩٩٥)، منشورات توس ـ المطبعة: حيدري، طهران

و بۆ هەڤواتایێن کوردی من بەرێ خوە دایە خەلکێ گوندان و نڤیسەر و زمانزانێن هێژا ب تایبەتی ئەو هێژایێن کو ل کوڤارا «مەتین» کار دکن نەخاسمە کو هەمی ئەو

کەسن یێن کو خەمێ ژ پاراستنا پەیڤێن رەسەن و خومالی یێن کوردی دخۆن، و چ گاڤا پێویست ببایە هەر ئێک ژ ڤان هێژایان دا قەستا ژێدەرێن خوە یێن جهێ باوەریێ کەن. سەرەرایی ڤێ چەندێ ژی هێژ گەلەک کێماسیماینە و ئەز دێ چاڤەرێ ی خەمخوریا خەمخوران بم بۆ چاپێن داهاتی.



**آب(Ab):** ئاڤ.

**آب آتشگون(Abê Ateşgon):** دڕکەیە ژ مەیا ڕەنگ سور ـ ئاڤا کو ڕەنگێ ئاگری بدەت.

**آباد(Abad):** ئاڤەدان ـ ل دوماهیا ناڤێ پرانیا گوندان دهێت.

**آبادان(Abadan):** جهێ ئاڤەدان ـ ناڤێ باژێرەکێ ئیرانێ یە.

**آب آلو(Abê Alû):** ئاڤا حولیکێ ـ ئەو ئاڤە یا کو حولیکێت هشک دکەنە تێدا دا دیسان نەرم ببنەڤە.

**آبان(Aban):** هەیڤا هەشتێ یە ژ سالا هەتاڤی ـ هەیڤا دووێ یە ژ وەرزێ پاییزێ ـ هەروەسا ڕوژا دەهێ یە ژ هەمی هەیڤێن سالێن هەتاڤی.

**آبانگان(Abangan):** ناڤێ جەژنا ئیرانی یێت کەڤنە کو دکەڤتە د ڕوژا دەهێ ژ هەیڤا (آبان)ێ دا.

**آبانگاه(Abangah):** ناڤێ ڕوژا دەهێ یە ژ هەیڤا فەروەردین(هەیڤا ئێکێ ژ وەرزێ بهارێ) ـ ناڤێ فریشتەکی یە کو وەکیلێ ئاڤێ یە.

**آب باز(Ab baz):** مەلەڤان. هەروەسا پەیڤا (آبورز) ژی لکارە.

**آب بازان(Ab bazan):** تیرەیەکە ژ گیانەوەرێن دەریایی یێن ب مەمک، وەکی: (دۆلفین و کاشالوت)ان.

**آب بستە(Ab bestê):** ئاڤا بەستی(بەفر ـ گژلوک) ـ شویشە.

**آب تاختن(Ab taxten):** میزتن.

**آب ترە(Ab terê):** گیایێ ڕەشاد.

**آب تنی(Ab tenî):** مەلەڤانی.

**آبتین(Abtîn):** ناڤێ پەرتوکا (آتبین)ی یە، بنێرە (آتبین).

**آبجامە(Abcamê):** جاما کو ئاڤێ یان مەیێ پێ ڤەدخون.

**آبجو(Abco)**: بیره.

**آب چـر(Ab çer)**: چـەروانـێ کەسەکی کو کەسەکێ دی تەرشێ خوە لێ بچەرینیت و ژ پێشڤە دراڤەکی بدەتە خودانێ چەروانی، ئەو چەروان دێ بتـە (آب چر)ا تەرشێ کـەسێ دووێ(خـودانێ تەرشی).

**آبچین(Abçîn)**: خاولی ـ پارچەکا پەرۆکی یە کو لەشێ مرۆڤێ مری پشتی شویشتنێ پێ زوها دکەن.

**آب حـیـات(Abê heyat)**: ئاڤا ژیانێ؛ دبێژن هەر کـەسێ ژ ڤێ ئاڤێ ڤـەخـوت دێ هەروهەر ژیت هەر وەکی دبێژن خدر پێغەمبەری ژی، ژێ ڤەخواریە و هێشتا یێ ساخە ـ دڕکەیە ژ دەڤێ یارێ.

**آبـخـانـه(Abxanê)**: ئەدەب، تەوالێت(w.c).

**آبخست(Abxest)**: فێقیێ هشک بووی ـ فێقیێ رزی.

**آب خـضـر(Abê Xêzêr)**: ئاڤا ژیانێ، ئاڤا حەیاتێ(آب حیات).

**آب خـفـتـه(Abê Xuftê)**: گۆم ـ دڕکەیە ژ بەفرێ و جەمەدێ.

**آبخو(Abxû)**: گزیرتە.

**آبخوار(Abxwar)**: ئاڤ ڤەخور.

**آبخواره(Abxwarê)**: ئاڤ ڤەخور ـ ترارک یان ئامانەکێ کو ئاڤ و مەی پێ بێتە ڤەخوارن.

**آبخور(Abxor)**: ئاڤ ڤەخور ـ مفا ـ بەخت ـ رزقێ روژێ ـ دەراڤ.

**آبخوست(Abxost)**: گزیرتە.

**آبخیز(Abxîz)**: ئەردێ تێر ئاڤ ـ ئەردێ کو مروڤ پچەکێ بکۆلت، ئاڤ ژێ بزێت ـ شێل ـ پێل ـ ئاڤ رابوون.

**آبداده(Abdadê)**: تیـژکـری، سەقاکری(بۆ سەقاکرنا شیر و خەنجەرا ل کارە).

**آبدار(Abdar)**: تێر ئاڤ، ب ئاڤ ـ کەیف خوەش ـ ب چێژ، ب تام.

**آبدارخـانـه(Abdarxanê)**: چایخانە ـ قەهوەخانە.

**آبدازک(Abdazek)**: فـڕندەکـە ژ چویچکێ بچویکترە.

**آبدان(Abdan)**: حـەودا ئاڤێ ـ مـثانە(میزدانک) ـ هەر جهەکێ ئاڤ لێ خڕڤە ببیت.

**آبدان(Abedan)**: کـورتکری یا پەیڤا (آبادان) ـ ئاڤا.

**آبدزدک(Abduzdek)**: جۆبڕ.

**آبدست(Abdest)**: دەستنمێژ ـ سرت ـ شارەزا و کاردان.

**آبدستان(Abdestan)**: مەسین ـ گوزک.

**آبدندان(Abdendan)**: جورەکێ هنارێ یە ـ جورەکێ هرمیکێ یە ـ ئەو نەزانێ کو مروڤ بشێت د قومارێ دا ب حیلە ژێ ببت بێ ی کو ئەو ب خوە بحەسیێت.

**آبدوغ(Abdûx)**: ئاڤە ماست ـ دەو.

**آب دهان(Abê dehan)**: ئاڤا دەڤی(گلیز، تف).

**آبدیده(Abdîdê)**: تەڕ، شل، هەر تشتەکێ کو ئاڤێ بکێشیتە خوە، وەکی: (پەڕۆک، ئیسفەنج و ......هتد) ـ نمیای.

**آب دیده(Abê dîdê)**: رۆندک، هێستر.

**آبراهه(Abrahê)**: رێکا کو ئاڤ تێرا بچیت.

**آب رخ(Abê rux)**: ئاوری، هەتک، هێڤێنێ سەربلندیێ.

**آب رز(Abê rez)**: چیکێت ئاڤێ دەمێ کو ژ چەقەکێ بری یێ دارێ دکەڤیت ـ مەی ـ ئاڤا ژەهرێ.

**آبرفت(Abreft)**: رەمل و ئاخا کو ئاڤا رویباری دگەل خوە دبەت ـ لێم.

**آب رفتن(Ab reften)**: تێکچوون (بۆ تێکچوونا جلک و پەڕۆکا لکارە).

**آب رو(Abê rû)**: بنێرە (آب رخ).

**آبرون(Abruven)**: گیایێ هەردەم شین، هەردەم بهار ـ گولێن کو بیستانی پێشچاڤ دکن.

**آبریز(Abrîz)**: ئاڤرێژ(بۆ جهی) ـ چالا کو ئاڤا حەمامێ درێژتێ.

**آبریزان(Abrîzan)**: هەمان (آبریزگان)ە کو جەژنەکا ئیرانی یێن کەڤن بوو، ل رۆژا سێزدەی تیرمەهێ ژ هەمی سالێن هەتاڤی دکرە جەژن و گولاڤ ب هەڤدو دا دکرن؛ تا سەردەمێ «صفوی»یا ژی ئەڤ جەژنە دهاتە کرن.

**آبریزه(Abrîzê)**: ئێشەکا چاڤی یە کو هەردەم چاڤ روندکا دکەت.

**آب زر(Abê zer)**: ئاڤا زێڕی.

**آبزن(Abzen)**: تەستەکا مەزن کو مرۆڤ خوە تێدا بشوت.

**آبزه(Abzêh)**: ئاڤزە.

**آبزی(Abzî)**: گیانەوەرێ کو د ئاڤ

ئاڤێ دا دژیت ـ گیانەوەرێن دەریایی.

**آب زیر کاه(Abê zîrê kah):** دڕکەیە بۆ مرۆڤێ زیرەک و حیلەکەر کو بسەرڤە خوە نیشابدەت یێ بێ ئازارە و ژ بن ڤە دڕندە و پیسە مرۆڤ بیت ـ وەکی ڤێ دڕکا کوردی یە: (نەرمکێ بن کایێ یە).

**آبژ(Abêj):** گوڕی یا ئاگری ـ چریسک.

**آبسال(Absal)ـ آبسالان:** وەرزێ بهارێ ـ دەمێ بارانا ـ سالا پڕ ئاڤ و باران ـ بۆ پەیڤێن (باغ و بیستان) ژی لکارە.

**آب سبز(Abê sebz):** ئێشەکا چاڤی یە کو ب زاراوێ پزیشکی دبێژنێ: (گلوکوم ـ Glau-come).

**آب سبک(Abê sebuk):** ئاڤا پاقژ بۆ ڤەخوارنێ.

**آبست(Abêst):** ئاڤز، ب تشت، ب حال. هەروەسا پەیڤێن: (آبستە، آبستان و آبستن) ژی لکارن.

**آبستا(Abêsta):** ناڤێ پەرتوکا زەردەشت پێغەمبەری یە. هەروەسا ب ناڤێن: (إبستا و إوستا) ژی ناڤدارە.

**آبستنی(Abêstenî):** ئاڤزی(دەمێ کو ژن یان هەر گیانەوەرەکێ مێ ئاڤز دبیت کو ئەڤ مدەهە ل دەڤ مرۆڤا نێزیکی «٢٨٠»رۆژانە).

**آبستە(Abeste):** زەڤیا ئاڤ ژ سەر هاتبیتە گرتن ـ زەڤیا بەرهەڤ بۆ چاندنێ. (آبست) ژی ل کارە.

**آب سفید(Abê sêfîd):** ئێشەکا چاڤی یە د زاراوێ پزیشکی دا دبێژنێ: (Cataracte).

**آب سنگین(Abê sengîn):** ئەو ئاڤە یا کو پڕی کەرەستێن کانی(معدنی) بت.

**آب سوار(Ab sevar):** پەقیشکێت ئاڤێ.

**آبسە(Abêsê):** ڤونێر ـ وەرەمەکا ب کێم ل بنێ ددانی یان هەر جهەکی ژ لەشی.

**آب سیاە(Abê siyah):** ئێشەکا چاڤی یە کو د ئەنجام دا خودانی کۆرە دکەت ـ مەیا کو ژ ترێێ رەش هاتبیتە چێکرن ـ ئاڤا بۆش ـ ئاڤا رەش(طوفان).

**آبشار(Abşar):** سویلاڤ ـ د

زاراویٚ وەرزشی دا جـــــــورەکیٚ هێرشیٚ یە و بەرێڤەکرنا تەپیٚ یە بۆ پشت تۆریٚ د یاری ییٚن (ڤولیبال، تەنس و تەنسا ل سەر مێزیٚ) دا.

**آبشامە(Abşame):** پەردەکا تەنکە کــو دل و پش(ســیــە) د ناڤ را هاتینە پێچان.

**آبشت(Abeşt):** ڤەشارتی ـ نەپەنی ـ جەهسویس، قەسەڤەگوهێز.

**آبشخور(Abêşxor):** مفا ـ بەخت ـ باهر ـ ژینـگەه ـ وارگـــــەه ـ دەراڤ.

**آب شدن(Ab şuden):** حەلیـان ـ دڕکەیە بۆ شەرم کرنیٚ.

**آب شش(Abşuş):** ســیــهــێت مـاسـیـیـان کـو(اکسـیـژن)یٚ پیٚ ژ ئاڤیٚ وەردگرن.

**آب شنگرفی(Abê şengurfî):** دڕکـەیە ژ مـەیا سـۆر و ڕۆندکـێت خوینەلۆ.

**آب شــــیب(Ab şêyb):** ئاڤـــا بەزەک(جـوتیـار پتـر ڤی زاراوی بکار دئینن).

**آبغوره(Abxûrê):** سـیـهک(ئاڤـا تریێ نەگەهشتی) ـ دڕکەیە ژ گرین و ڕۆندک باراندنیٚ.

**آبفت(Abeft- Abaft):** جـلـکـیٚ ستویر.

**آب فسرده(Abê fesurdê):** ئاڤا قەرسی ـ جەمەد(بەستی) ـ بەفر.

**آب فشان(Ab feşan):** کـانیـکا ئاڤا گـەرم کـو وەخم و هلـما گـەرم ژیٚ رادبیت.

**آبک(Abek):** زاراوەکیٚ کیمیایی یە بۆ پەیڤا «سیماب» بکار دئینن.

**آبکار(Abkar):** ئاڤگێر ـ ئاڤکێش ـ مەی ڤەخۆر ـ مەی فرۆش.

**آب کـردن(Ab kerden):** بنێـره: (آب شــدن)ـ دڕکــەیە بۆ فــرۆتـنا تشـتـەکیٚ بیٚ خێر ب ڕێکا فـێل و سەختەکاری ییٚ.

**آبـــــــــکـــــــــش(Abkeş):** صـافـۆک(صـافـینک) ـ ئاڤگێر ـ ئاڤکێش.

**آب کشیدن(Ab keşîden):** ئاڤ ژ بیریٚ کێشـانە دەر ـ ڤەگوهاستنا ئاڤیٚ ژ جهەکی بۆ جهەکیٚ دیتر ب ئامـــانەکیٚ ئاڤیٚ ـ ژاراڤ کــرن ـ کیسەدانا برینیٚ ژ بەر شویشتنا ب ئاڤا نەپاقژ.

**آبکند(Abkend):** ئەردیٚ کـو ئاڤیٚ هلکۆلابیت.

**آبکور(Abkûr):** ئەو کەسێ ژ ئاڤێ بێ بار ـ ئەو کەسێ کو ئاڤێ نەدەت کەسێن دیتر ـ خەسیس ـ قەلس.

**آبکوهه(Abkûhê):** پێل.

**آبکی(Abekî):** هەر تشتێ وەکی ئاڤێ بیت ـ تێر ئاڤ ـ پڕ ئاڤ، ئاڤدار ـ فێقیێ ڤل.

**آبگانه(Abganê):** بچویکێ نەگەهشتی ـ بچویکێ (یێ مرۆڤی یان یێ گیانەوەری) مری بەری بێتە سەر دونیایێ ـ (آبگانه کردن Abganê kerden: ژبەرچوون ـ بەرهاڤێتن).

**آبگرد(Abgerd):** زڤرۆک (زڤرۆکا دەریایێ).

**آبگردان(Abgerdan):** مۆچک (ژ کاچکی مەزنتر و کویرترە).

**آب گردش(Ab gerdêş):** گەڕا ئاڤدانێ (جوتیار ڤی زاراوی بکار دئینن دەمێ نوبەتێ دگەرن بۆ ئاڤدانا بیستانێن خوە).

**آب گرم(Abê germ):** ئاڤا گەرم ـ ئاڤا کەلی ـ گەرماڤ.

**آب گرم کن(Ab germ kun):** ئاڤ گەرمکەر (مەبەست ژێ ئامیرێ ئاڤ گەرمکەرە «حەمام»).

**آبگز(Abgez):** فێقیێ عێبەلۆ ـ فێقیێ رزی.

**آبگند(Abgend):** جهێ کو ئاڤا پیس و گەنی لێ خڕڤە دبیت ـ گۆم.

**آبگون(Abgûn):** وەکی ئاڤێ ـ پشکەکە ژ کارێزێ کو ئاڤ ژێ دزێت ـ حەود.

**آبگیر(Abgîr):** حەود ـ سێریج، چالا ئاڤ لێ خڕڤە دکەن ـ مەلەڤانگەه ـ ئامانێ کو گولاڤێ دکەنێ ـ ئەو کەسێ د سەرشوێ ڤە ل دەمێ سەرشویشتنێ ئاڤێ ل مرۆڤی دکەت.

**آبگینه(Abgînê):** شیشە ـ شیشا مەیێ ـ خودیک.

**آبگینەگر(Abgînêger):** شویشەساز.

**آب لمبو(Ab lembû):** فێقیێ ڤل.

**آبلوج(Ablûc):** شەکر ـ قەندێ سپی.

**آبله(Abêlê):** خوریک.

**آبلەرو(Abêlê rû):** سەروچاڤ خوریک.

**آب مروارید(Abê murvarîd):** هەمان ئێشا «ئاڤا سپی»یە، کو

ئێکە ژ ئێشێن چاڤی.

**آب مژە(Abê mujê)**: روندک.

**آبناک(Abnak)**: شەهدار ـ نمیای ـ ئاڤدار.

**آب نبات(Ab nebat)**: شەکروک، شەکرک.

**آب نگاری(Ab nêgarî)**: زانستێ کو ل سەر ئاڤێ باخڤت، د زاراوێ زانستی دا دبێژنێ: (Hydrography).

**آب نما(Ab nema)**: حەود یان جۆکا کو ئاڤا وێ دیار بت ـ ئەو جهێ کو ئاڤا کانیێ یان کاریزێ بسەر ئەرد دبت ـ لەیلان.

**آب نورد(Ab neverd)**: دەریاڤان.

**آبو(Abû)**: جورەکێ گولێ یە کو فارس دبێژنێ (نیلوفەر) ژی ـ خال(برایێ دەیکێ)، بو ڤێ مەبەستێ (آبی) ژی لکارە.

**آب ورز(Ab verz)**: مەلەڤان ـ غەواس.

**آب و رنگ(Abo reng)**: رویێ سور و سپی ـ ئارونگ ـ ئاڤ رەنگ.

**آب و گل(Abo gêl)**: خانی ـ ئاڤاهی.

**آبوند(Abvend)**: گوزکێ ئاڤێ.

**آبە(Abe)**: «لیزابە ـ Lîzabe» پتر لسەر زارێ خەلکی یە: ئاڤا لێچ ،ئەو ئاڤا کو دگەل بوونا نویزادەی ژ زکێ دەیکێ دەردکەڤیت.

**آبی(Abî)**: ئاڤی(بۆ هەر تشتەکێ ئاڤی بکار دهێت وەکی گیانەوەرێ ئاڤی و شینکاتی یێت ئاڤی و چاندنا ئاڤی) ـ رەنگێ شین ـ ئەو کەسێ کو خەلکێ گوندێ ئاوە(گوندەکە ل نێزیکی باژێرێ ساوە ل ئیرانێ) بت ـ بیەھ(ئەو ژی فێقیەکە).

**آبیار(Abyar)**: ئەو کەسێ کو ئاڤێ ل سەر بیستان و زەڤی و مالا بەلاڤ دکەت.

**آبیاری(Abyarî)**: ئاڤدانا زەڤی و بیستانا.

**آپاردی(Apardî)**: زرشەرم ـ فێلباز ـ زیرەک. هەروەسا (آپارتی) ژی لکارە.

**آتبین(Atbîn)**: ناڤێ بابێ فرەیدونی یە ـ کەسێ کو کارێن باش دکەت و خودانێ ئاخفتنا خوە بت ـ ناڤێ خودانێ پەرتووکا «آبتین»ە.

**آتش(Ateş)**: ئاگر.

**آتشبار(Ateşbar)**: هەر تشتێ کو ئاگر ژێ ببارت ـ ئەو کەس یان ئەو تشتێ کو ئاگری ببارینت(بۆ زاراوێن لەشکەری پتر لکارە).

**آتشبان(Ateşban)**: ئاگرڤان(ئەو کەسێ کو پاسەوانی و سەرەگوهی یا ئاگرێ ئاتەشکەدێ /بنێرە آتشکده/ دکر).

**آتش برزین(Ateş berzîn)**: بنێرە: (آذر برزین).

**آتش بس(Ateş bes)**: ئاگربەست(شەر راوەستاندن).

**آتشپا(Ateş pa)**: دڕکەیە بو وی کەسێ بلەز بێت و بچیت.

**آتش پارسی(Ateşê parsî)**: ئاگروک ـ شەڤ ترسک و تامێسک ـ ئاگرێ کو فارسا د ئاگردانکێن خوە ڤە هل دکرن.

**آتشپاره(Ateşparê)**: پارچەکا ئاگری ـ دڕکەیە ژ مروڤێ زیرەک و سرت و دڕندە و بچوبکێ شیم.

**آتش پرست(Ateş perest)**: ئاگر پەرێس ـ ژ بەر کو ئاگر لجەم زەردەشتی یان پیروز بوو، لەو ناڤێ «آتش پرست» لسەر هاتیە دانان، هەروەسا (آذرپرست و آذرکیش) ژی دبێژنێ.

**آتش تاب(Ateş tab)**: ئەو کەسێ کو کەرەستێن سوتەمەنی دکەتە دناڤ کوبرهێ دا.

**آتشخانه(Ateşxanê)**: کوبرهە.

**آتش خای(Ateş xay)**: ئەو کەسێ کو ئاگری دجوبت ئان دخوت.

**آتشخوار(Ateşxar)**: ئاگرخور ـ مریشکا ئاگر خور ـ کەردیکل یانژی نەعام(کو یێ هاتی یە نیاسین ب ئاگرخوریێ) ـ دڕکەیە ژ حەرامخور و زالمان.

**آتش خوی(Ateş xûy)**: بەدفەڕ ـ بێ ئەدەب.

**آتش دست(Ateş dest)**: دڕکەیە بو مروڤێ زیرەک و دەستماتی.

**آتش دهقان(Ateşê dêhqan)**: ئاگرێ کو جوتیار بەرددەتە زەڤیێ پشتی ژ دروینێ خلاس دبیت و بەرهەمێ خوە ژ ناڤ زەڤیێ دکێشیتە دەر.

**آتش زبان(Ateş zeban)**: ئەو کەسێ کو سڤک دئاخڤیت.

**آتش زنه(Ateş zene-zenê)**: تشتێ کو ئاگر پێ بێتە هلکرن

وەکی ستاوبەرا(دو بەرێت سپی کو هەگەر لێک ددەن چریسکێت ئاگری ژێ دچن) و چەخماقا (بەرەکێ گەلەک رەق و رەشە کو هەگەر ئاسنی لێ بدەن چریسکێت ئاگری ژێ دچن ـ د زاراوێ جیولوجی دا دبێژنێ Silex).

**آتش سری(Ateş serî):** بەدفەری ـ تورە بوون.

**آتش سوز(Ateş sûz):** ئەو تشتێ کو د ناڤ ئاگری دا د سوژیت ـ ئاگر هلکەر.

**آتش سوزی(Ateş sûzî):** ئاگر تێ بەربوون.

**آتش طور(Ateşê Tor):** ئاگرێ کو ل چیایێ طور ب بەرچاڤێ موسا پێغەمبەری کەفتی کو ئارونگا نویرها خودێ بوو.

**آتش فشان(Ateş fêşan):** ڤۆلکان.

**آتشک(Ateşek):** خوریک ـ کەهرەب ـ ستێرستێروک ـ چراک ئان گلوپێت کو ل شەڤێ(دەمێ نڤستنێ) هل دکەن.

**آتش کاو(Ateş kav):** پەلگازک.

**آتشکده(Ateşkedê):** ئاڤاهی یەکێ پیروز بوو کو ئاگر تێڤە هلدکرن و زەردەشتی یا ئەو ئاگر د پاراستن ـ پەرستگەها زەردەشتی یان، ل ئیرانێ سێ ژ ڤان پەرستگەها ژ ئەڤێن دیتر مەزنتر و ناڤدارترن ئەو ژی:

١ـ پەرستگەها «آذرفرنبغ» ئان «آذرخرداد» ئان «آذر خروه »ل (کاریان فارس)، کو یا تایبەت بوو ب پێشەوایێن روحانی یێن زەردەشتی یان ڤە.

٢ـ پەرستگەها «آذرگشسب،» ل (شیز آذربایجان) و تایبەت بوو ب پاشا و شەرکەرێن ئیرانا هینگێ .

٣ـ پەرستگەها «برزین» ئان «آذربرزین مهر» ل (ریوند خراسان) کو تایبەت بو ب خەلکی و جوتیاران ڤە.

**آتش کردن(Ateş kerden):** ئاگر هلکرن ـ پەقاندنا گوللەتوپ و تڤەنگان.

**آتشگیره(Ateşgîre):** پویش و پەلەخ.

**آتشناک(Ateşnak):** وەک ئاگری(چ بو رەنگێ خوە بیت یان

بو تێهنا خوه بیت).

**آتش نشاندن(Ateş nêşanden):** ئاگر ڤەمراندن.

**آتش نشـــــانی(Ateş nêşanî):** رێڤەبەری یا ئاگر ڤەمراندنێ.

**آتش نهاد(Ateş nehad):** بنێره: (آتشناک).

**آتشە(Ateşê):** کەهرەبا.

**آتشی(Ateşî):** وەکی ئاگــــری ـ درکەیە بۆ مرۆڤێ تورە.

**آتشیزه(Ateşîzê):** ستێرستێروک.

**آتشین پنجـــه(Ateşîn pencê):** درکــەیە بـۆ مـرۆڤێ دەســتــهــەل و شارەزا و کاردان.

**آتوربانان(Atûrbanan):** ئێـک ژ چینێن چوارینێن کـۆمـەلا ئیـرانی بوو ل سـەر دەمێ سـاسـانیـان، کـو پێکهـاتیبـوون ژ (مغـان، مویدان، هیربدان، داوران).

**آتون(Atûn):** کـویرها حـەمـامێ ـ کـویرها گـێـچێ ـ ئەو ژنکێن کـو کچکا فێر دکەنە کارێن دەستی.

**آجل(Acul- Acel):** بایێ کــو ژ حـەفکێ دەر دکـەڤیت و دەنگ ژێ دهێت.

**آجیـدن(Acîden):** قـەیتک دان، قـولپک لێـدان ـ شـرینقـە دانان ـ گـرکــرنا تشـتــەکی. هەروەسـا پەیڤــێـن: (آجــدن، آژیدن، آژدن، آزیدن، آزدن، آزندن، آزنیـدن) ژی لکارن.

**آجیل(Acîl):** توڤک(چەرەز).

**آچار(Açar):** ترش، ترشی ـ دیسان ئەڤ پەیڤە لکارە بۆ کلیل و سپانا ژی لێ (آچار)ا کـو بو ڤـان هەردو پەیڤێن داویێ بکار دهێت د بنیات دا پەیڤەکا ترکی یە.

**آخ(Ax):** دەنگێ کو لدەمێ ئاخینک راهێلانێ ژ دەڤی دەردکەڤیت؛ (آه ـ وای) ژی لکارن.

**آخال(Axal):** گلێش ـ هەر تشتەکێ بێ کەلک.

**آختن(Axten):** کـێـشـانە دەر(بو نمونە: دەمێ شـیـر و خـەنجـەرا ژ کاڤلانی دکێشنە دەر).

**آخـــتــه(Axte-ê):** خـەسـاندی (گـیـانەوەر و مـروڤ دەمێ دهێنە خەساندن). هەروەسا: (أخته) ژی لکارە.

**آخریان(Axrêyan):** مـال ـ کـەل و پەلێت ناڤ مالێ ـ پەرۆک.

**آخسمه(Axsume- Axseme):**

بیره.

**آخـــور(Axûr):** هافـــرێ دەوارا ـ لشوینا (گوڤ)ێ ژی بکار دهێت.

**آخـــورک(Axûrek):** کـــورتکریا (آخـور)ێ ـ هەســتـیێ لناڤـبـەرا ســینگ و بن ئەرزنکێ(بعـــرەبی دبێژنێ ترقوه).

**آخوند(Axund):** مەلا ـ ماموستا ـ صوفی ـ زانایێ ئایینی.

**آخـــوندک(Axundek):** هەســـپێ فاطما نەبی یا.

**آداک(Adak- Adek- Edak):** گزیرتە، هشکی یا لناڤ دەریایێ.

**آدامس(Adams):** قـــــــاچک، بەنیشت، علک.

**آدخ(Adex):** باش ـ قەنج ـ پیروز.

**آدر(Adêr):** نشتەر ـ نشتەرگەر.

**آدرنگ(Adereng):** خەم ـ رێنج ـ ئاتاف ـ نەمان.

**آدم(Adem):** د عــــەرەبی دا بابێ مروڤـایە(ابولبـشر)، لێ د فـارسی دا ژ بلی ڤێ ئانکویێ، ئانکوبێن: (مـــرۆڤ ـ کـــەس ـ خـــولام یان خزمەتکارێ زەلام) ژی ددەت.

**آدم نمایان(Adem nêmayan):** تیرەکەکە ژ گیانەوەرێن ب چچک وەکی مــــەیمونـکێ کــــو وەکی مروڤانە.

**آدنیس(Adonîs):** گـیـایەکـە کـو گـولێن زەر و سور پێـڤـە دهێن و د ناڤ زەڤیێن گەنمی دا دمشەنە ـ د چیڤانوکێن یەونانیان دا گەنجەکێ دەلال بوو کـــو (آفـــرودیت -Af rodît)ێ حەژێ دکر.

**آدینده(Adyende):** کـەسکوسـور، کەسکوئالا(قوس قزح).

**آدینـه(Adîne-ê):** رۆژا ئـەیـنـی ـ روژا دویماهی یا هەفتیێ.

**آذرافـیـون(Azarafyon):** کـەفـا دەریایێ.

**آذراقی(Azaraqî):** ســـەکــــوژ؛ مـــــــــــەبـەســت ژێ تـوڤـێ دارا(وومیکیه)یە کو ل هندستان و سـیـلانێ شین دبت؛ فـێـڤـیـێ ڤێ دارێ هندی لالنگایە کـو ١٢ـ١٥ دندکێت وەکی مـەهیک(قومچه)ا لگەل هەر فــێــڤی یەکی هەنە، بسـەرڤـە رەنگێ خـوەلـیێ ددەت و ناڤکا وێ سپی یە، دو کەرەستێن ژەهراوی ژێ چێـدکن کـو دبێـژنێ (استرکنین و بروسین).

**آذر(Azer):** ئـاگـــر ـ نـاڤێ هەیڤـا

نەهێ یە ژ ســالا هەتاڤی ـ ناڤێ رۆژا نەهێ یە ژ هەمی هەیڤــێن سالا هەتاڤی کو ئیرانیێن کەڤن رۆژا نەهێ ژ هەیڤـا نەهێ دکـرنە جەژن.

**آذر آباد(Azer abad):** پەرستگەهـ ـ دبێـژن ناڤێ پەرستگەهەکێ بویە ل تەبرێزێ کــو صــوفی یەکی ب ناڤێ (آذرباد) ئەو یا ئاڤا کری و (آذر آبادگـــان) ناڤێ کـــەڤنێ (آذربایجان) ژ وێرێ هاتیە.

**آذر آیـین(Azer Ayîn):** نـاڤـێ پەرستگەها چارێ یە ژ هەر هەفت پەرستگەهێن مـەزنێن ئیـرانیـێن کەڤن.

**آذر برزیـن(Azerberzîn):** نـاڤـێ پەرســـتگەها ســـێـــیێ یە ژ پەرستگەهێن مەزنێن ئیرانیان کو (آتش برزین ـ آذر مهر)ژی لکارن ـ ناڤێ پەهلەوانەکێ ئیرانیان بوو.

**آذر پیرا(Azer pîra):** خزمەتکارێ پەرستگەهێ.

**آذرخش(Azerexş):** کـــارەبا ـ برویسی.

**آذر زردشــت(Azer zerdeşt):** ناڤێ پەرســتگەهەکـا مـەزن یا پارسی یانە.

**آذرشـــــسپ(Azerşesp):** ناڤـێ فریشتا ئاگری ـ برویسی ـ کمکمە ـ چەپچەپیسک ـ جورەکێ پەنبی یێ چیـایی یە کـو دناڤ ئاگـری دا ناسوژیت. (آذرشب Azerşeb و آذرشـــــــــست Azerşust و آذرشین Azerşîn) ژی لکارن و هنـدەک وەســـا بۆ دچـن کــــو (آذرشـــــسپ) ناڤێ پەرتوکـــا (آذرشـست)ی یە و هندەکـێن دی دبێــــژن کــــورتکریا پەیڤـــا (آذرگشسپ)ە.

**آذرکده(Azerkedê):** پەرستگەهـ.

**آذرکیش(Azerkîş):** ئاگر پەرێس.

**آذرگـــشـــــسب(Azerguşesb):** کورتکری یا (آذرگشنسب)، ناڤێ ئێک ژ هەرسێ پەرستگەهێن مەزن و ناڤدارێن زەمانێ ساسانیان.

**آذرگـشنسب(Azerguşnesb):** [Azer = ئاگـر، guşn = نێـر، esb = هەسپ] = هەســپێ کــو وەکی ئاگــری دکـــەتە غـــار. بۆ شەرکەرا دهاتە بکارئینان.

**آذرنگ(Azereng):** خـەم ـ رێـنج ـ مـرن ـ روناهی ـ ب رەنگێ ئاگری

ـ تیشک.

**آذرنوش(Azernûş)**: ناڤێ پەرستگەهەکا مەزنە ژ هەر هەفت پەرستگەهێن مەزنێن پارسیان کو جهێ وێ ل (بلخ)ێ بوو.

**آذری(Azerî)**: وەکی ئاگری ـ ئەو کەسێ کو خەلکێ ئازەربایجانێ بت ـ ناڤێ زاراڤەکێ فارسی یێ کەڤنە کو ل ئازەربایجانێ دهاتە بکارئینان.

**آراستن(Arasten)**: جوان کرن ـ پاقژکرنا سەر و روی یا ـ رێک خستنا ناڤ مالیێن مالێ.

**آرام(Aram)**: د زمانێ عەرەبی دا کوما (ارم)ێ یە ئانکو ئەو بەرێن دادننە بەر لێڤێن جاددا بۆ رێ نیشاندانێ، هەروەسا کوما (رئم)ێ یە ئانکو خەزالا سپی، لێ د زمانێ فارسی دا ئانکوبێن: (قرار ـ بێ دەنگ ـ نەلڤ ـ هێدی)ددەت.

**آرامگاه(Aramgah)**: مەزار ـ گۆڕ(گورستان).

**آرامی(Aramî)**: ئەو کەسێن کو بدویڤ (آرام ـ کورێ پێنجێ یێ سام کورێ نوحی) کەتین.

**آرایش(Arayêş)**: بنێڕە (آراستن).

**آرایشگاه(Arayêşgah)**: سەرتراشخانە ـ مویکارخانە.

**آرایشگر(Arayêşger)**: سەرتراش، مویکار، حەللاق.

**آرد(Ard)**: ئار.

**آردبیز(Ardbîz)**: موخل.

**آردن(Arden)**: مفسک ـ هەسکیف.

**آرزم(Arezm)**: شەڕ ـ جەنگ.

**آرزو(Arêzû)**: ئومێد ـ هیڤی ـ چاڤەرێ ـ ئارمانج ـ خواست(حەز) ـ مراد و مەخسەد.

**آرزوانە(Arêzûwanê)**: مەهبیران(بۆ ژنا ب حال بکار دهێت کو لدەمێ ئاڤزی یێ حەژ هندەک خوارنا دکەت).

**آرستن(Aresten)**: بنێڕە: (آراستن).

**آرستن(Arêsten)**: شیان، کارین، پێ چێبوون.

**آرش(Areş)**: ناڤێ کورێ دووێ یێ «کیقباد»ی و برایێ «کیکاوس»ی، هەروەسا دگوتنێ «کی آرش» ژی.

**آرش(Arêş)**: ئینان.

**آرشی(Areşî):** یێ «ئارەش»ی، مەبەست ژێ تیرا ئارەشی یە کو د چیروکێن ئیرانی دا هاتیە دەمێ شەر کەتیە ناڤبەرا (منوچهر و ئەفراسیاب)ی بریار هاتە دان لەشکەرێ ئیرانێ تیرەکێ بهاڤێژت، هەر جهەکێ کو ئەو تیر کەتە ئەردی دێ ئەو ببیتە سنورێ ئیران و تورانا؛ ئینا «ئارەش»ی تیرەک ژ باژێرێ(آمولا طەبەرستانێ) هاڤێت ئو ل (مەرڤ) کەتە ئەردی.

**آرغدن(Aruxden- Aluxden):** تۆرە بوون.

**آرمان(Arman):** ئارمانج، هیڤی، ئارەزو ـ کوڤان.

**آرن(Aren):** ئەنیشک، د فارسی دا (آرنج Arenc)پتر لکارە کو هەر ڤێ ئانکوێ ددەت.

**آرنگ(Areng):** ئەنیشک ـ خەم ـ ئێشاندن ـ رەنگ ـ جۆر ـ شێوە.

**آرواره(Arvare):** لاچلاچ، لاچلاچک(هەردو هەستیێن سەری و بنی یێن دەڤی کو ددان لسەرن). (آروار، آروارک و آره) ژی لکارن.

**آروبند(Arûbend):** جەببار(ئەو کەسێ کو دەستێت شکەستی و خەلیای دبەتە جھ).

**آروین(Arvîn):** ئەزموون.

**آری(Arî):** پەیڤا بەرسڤدانێ(بەلێ) کو بەروڤاژی پەیڤا(نە، نەخێر)ە.

**آریا(Arya):** گرنگترین پارچەیە ژ نەژادێ سپی کو لدەستپێکێ مللەتەک بوو ل بیابانان دژیان و سێ هزار سالا بەری زایینا مەسیحی هندەک ژ وان چوونە هندستانێ هندەک ژی ل ئیران و کوردستانێ مان و ییێن دی بەرەف یەونان و ئەلمانیا و ژێر و ژۆرێن ئەوروپا کەفتنە رێ. ناڤێن(هندوئەوروپی ـ ئاریایی ـ ئاری ـ ئاریانی ـ ئاریان و ئارین) ژی هەر بۆ ڤی نەژادی لکارن. هندەک زمانێن کو کەسێن ئاری پێ دئاخڤن ئەڤەنە(ئاڤێستایی ـ سانسکریتی ـ پەهلەڤی ـ فارسی ـ کوردی ـ یەونانی ـ لاتینی ـ ئەلمانی) ژ وەلاتێن ئەوروپی تنێ وەلاتێن (فینلەندا ـ مجارستان ـ ترکیا) ژ ڤی نەژادی نائێنە هژمارتن ـ هەروەسا ئاریا ناڤێ گیایەکی یە وەکی خشخاشێ یە و

کەرەستێن بێ هشییێ ژێ چێدکن ـ د زمانێ فەرەنسی ژی دا لشوینا ئاواز و ئاوازدانانێ لکارە، کو فارس ژی هەر ب ڤێ ئانکوێ بکار دئینن.

**آریدبرید(Arîdberîd):** بنێ گیایەکێ وەکی پیڤازێ یە کو د کەڤندا پزیشکا بۆ چارەکرنا ئێشا باوەسیر بکار دئینان.

**آریغ(Arîx):** دلسار ـ نەفرەت ـ کینە و دژاتی.

**آزاد(Azad):** ئازاد ـ رها ـ بەروڤاژی پەیڤا (بەنی).

**آزار تلخە(Azarê telxe):** ئێشا زەرک(ئێشا یرقان).

**آزخ(Azex):** بالویل(بەهلویلک).

**آزردن(Azurden):** ئێشاندن ـ قەهراندن ـ دلتەنگکرن.

**آزرم(Azerm):** شەرم و حەیا و هەتک.

**آزری(Azerî):** یێ ئازەری، مەبەست ژێ(باپیرێ ئیبراهیم پێغەمبەری یان مامێ وی یە کو دگوتنێ ئازەرێ پەیکەرساز).

**آزغ(Azux):** چقەک کو ژ دارا خورمێ هاتبیتە برین.

**آزفندای(Azfendak):** کەسکوسور، کەسکوئالا(قوس قزح).

**آزگار(Azgar):** تەمام ـ درێژ و بڤەکێش ـ رەبەق.

**آزمایش(Azmayêş):** ئەزموون، تەجربە.

**آزوغە(Azoxe- Azoqe):** خوارنا کێم ـ ئەو خوارنا کێم یا کو رێڤنگ دگەل خوە دبەت ـ خوارنا کو ل مال بۆ پاشەروژێ هلدگرن.

**آژگن(Ajgên):** دەرگەهێ کون کون کو ژ دەرڤە مرۆڤ ژ ناڤ خانی دا ببینن.

**آژند(Ajend):** گل، تەقن(بۆ چێکرنا ئاڤاهیێن بەرا و لبنا، ڤێ تەقنێ بکار دئینن).

**آژنگ(Ajeng):** خیچ و کوریشکێن ل سەر روی(دەمێ پیری یێ یان تورەبوونێ).

**آژەنگ ناک(Ajeng nak):** برە تێکچووی ـ ئەنی گرێ.

**آژیر(Ajîr):** هشیار ـ زیرەک ـ هایدار.

**آژیراک(Ajîrak):** قیژیێن مرۆڤا و شهینا دەوارا.

**آژینە(Ajîne):** ئالاڤەکێ پیلاییی کو دەستەکێ وی ژ داری یە و وەکی تەبەرکایە؛ ئەڤ ئالاڤە تێتە بکار ئینان بو دڕکرن و تیژکرنا بەرێن ئاشا.

**آس(As):** دستار و ئاش لێ بفارسی ئەڤێ ب دەستی بگێرین دبێژنێ «دستاس» و هەگەر ب ئاڤێ بێتە گێران دبێژنێ «آسیاب» و هەگەر ب هێزا کەری بگێرین دبێژنێ «خرآس» و هەگەر ب هێزا بای بهێتە گێران دبێژنێ «آسیای بادی» و بێن ب هێزا ماتورا بهێتە گێران دبێژنێ «آسیای دودی» ـ ناڤێ دارەکێ یە وەکی هنارێ یە، بەرگێت وێ کەسکن و گولیلکێت سپی پێڤە دئێن و دبێهن خوەشن، فێقیێ وێ وەکی ژنوی چێدبت کەسکە پاشی رەش دبت؛ ئەڤ دارە بعەرەبی ژی هەر بڤی ناڤی یە ـ د زمانێ فەرەنسی دا ناڤێ جورەکێ یاریا قومارێ یە کو ئیرانی ژی هەر بڤێ مەبەستێ بکاردئینن.

**آسا(Asa):** فەرمانە ب نڤستنێ(بنڤە) ـ پاشگرە و ئانکویا «وەکی و مینا» ددت ـ باوشکێت خەوێ ـ رێک و پێک کرن(چ مال بیت یان سەر وریە بن) ـ ماڤویل ـ بنەجە(وەکی: قەسە بنەجە) ـ هێدیاتی(نەرماتی ـ بتایبەت لدەمێ ئاخفتنێ) ـ شێواز.

**آسان(Asan):** سانەهی.

**آسایش(Asayêş):** بێ دەنگی ـ تەناهی.

**آسبان(Asban):** ئاشڤان.

**آستان(Astan- Astanê):** دەرازینک.

**آستر(Aster):** بەطەن(بۆ جلکا دهێت)ـ وێڤەتر.

**آستێ(Astên):** هچکێ جلکی ـ دبێژنێ «آستین و آستی ـ آستیم ـ آستم »ژی.

**آستیم(Astîm):** کیسەدانا برینێ.

**آستین(Astîn):** هچکێ جلکی ـ دەرێ مەشکێ ـ رێک و رێباز.

کوتە آستین(Kuteh Astîn): دەستکورت ـ لاوازحال ـ هەژار.

**آستینە(Astîne-ê):** هێکا مریشکێ.

**آسغدن(Asuxden):** نەسوتی یان

نیڤ سوتی.

**آسغدن(Asexden):** ئامادەبوون.

**آســـــمـــــان(Asman):**

ئەسمان(هەروەسا بۆ ڤێ مەبەستێ پەیڤێن: سپهر، گەردون، فلک، چرخ، چرخ بلند، چرخ دولابی، چرخ کبود ژی لکارن) ـ ناڤێ روژا بیست و هەفتێ یە ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی، (آسمان روز) ژی هەر بۆ ڤێ مەبەستێ لکارە.

**آسـمان پیسـه(Asman pîsê):**

ئەسمانێ کو پنی پنیکێن ئەورا لێ بن.

**آسـمانخراش(Asmanxeraş):**

گەلەک بلند(بۆ ئاڤاهی یا بکار دهێت).

**آسمان دره(Asman dere- der-rê):** رێکا کادزا(زاراوەکێ ستێرناسیێ یە).

**آسـمان نورد(Asman neverd):**

فڕوکە یان هەر تشتەکێ کو ل هەوا بچت.

**آسمانه(Asmane-ê):** بان.

**آسمند(Asmend):** درەوکەر ـ فێلباز ـ حەیران.

**آسـنـی(Asnî- Asnêy):**

هەوی(دەمێ دوو ژن شوی ب زەلامەکی دکەن هەر دوو ژن دبنە هەوی بێن هەڤدوو).

**آس و پـاس(Aso pas):** رەپ و رویت(بو مروڤێ مفلس بکار دهێت).

**آسـه(Ase):** تەوەر ـ بەرێ ئاشی ـ ئاتاڤێ ژەنگی بوونا گەنمی ـ مورکا دووێ ژ ستوی کو دکەڤتە پشت مورکا (اطلس)دا.

**آسـیا(Asîya):** ددانێ کورسی ـ ئاش.

**آسیب(Asîb):** زیان ـ درب ـ ئێش ـ هەرشی.

**آسیمه(Asîmê):** پەریشان.

**آش(Aş):** جورەکێ خوارنا ئیرانیانە.

**آشام(Aşam):** هەر تشتەکێ بێتە ڤەخوارن.

**آشـپز(Aşpez):** زادچێکەر کو بعەرەبی دبێژنێ (طباخ).

**آشغال(Aşxal):** گلێش.

**آشـغـالدان(Aşxaldan):** سەتلا گلێشی.

**آشفتن(Aşuften):** پەریشان بوون ـ توڕە بوون ـ سەرگەردان بوون.

**آشـفـتـه بخت(Aşuftê bext):**

بەخت رەش ـ بێ شەنس.

**آشکوب(Aşkûb):** بان.

**آشکوخ(Aşkux):** تەحەسین، حولسین ـ هلنگفتن.

**آشمال(Aşmal):** مەللاق ـ دو روی ـ ئەزمان خوەش.

**آشموغ(Aşmux):** کەسێ کو خەلکی بسەردا ببەت یان رێکێ لبەر بەرزە کەت ـ قەسەڤەگوهێز.

**آشنا(Aşêna):** هەڤال ـ نیاس، خزم ـ کەس و کار ـ مەلەڤانی(بو ڤێ مەبەستێ پتر شنا şêna لکارە).

**آشوب(Aşûb):** فتنە ـ دەنگ و دۆر ـ سەرهلدان ـ شورەش.

**آشوب انگیز(Aşûb engîz):** فتنەچی، فتنەهلێخ.

**آشوریدن(Aşûrîden):** شێل و بێل کرن ـ تێکدان ـ سەرابن کرن ـ تێکهلکرن. هەروەسا (شورانیدن) ژی لکارە.

**آشوغ(Aşûx):** غەریب(مەبەست ژێ مروڤێ غەریب، نە خەلکێ دەڤەرێ یان بیانی یە).

**آش و لاش(Aşo laş):** پرت پرت ـ بژالە.

**آشیب و تیب(Aşîbo tîb):** نە ئارام ـ نیگەران ـ پەریشان حال. د شەهناما فردەوسی دا (آشیب و شیب ـ آسیب و شیب) ژی هاتیە.

**آشیهە(Aşîhê):** شهینا هەسپی.

**آغار(Axar):** نمیای.

**آغاز(Axaz):** دەستپێک، سەرەتا.

**آغر(Axer):** هشکەرۆ ـ جهێن کو پشتی ئاڤ رابوون بدوماهی تێت و هێشتا ئاڤ تێدا مابیت.

**آغستن(Axêsten):** پرکرن، تژی کرن.

**آغشتن(Axêşten):** تەرکرن، شل کرن ـ شێلاندن ـ تێکهل کرن ـ هەڤیرکرن.

**آغشغە(Axêşxe):** پەنجەرا مەزن ـ دەرگەهێ کو جهێ روناهیێ لێ بت.

**آغوز(Axuz):** فری(شیرێ کو هەتا سێ روژا پشتی زایینێ ژ پەزی و چێلا ددوشن). پەیڤێن(شیرماک، فله، شمە، فرشە، زهک) ژی هەر بو ڤێ مەبەستێ لکارن.

**آغوش(Axûş):** باغەل، هەمبێز ـ د زمانێ تورکی دا کو ئیرانی ژی هەر ب وێ مەبەستێ بکاردئینن ناڤەکە ژ ناڤێن بەنی یێت تورک.

**آغيل(Axîl):** نیّرینا ژ کوژییّ چاڤی ب نیشانا تورەبوونیّ.

**آفتاب(Aftab):** گەرماتی ـ روناهی ـ هەتاڤ(بەروڤاژی پەیڤا سیبەر) ـ رۆژ کو بعەرەبی دبیّژنیّ(شمس)، (آف ـ خورشید) ژی لکارن.

**آفـتـاب پرست(Aftab perest):** رۆژپەرێس ـ کمکمە. (آفتاب گردک)ژی لکارە.

**آفتـاب گەردان(Aftab gerdan):** گول بەرۆژ.

**آفـتـابگین(Aftabgîn):** رۆژا هەتاڤی، رۆژا ساهی(بەروڤاژی روژا ئەوری).

**آفتابە(Aftabê):** مەسین.

**آفدم(Afdum):** دویماهی ـ ئەنجام.

**آفروزە(Afrûzê):** فتیلا لەمپیّ یان فانوسیّ.

**آفروشە(Afrûşe):** حەلاوا کو ژ ئار و دوهن و هنگڤینی یان شەکرا کەلاندی هاتبیتە چیّکرن.

**آفریدگار(Aferîdêgar):** ناڤەکە ژ ناڤیّن خودیّ(ئافرندە، چیّکەر).

**آفـریدن(Aferîden):** ژ نەبوونیّ چیّکرن، خەلق کرن، ئافراندن.

**آفند(Afend):** شەڕ، جەنگ.

**آک(Ak):** خـرابی ـ ئیّش ـ زیان ـ ئاتاف.

**آکپ(Akup):** هوندریّ دەڤی.

**آکج(Akec):** چەنگالیّن ئاسنی.

**آکـنـدە پهـلـو(Akendê pehlû):** گەلەک قەلەو.

**آکندە گـوش(Akendê gûş):** بیّ گوهـ(ئەو کەسیّ کو گوهـ نەدەتە شیرەتیّن خەلکی ـ نە گوهدار).

**آکو(Ako):** بوم، کوند.

**آگـون(Agûn):** سەرنوخین ـ سەرابن.

**آل(Al):** سۆریّ ڤەبی(رەنگیّ سۆر) ـ ژنک دبیّژن (آل) تشتەکیّ وەکی ئەجنایە کو نائیّتە دیتن و وەسا بو خەلکی ددا خوباکرن کو خولکیّ ژنکەکا لاغەر ددەت و خوری مویە کو هەگەر ژنک بمینت بتنیّ ئەو (آل)دهیّتیّ و زبانیّ دگەهینتیّ ب تایبەت هەگەر ژنکا ب حەمل باریّ خوە دانابیت، دبیّژن شەڤا شەشیّ پشتی زانیّ، (آل)دهیّتیّ و جەرگیّ ویّ دئینتە دەر، لەورا ژی ڤەزای هندی نەبریە حەمامیّ بو شویشتنیّ نەدهیّلان بتنیّ ـ هەروەسا د عەرەبی دا دو ئانکوییّن

دی ژی ددەت کـو ئیـرانی ژی هەر ب وان ئانکویا بکار دئینن، ئەو ژی: «خـــــانەدان(اهـل) ـــ لەیلان(سراب)»ن.

**آلاس(Alas)**: رەژوی.

**آلاکـلـنـگ(Alakuleng)**: یـاری یەکە کو ئەم دبێژینێ (حل حوپین ـ دارناقۆس ـ شەقلەشیق)، هەروەسا ناڤێ کـێـزکـەکێ یە کـو بعـەرەبی دبێژنێ «ذراریح».

**آلانە(Alane)**: خانی ـ هێلین.

**آلبالو(Albalû)**: فـێـقـیـەکـە وەکی گێلاسێ یە بەلێ ژ وێ هویرترە.

**آلر(Aler)**: ران، رەهن.

**آلغدن(Aluxden)**: تورە بوون.

**آلفتن(Aluften)**: پەریشـان بـوون ـ تێکچوون(ژ ئەگەرێ تورە بوونێ).

**آلگونە(Algûnê)**: سـۆراڤـا روی یا کو ژنک بکار دئینن.

**آلنج(Alunc)**: حولیکا دارستانا.

**آلنـگ(Aleng)**: خـــــەندەک یـان شویرهە و دیوارێن بلند ژی بێن کو لدورمـاندوری کـەلهـا یان سـوپایا ئاڤا دکرن.

**آلو(Alû)**: حولیک.

**آلوئک(Alu'ek)**: هویرکـێـت بەرێ کلسێ.

**آلـوچـە(Alûçê)**: حـــــولـیـک، حولیترشک.

**آلودن(Alûden)**: شـێـلاندن ـ تێ گەڤزاندن ـ تەرکرن.

**آلـودە دامـن(Alûdê damen)**: دەهـمـــەن پیس ـــ خـــرابکار ـ گونەهکار ـ کەسا کو ناڤێ وێ ب پیسی(خرابی) چووبیت.

**آلونک(Alûnek)**: کولک.

**آلە(Aluh)**: ئەلهو.

**آلیـز(Alîz)**: جـوتک ـ زیچک ـ لیتک ـ حەبەلوتک.

**آمـاج(Amac)**: ئارمـانج ـ کـێل ـ گێسن.

**آمـادگـاه(Amadgah)**: رێـڤـەبەری یا کو ب ئامادەکرنا خوارن و کەل و پەلێن لەشکەری رادبیت.

**آمـار(Amar)**: سـەرژمـێـری؛ چەند جـۆر هەنە مـینا سـەرژمـێـری یا ئابووری و سەرژمێری یا رامیاری و سەرژمێری یا نفوسێ.

**آمـــــــــاردار(Amardar)**: ژمێریار(حسابدار ـ محاسب).

**آمـاس(Amas)**: جـهێ وەرمـتی ژ لەشی چ بریندار بیت یان هەرشی

بیت، (آماز و آماه) ژی لکارن.

**آمدن(Ameden):** هاتن ـ گەهشتن ـ دیاربوون ـ زڤرین.

**آمرزیدن(Amurzîden):** عەفووکرن، لێ بۆرین.

**آمرغ(Amurx-Amerx):** بۆ چەنداتییێ بکار دهێت ـ بها ـ بەرێز ـ مفا ـ پیچەک ژ تشتەکی.

**آمنه(Amene-ê):** پشتییێ دارا ـ قرش و قال.

**آموت(Amot):** هێلینا فڕندێن نێچیرێ وەکی: (بازی ـ ئەلهو ـ شاهین و......هتد).

**آموختار(Amûxtar):** فێربووی(بعەرەبی دبێژنێ معتاد).

**آموختن(Amûxten):** فێربوون.

**آمودن(Amûden):** چێکرن ـ بەرهەڤکرن ـ تێکهلکرن.

**آموزشگاه(Amûzêşgah):** جهێ فێربوونێ(خواندنگەه).

**آموزگار(Amûzgar):** فێرکەر ـ مامۆستا ـ رێ نیشاندەر ـ پەندبێژ، شیرەتکەر.

**آموسنی(Amvêsnî):** هەوی(دو ژنێن کو شوی ب مێرەکی کرین دبنە هەوییێن هەڤدو).

**آمه(Ameh):** ئامانێ کو حوبری دکەنێ بۆ نڤیسینێ.

**آمیختن(Amîxten):** ناڤێک هلکرن(تێکهلکرن) ـ هەروەسا (آمیزش Amîzêş) ژی کو ژ ڤێ پەیڤێ دهێتە وەرگرتن ب ئانکویا نێزیکی یا گوهنێلی یە.

**آمیزەمو(Amîzê mû):** کەسێ کو پرچا سەرێ وی رەش و سپی ناڤێک هلبیێن.

**آن(An):** ئیشارە بۆ تشتەکی یان کەسەکی ل دویر(وێ هە ـ وا هە ـ یا هە) هەروەسا بۆ کەسێ نەئامادە(ئەو).. هەگەر بۆ کومێ بکار بینن بۆ کەسا دێ بێژن (آنان) و بۆ کوما گیانەوەرا و کەل وپەلا (آنها) بکار دهێت.

**آن(Anê):** بۆ مالکیەتێ بکار تێت(یێ فلانی)؛ هەر وەسا (از آن Ezanê ـ زان Zanê) ژی بکار دئینن.

**آنجا(Anca):** وێراهە ـ وێرێ.

**آنچنان(Ançunan):** وەسا، واسی، وەتوڤ.

**آنچه(Ançê):** هەر تشت، هەر تشتێ کو.

**آنـدون(Andûn)**: ویـراهــه ــ وی رەخێ هە ـ وی دەمی، هینگێ.

**آن سری(An serî)**: ئاخرەتی ـ یێ وێ دنیایا دی.

**آنک(Anek)**: بـo دویراتییێ دهێت وەکی: (هینگێ ـ ئەو) لهـەمبـەر (اینک Înek = نۆکـە ـ ئەڤـە) ـ خوریک(ئێشا خوریک).

**آنـگـاه(Angah)**: هیـنـگـێ ــ وی دەمی ـ پاشی ـ پشـتی هینگێ ـ لدویڤرا.

**آنین(Anîn)**: جـەرکێ بچـویک کـو لشــوینا مــەشکێ بکاردئینن بۆ ژێگرتنا نیڤشکی ژ دەوی.

**آو(Av-w)**: ئاڤ.

**آوا(Ava)**: کـورتکریا پەیڤـا (آواز): ئاواز ـ دەنگ.

**آواخ(Avax)**: تەحـەم، مــخـابن. (آوخ، آە، وای، آوە، آواە، دریـغ، دریغـا و افـسـوس) ژی لـکارن هەر بو ڤێ مەبەستێ.

**آوار(Avar)**: تـوز و غــوبـار ـ دیـوار یان بانێ خانی کو خراب لێهاتبیت و بهـەرفیـت ـ کـورتکریا (آوارە) ـ بێ جـهـ ـ بەرزە ـ دەربەدەر، ئاوارە ـ سـتـەم ـ قـەهرین ـ رێـنج ـ خرابی ـ تالانکرن ـ لشـوینا (آمـار) ژی لکارە ئانکو سەرژمێری.

**آور(Aver)**: براســـتـی ـ راست و دروست ـ بێ گومان.

**آورد(Averd)**: جــەنگ، شـــەڕ ـ هێـرش ـ ئینا (بۆ سـێـیـەم کـەسێ تاک).

**آوردجو(Averdcû)**: شەڕکەر.

**آوردن(Averden)**: ئینان ـ دیارکرن.

**آورد و بـــرد(Averdo bord)**: ئینـان و برن(مــەبەست ژێ کــارێ بەردەوامە).

**آورک(Averek)**: بابەلیـــسـک ـ هێـزک(پێ یاریەکـە کـو خـوە پێ دادەن).

**آوند(Avend)**: گـــوزکێ ئاڤێ ـ گـوزکێ مـەیێ ـ د زاراوێ چاندنێ دا ئەو بۆریکن یێن کـــو ئاڤێ ژ رهێـن دارێ دکـــێـــشـنە بەلگا ـ هەروەسا بنێرە (آونگ) ژی.

**آونگ(Aveng)**: وەریسێ کـو تری یان هەر فێقیەکێ دیتر پێڤە بکن و ب بانێ خانی ڤە بهلاویسن ـ هەر تشـــتێ بهـــێـــتــە هلاویستن؛ پەیڤێن(آوند، آون) ژی لکارن.

**آویختن(Avîxten)**: هلاویستن.

**آويز(Avîz)**: شـەڕ، جـەنگ ـ هەروەسا ئانكويا (بهلاويسە)ژى ددەت، هندە جارا دگەل پەيڤەكا دى دهێت و ئانكوا بكەرێ شەڕى ددەت، وەكى پەيڤا: (گـلاويز «Gelavîz»: شـەڕكـەر، شـەڕڤـان)ـ هەروەسا (آويز) كـورتكريا پەيڤا (آويزە)يە ژى؛ ئانكو: هەلاويستى.

**آويژە(Avîje)**: تايبەت ـ صافى ـ هەڤـال و دوست و خزم. بۆ كـۆمێ (آويژگان و ويژگان) لكارن.

**آە(Ah)**: پەيڤا مخابنيێ يە ـ دەنگێ ئاخينك راهێلانێ يە.

**آهستە(Ahêstê)**: هێـدى، بێ دەنگ.

**آهـک(Ahek)**: كـلـس[ئـێـک ژ كەرەستێن ئاڤاكرنێ].

**آهمند(Ahumend)**: گـونەهكار، درەوكەر، عێبەلۆ.

**آهن(Ahen)**: ئاسن.

**آهن جفت(Ahen cuft)**: گێسن(بۆ كێلانا ئەردى بكار دهێت).

**آهن خا(Ahen xa)**: ئەو كەسێ كو ئاسنى ب ددانا نەرم دكەت(دركەيە بۆ هەسپێ ب هێز).

**آهن ربا(Ahen ruba)**: مگناتيس.

**آهنكار(Ahenkar)**: ئاسنگەر، هەسنكار. هەروەسا پەيڤا(آهنگر) ژى لكارە.

**آهنگ(Aheng)**: كـارێ سەفـەرێ ـ ئيرادە ـ رێباز ـ ئاواز.

**آهنگساز(Ahengsaz)**: ئاوازدانەر.

**آهنين(Ahenîn)**: وەكى ئاسنى.

**آهو(Ahû)**: خـەزال، ئاسـک ـ كێماسى(د كارى دا، د تشتى دا، ل مرۆڤى).

**آهوانە(Ahûvanê)**: وەكى خەزالا، خەزالى.

**آهوپا(Ahû pa)**: پێ كـو وەكى خەزالێ توند بچيت ـ خانيێ شەش كوژى.

**آهـو دل(Ahû dêl)**: تـرسـنـۆک، كولافە. (آهورى) ژى لكارە.

**آهون(Ahon)**: رێكا لبن ئەردى ـ شكەن.

**آهيانە(Ahyanê)**: قافێ سەرى كو بعەرەبى دبێژنێ (عظم قحف).

**آى(Ay)**: بۆ مخابنيێ و گازيكرنێ تێتە بكار ئينان.

**آیا(Aya):** ئەرێ، ئایا (بۆ پرسیارێ بکار دهێت).

**آیزنه(Ayêzne):** مێرێ خویشکێ، زاڤایێ مرۆڤی.

**آیش(Ayêş):** هاتن(هەگەر دارێن فێقی یێن وەکی سێڤ و حولیکا سالەکێ فێقی بدەن و سالا دی نە، ئەو سالا ب بەر بیت دێ بێژن ئەڤ دارە یا ب(آیش)ە ـ دیسان بۆ زەڤییێ ژی ئەڤ زاراوە لکارە بۆ نموونە لهندەک جها، سالەکێ زەڤی شۆڤە و بێ بەرە و سالا د دیڤدا تێتە چاندن و ب بەر دکەڤیت ئەو سالا زەڤی تشتەک لێ هاتبیتە چاندن دێ بێژن ئەڤ زەڤییە یا ب(آیش)ە، مەبەستا ڤێکرایی ئەوە کو ئەڤ سالە ئەڤ دارە یان ئەڤ زەڤییە دێ تشتەک ژێ هێت).

**آیشنه(Ayêşne):** جەهسویس ـ قەسەڤەگوهێز. (آیشتنە، آیشە، ایشە، ابیشە، اپیشە، انیشە)ژی لکارن.

**آیفت(Ayeft):** پێدڤیاتی، پێویستی، موحتاجی ـ نیاز ـ خواستن«طلب» ـ مفا، سوود.

**آییژ(Ayîj - Ayêj):** چریسک و گوریا ئاگری. (آییژە، آییژک، آبیژ، آبیز، ابیز، ابیزک، آبید) ژی لکارن.

**آیین(Ayîn):** دەستوور ـ رێباز ـ داب و نەریت ـ شەنگستە، بنواش، قاعدە ـ خوە جوانکرن(د بەرخوەڕا چوون).

**آیین جمشید(Ayînê Cemşîd):** ناڤێ ئاوازەکێ یە ژ ئاوازێن کەڤنێن ئیرانییان.

**آیینه(Ayînê):** خودیکا روناهیێ.

**آیینه چرخ(Ayînêyê çerx):** دڕکەیە ژ رۆژ(تاف)ێ.



**ابا(Eba):** آش(جـورەكێ خـوارنا روهنه)، بێى ئەليفا دەسپێكێ ژى تێـتـه بكارئينان وەكى: (شـوربا، جوجەبا).

**ابام(Ebam):** دەين، قەر.

**ابان(Eban):** هـەيـڤـا دووێ يـا پاييـزێ و هەيڤا هەشـتێ ژ سـالا هەتاڤى كو دبێژنێ(آبان) ژى.

**ابدالى(Ebdalî):** يێ (ابـدال)ى ـ هەژارى ـ ناڤێ تائيـفـەكێ يە ل ئەڤـغـانسـتـانێ كـو نوكـه دبێژنێ(دەرانى).

**ابر(Ebr):** ئەور ـ جورەكێ ليفكى كو لەشێ خـوە پێ دشـۆن ـ پرتەكـا ئيسفەنجى كو زڤركى دادننه سەر و ئامانا پێ دشۆن.

**ابر(Eber):** سلال، بالا، ژۆر.

**ابرنجك(Ebrencek):** كـەهرەب ـ برويسى.

**ابرو(Ebrû):** برە، برى.

**ابريز(Êbrîz):** زێرێ خـورى و بێ غەش.

**ابريشم(Ebrîşem):** ئارمـيش، ئاڤلميش.

**ابـزار(Ebzar):** ئـالاڤ ـ هـەر تشتەكێ كو كارەك پێ بێتەكرن. (افزار، اوزار) ژى لكارن.

**ابكار(Ebkar):** كـشـتـوكـالێ ـ جوتيارى.

**ابناخـون(Ebnaxûn):** كـەلە. (انباخون) ژى لكارە.

**ابـو عـطـا(Ebû 'Eta):** نـاڤێ ئاوازەكا موزيكا ئيرانى يە.

**ابيارى(Ebyarî):** خەلكێ «ابيار ـ گـوندەكـە ل مـصـرێ» ـ جـۆرەكێ پەرۆكى يە ـ جۆرەكێ كوترانه.

**ابیز(Ebîz)**: چریسکا ئاگری.

**اپرویز(Epervîz)**: سەرکەفتی ـ خوەشتقی.

**اپسان(Epsan)**: بەراڤ، هوسان. هەروەسا (افسان) ژی لکارە.

**اپشک(Epşek)**: خوناڤ.

**اپیشە(Epîşê-e)**: بێ کار.

**اج(Ec- Uc)**: کولند.

**اجامر(Ecamêr)**: کۆمەکا مرۆڤێن کو حەژ بەلبەلێ بکەن.

**اجغار(Ecxar)**: ئاگرێ گەش.

**اختر(Exter)**: ستێر ـ بەخت(ستێرا بەختی) ـ هەروەسا ناڤێ گیایەکی یە ـ چەرمەکێ چوارکوژی بسەرێ رمەکی ڤە(بۆ پتر زانیاری یا بنێرە: اختر کاویان).

**اختر بین(Exter bîn)**: ستێر ناس ـ فالڤەکەر، خێڤزانک.

**اختر شبگرد(Exterê şebgerd)**: دڕکەیە بۆ هەیڤێ و ئانکویا وێ، ستێرا کو ب شەڤ دگەریێت.

**اختر کاویان(Exterê Kaviyan)**: هەر وەکی مە ل پێشتر گوتی اختر چەرمەکێ چوارکوژی بوو کو ب سەرێ رمەکێ ڤە گرێدان و ب گەوهەرێن جوراوجور د خەملاندن و کەسەک دا هەلگریت و دا ب بەر سوپای کەڤیت. سەر دەمێ هەخامەنشی یان و ساسانیان ئەڤ (ئەختەرە) هەبوویە و چێدبیت هێشتا کەڤنتر ژی بیت، ژ بەر کو ڤەکۆلەر دبێژن (kavi) ئانکوا وێ (شاه یان ژی شاهزادە)یە و وەکی دبێژن (اختر کاویان) ئانکو ئەختەرا شاهینیێ، هەرچەندە د داستانێن کەڤن دا هاتیە کو (اختر = درفش) یا کاوێ ئاسنگر بوویە، یێ کو زحاک قەلپ دای و فریدون ئانیە شوینێ.

**اخترمە(Exterme)**: ئالا و هەسپ و چەک و هەر تشتەکێ وەکی وان کو د شەری دا ژ نەیاری بستینن(ب عەرەبی دبێژنێ غنیمە).

**اختە(Exte - Axte)**: خەساندی(مەبەست ژێ مرۆڤێ بێ گون کو یێ دەنگێ وی وەکی ژنکا و موی ل سەروچاڤان نەهێن، یان ژی ئەو هەسپێن کو دهێنە خەساندن داکو قەلەو ببن).

**اخروش(Uxrûş)**: دەنگ و هەرا، دەنگ و دۆر، قەرەبالغ.

**اخسمه(Exsume):** بیره.

**اخش(Exş):** قەدر و قیمەت و بها.

**اخـــکــکــنـــدو(Exkekendû):** خشخشوک.

**اخکوک(Exkok):** فـــێــــقـــیـێ نەگەهشـتی کـو لدەڤ مە پەیڤێن (کەرک و تویتک) لشوینێ دهێنە بکارئینان.

**اخگر(Exger):** پەل(رەژی یا ئاگـر پێڤە ـ گەش ـ).

**اخم(Exm - Exme):** کوریشکێن برهـ و ئەنیێ.

**اخـــمـــو(Exmû):** ئەنی گـرێ، برهـ تێکچووی، توبرە.

**ادا(Eda):** ناز و غەمزە ـ زارڤەکرن.

**اداک(Edak):** گـزیرتە، هشکی یا لناڤ دەریایێ.

**ار(Er):** کورتکری یا پەیڤا (اگر)، ئانکو: هەکـە، ئەگـەر، هەگـەر. دیسان کورتکری یا پەیڤا (ارە)یە ژی، ئانکو: مشار(منشار).

**ارابه(Errabe-ê):** ئەرەبـانا کـــو بدویڤ هەسپا ڤەدکەن.

**اربو(Erbû):** هرمیک.

**ارتجک(Ertecek):** بـرویـسی یێـن ئەسمانی.

**ارتش(Ertêş):** کـــۆمـــا ســـوپاییێن وەلاتەکی.

**ارتشبد(Ertêşbud):** بلندترین پلا لەشکەری یە لجەم ئیرانیان.

**ارج(Erc):** قەدر و قیمەت.

**ارج(Erec):** زاراوەکێ پیـڤـانێ یە، هەر ژ سـەرێ تبلێ تا دگـەهیـتـە دوماهیا ئەنیشکێ کو دورێن نیڤ میترێ یە.

**ارجمند(Ercmend):** ب قیـمەت، ب بها، رێزدار، هێژا.

**ارجنه(Ercene-ê):** ناڤێ ئاوازەکـا موزیکی یا کەڤنا ئیرانی یە.

**ارچه(Erçê):** هەرچەندە، هەکەرچی.

**ارچـــین(Erçîn):** دەرەجـــکـــێـــت پێسترکێ.

**ارد(Erd):** دروســـتـی و راســـتـی ـ پاکی، پاقـژی ـ ژێ هاتی، لایق ـ تورەبوون ـ ناڤێ فـریشـتـەکێ یە د ئاییێ زەردەشتیان دا کو زێرەڤانا مـــال و ســامـــانی یە ـ ناڤێ رۆژا بیـست و پێنجێ و ناڤێ زێرەڤـانێ رۆژا بیـــست و پێـنجێ یە ژ هەمی هەیڤێن سالا هەتاڤی.

**ارداد(Erdad):** فێلباز و حیلەکەر.

**اردب(Erdeb):** شــــەڕ و شـــۆر ـ

جەنگ.

**اردم(Erdem):** هونەر و پیـــشـــە ـ کارێ باش ـ هەر ئێک ژ سورەتێن مەزنێن پەرتوکا «زەند».

**اردە(Erde):** کـــــــــونجی یـێـن قوتای(ئارکێ کونجی یا).

**اردی(Urdî):** کـــــــورتـکری یـا «اردیبهشت» کو هەیڤا دووێ یە ژ سالا هەتاڤی یان ژی باشتر بێژین هەیڤا دووێ یە ژ وەرزێ بهارێ.

**اردیبهشت(Urdîbêhêşt):** بنێرە: (اردی)ـ د ئایینێ زەردەشتیان دا، ناڤێ فریشتەکێ یە کو د جیهانا مـــــینەڤی دا نوینەرێ پاکی و پیـــروزیێ یە و د جـــیـــهـــانا خـاکی(گـویا زەمین)دا زێرەڤـانێ ئاگـــــری یە و وەکـــــیلێ رۆژا (اردیبهشت)ێ یە کو رۆژا سێیێ یە ژ هەمی هەیڤێن سالا هەتاڤی، کو ئەڤ روژە لجەم ئیرانیان جەژن بوو و دگـــــوتنە ڤێ جـــــەژنێ (اردیبـــــهــــــشـــــــتگان ـ Urdîbêhêştgan).

**ارس(Ers):** روندک.

**ارشک(Erşek):** زەلام ـ نێـــر ـ ژ ناڤێن کەڤنێن ئیرانیان.

**ارغ(Urx):** کیفکویی بوون.

**ارغـشـتـک(Erxuştek):** رەقس و سەما ـ دەنگێ کو ژ لێکدانا تبلا رادبیت دەمێ سەماکەر گەلەک ب کەیف.

**ارغـون(Erxon):** هەسپێ کو حێل دکەتە غار.

**ارگ(Erg):** کەلها موکم کو دکەنە ئاڤاهیێ حوکمەتێ و ئەڤ کەلهە، کـەلهـەکـا بچـویکە کـو د ناڤ کەلهەکا مەزنتر دا دهێتە چێکرن.

**ارمـــزد(Urmuzd):** ســـتـــێـــرا «موشتەری» ـ ناڤێ رۆژا ئێکێ یە ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی.

**ارمغان(Ermexan):** خەلات و ئەو تشتێ کو رێڤنگ بۆ کەسەکی یان هندەکا دگەل خوە دئینیت دەمێ ژ وەغەرەکێ دزڤریتەڤە.

**ارمگان(Êrmegan):** فـێـرکـەر، مامۆستا، راهێنەر.

**ارمـوی(Urmevî):** بۆ وی کـەسی دهێتە گۆتن یێ کو خەلکێ باژێرێ «ئورمـــیێ» بیت کـــو باژێرەکێ کـوردسـتـانا ئیـرانێ یە، و هندەک ژی دبێژنە ڤی باژێری (رضائیه).

**ارناوود(Ernawud):** مللەتەکـە ژ

نەژادێ هندوئەوروپی کو ل وەلاتێ ئەلبانیا د ئاکنجی نە ـ ژنا شەرکەر و شەرهلێخ.

**ارندان(Erendan)**: پەیڤـــــــا حاشاتیێ(حاشا، کلا).

**اروانە(Ervane)**: جورەکێ حێشترا مێ یە.

**اروند(Ervend)**: ئەزموون ـ رێنج ـ کوڤـان ـ ئارەزو ـ جادوو ـ فـێل، حیلە ـ توند و تیژ ـ ب هێز.

**ارویـــس(Ervîs)**: د ئـــایـــینـــێ زەردەشتی دا ناڤێ بەرەکێ مەزنێ چوارگوشەیە کو ئالاڤێن عیبادەتی وەکی تەست و هاونی دادننە سەر.

**ارە(Errê)**: مشار(ئامیرەکە بو برینا دار و ئاسنی و......هتـــــد، بکار دهێت).

**اریب(Urîb)**: خـوەهر ـ چەمـیـای ـ شەت(بۆ پەرک و پەڕوک و زەڤیا) لکارە.

**اریس(Erîs)**: زیرەک و هشیار.

**اریش(Erîş)**: زیرەک و هشیار.

**ازار(Êzar)**: شـــەل ـ هیـــزار(بنێ دیواری ژ رویێ ئەردی تا نێـزیکی ئێـک مـــــیـــــتـــــرێ) ـ بنێ ئاڤێ(کوبرترین جهێ ئاڤێ).

**ازبر(Ezber)**: ژ بەر(حــــفـظ) [بۆ نموونـە هەگـــــەر هۆزانەکێ ژبەر بکەن]ـ ئەڤ پەیڤـــە د زمـــانێ عـەرەبی دا ئانکو زەلامێ ملپـان و ب زاخ و فـــارس ژی هەر ب ڤی واتای بکار دئینن.

**ازدر(Ezder)**: ژ هەژی.

**ازدو(Uzdo)**: جەوی، سترک.

**ازغ(Ezx)**: ئەو چقـێن دارێ یێن کو لدەمێ کەزاخێ دهێنە برین ـ کێم و عەداڤ.

**ازگات(Ezgat)**: دل پیس، دلخراب، دل ب گومان ـ بەدکار، خرابکار.

**ازیرا(Ezîra)**: ژ بەرکو، چونکی.

**اژکـهـــان(Ejkehan)**: تەنبـــەل، کەدوەر ـ کەڤر.

**اسپرسا(Espersa)**: ئیرانییێن کەڤن ئەڤ پەیڤە بۆ پیڤانێ بکار دئینان، ئەو ژی دا کورە جەحێلەک بۆ دەمێ دوو دەقـیـــقـــا کـــەتە غـــار و ئەو مەسافا کو بەزۆکی دپیڤا دگوتنێ (اسـپـرســا) یەک کـو بەرامـبـەری (١٥٠ـ١٨٩)میترایە.

**اســـپــرلوس(Êsperlos)**: تەلار، قەسرێن شاها.

**اسپـری(Êsperî)**: ب داوی هاتی،

بۆراندی.

**اسپندارمذ(Êspendarmez)**: د ئایینێ زەردەشتی دا، ناڤێ فریشتەکێ یە کو زێرەڤانا ئەردی یە و وەکیلا روژا پێنجێ یە ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی، هەروەسا ناڤێ هەیڤا دوازدێ و ناڤێ رۆژا پێنجێ یە ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی.

**اسپیتمان(Êspîtman)**: نازناڤێ زەردەشت پێغەمبەری یە.

**اسپیل(Espîl)**: کەسێ کو کارێ وی دزینا هەسپا بیت.

**است(Est)**: هەستی، هێسک.

**است(Est-Ust)**: کورتکریا اوستا (پەرتووکا ئایینی یا ئۆلێ زەرەدەشتییایە).

**استاخ(Ustax)**: دلێر، ئازا، نەترس. «گستاخ» پتر لکارە.

**استاره(Êstarê-e)**: ستێر ـ سازەکا مۆزیکێ یە کو ب سێ تێلانە ـ ئەڤ پەیڤە ب ئانکوا (نخێفک، پەردە و عەبا) ژی دناڤ زمانێ فارسی دا لکارە، هەرچەندە دیارە یا ژ زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگرتن.

**استاغ(Êstax)**: ستەور(گیانەوەر یان مرۆڤێ کو نەزێت).

**استام(Ustam)**: لغاڤا هەسپی ـ زینا هەسپی ـ هەر تشتەکێ هەسپی کو ب زێر و زیڤی هاتبیتە خەملاندن.

**استان(Ustan-Êstan)**: جە، جهێ راوەستیانێ، جهێ ئاکنجی بوونێ ـ پارێزگەه.

**استبر(Êstebr)**: مەزن ـ ستویر ـ ب کەلەخ.

**استخوان(Ustuxan)**: هەستی، هێسک ـ بەرک(وەکی بەرکێ خورمێ و بەرکێ مژمژێ...).

**استر(Ester)**: هێستر(گیانەوەرەکە).

**استردن(Usturden)**: تراشین ـ پاقژکرن.

**استرش(Usturêş)**: بیر، مەربێل.

**استره(Usture-ê)**: گویزان(ئالاڤێ سەر و روی تراشینێ بوو).

**استم(Êstem)**: ستەم، زولم، زۆری.

**استمگر(Êstemger)**: زۆردار، زالم، ستەمکار.

**استن(Ustun)**: ستوین.

**استنبه(Êstenbe-ê)**: کرێت ـ گر ـ ب هێز، دلێر ـ بۆ دێو و کابویسا دهێته گۆتن.

**استوار(Ustuvar)**: موکوم ـ راست و دروست ـ بنەجە ـ جهێ باوەرییێ ـ پلەکا لەشکەری یە دناڤـبەرا (گروهبانێ ئێکەم و ستوان)ی دا.

**استودان(Ustûdan)**: هەستیدانک ـ گـۆڕسـتـان ـ زیارەتێن زەردەشتیان.

**استودن(Ustuden)**: پەسندان ـ پێهەلدان، مەدحکرن.

**استور(Ustur)**: دەوارێ کـو باری بهەلگریت یان سـوارییێ قـەبویل بکەت، وەک: هەسپ و هێـسـتـر و......هتد. هەروەسا (ستور) ژی لکارە.

**استوه(Ustuh)**: وەستیای، ماندی.

**اسغر(Usxur)**: سیخور.

**اسکدار(Eskudar)**: نامـەبەر ـ پییلک(قاصد).

**اسکندان(Êskendan)**: کلیل و قفل.

**اسکنه(Êskênê-e)**: پیـککرن(بۆ داروباری لکارە).

**اسکیزه(Êskîzê-e)**: جـوتک هاڤێتنێن دەوارا.

**اسن(Esen)**: جلکێ بەروپشت، جلکێ ڤـاژی ـ گـوندورێت باژێرێ «فارس».

**اشپیل(Eşpîl)**: خەرزێ ماسی.

**اشتاد(Eştad)**: ناڤێ فریشتەکێ یە د ئایینێ زەردەشـتی دا و ناڤێ روژا بیـسـت و شـەشێ یە ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی.

**اشتر گاو(Uştur gav)**: زەرافە، (شترگاڤ پلنگ) پتر لکارە، ژ بەر کـو گـەردەنا وی وەکی یا هێشترێ یە و شاخێن وی وەکی یێن گاینە و رەنگێ وی ژی مینا پلنگی پنی پنی یە.

**اشترلک(Uşterlek)**: کەردیکل، کـو بعـەرەبی دبێـژنێ (نعـام)، هەروەسا د فارسی دا (شترمرغ) پتر دهێتە بکارئینان.

**اشتک(Êştek)**: قـومـاتک(ئەو پەڕوکێ کـو نوبزادەی دناڤ را دپێچن).

**اشتلم(Uştulum)**: زۆر و ستەم ـ قەرەبالغ و حەشترحۆت.

**اشرفی(Eşrefî)**: جۆرەکێ پارێ زێری یێ ئیرانی کو د کەڤن دا دهاتە بکار

ئينان و كێشا وى بەرامبەر (١٨ نوكا ـ زاراوەكە د پیڤانێ دا زێرنگر بكار دئینن ـ) بوو.

**اشک(Eşk)**: رۆندک ـ چیكێن ئاڤێ.

**اشكاف(Êşkaf)**: دەرز، كەلشت، شكەن ـ كون ـ كەنتورا پەرتووک و ئامانا.

**اشكافتن(Êşkaften)**: دەرزین ـ كەلشین ـ كونبوون ـ دەرزاندن ـ كەلاشتن ـ كون كرن.

**اشكفت(Êşkeft)**: ئەو تشتێ كو دەرز ڤێ كەفتی یان هاتیە كەلاشتن یان هاتیە كونكرن، بۆ نموونە هەگەر كونەک ل چیای ببیت دبێژنێ (اشكفت) یا كو ئەم دبێژینێ «شكەفت».

**اشكل(Êşkêl)**: هەسپێ كو دەستێ وى یێ راستێ و پێ وى یێ چەپێ سپی بن ـ فێل و حیلە ـ قەلپ، سەختە.

**اشک میغ(Eşkê mîx)**: باران، چیكێت بارانێ.

**اشكنه(Êşkene-ê)**: ناڤێ خوارنەكێ یە ـ ناڤێ ئاوازەكێ یە ژ موزیكا كەڤنا ئیرانی ـ بادان(بادانا بسكێ).

**اشكوفه(Uşkufe-ê)**: كولیلكا دارێ كو بەرى بەلگا دبشكڤن ـ هلاڤێتن(دل رابوون).

**اشنوسه(Êşnûse-ê)**: بێهنشک، (اشنوشە، شنوشە، شنوسە، وستوسە، ستوسر) ژى لكارن.

**اشو(Eşo)**: زەلامێ دلپاک و پیروز و ب وژدان ـ بەهشتی.

**اشیهه(Eşîhe-ê)**: شهینا هەسپی، (شیهه) ژى دئێتە بكارئینان.

**اصفهان(Êsfehan)**: كۆما سوپاه(اسپاهان) ـ ناڤێ باژێرەكێ مەزنێ ئیرانێ یە كو دبتە سەنتەرێ پارێزگەها دەهێ یا ئیرانێ ـ ناڤێ ئاوازەكا موزیكی یە.

**اصفهبد(Êsfehbud)**: اسپهبد: فەرماندێ سوپای.

**اعزام(Ê'zam)**: د فارسی دا ئانكو هنارتنا كەسەكی بۆ جهەكی.

**اغلیسون(Êxlîson)**: كەسكوسور، كەسكوئالا(قوس قزح).

**افت(Uft)**: كەفتن ـ كێمی، كێم و كاسی.

**افتادن(Uftaden)**: كەفتن( چ ژ جهەكێ خوە بهاڤێنە ئەردی و

بکەڤیت، یان ژی ژ زێدە وەستیانێ خوە لسەر پێت خوە نەگریت).

**افتالیدن(Êftalîden)**: رەشاندن - پەلاتەکرن - دڕاندن - کەلاشتن.

**افچە(Efçe)**: هەلامەت. هەروەسا (مترس، مترسک، هراسە، داهل) ژی د زمانێ فارسی دا دئێنە بکار ئینان.

**افد(Efd)**: سەیر، عنتیکە.

**افدر(Efder)**: مام(برایێ بابێ)، هەروەسا برازا ژی لکارە(چ کچ بت، چ کوڕ). هندەک جارا (اودر یان ژی اخدر) بکار دئینن.

**افدم(Efdum)**: دویاهی، سەرەنجام.

**افراس(Efras)**: کاریز - کانی.

**افزون(Efzûn)**: زێدە، پتر.

**افسر(Efser)**: تانج(کولاڤێ شاهینییێ) - پلەکا لەشکەری یە.

**افسردن(Efsurden)**: چرمسین - سار بوون - جەمسین - دلسار بوون - خەمگین بوون.

**افسوس(Efsûs)**: زولم و ستەم - خەم و کوڤان - ترانە و یاری.

**افسون(Efsûn)**: فێل و حیلە - قەلپ، سەختە.

**افشار(Efşar)**: مالکەکا تاولێ(تاولە جورەکێ یاریێ یە) - ناڤێ ئاوازەکا موزیکا ئیرانی یە - تائیفەکا نەژادێ تورکایە کو ل ئازەربایجانا ئیرانێ و قەزوین و کەرمانێ دژین کو (نادر شاهێ ئەفشار - ئەوێ کو ل سالا ١١٠٠کوچی ژ دایک بووی و ل سالا ١١٤٨کوچی بوویە شاهێ ئیرانێ و ل سالا ١١٦٠کوچی هاتیە کوشتن - ژ ڤێ تائیفێ بوو).

**افشک(Efşek)**: خوناڤ.

**افشون(Efşûn)**: سێ تلک و ملهێب.

**افشه(Efşe-ê)**: ساڤار - دانقوت.

**افغان(Efxan)**: هەوار - ئاخینک - زێمار.

**افگار(Efgar)**: کەسیرە، وەستیای - خەمگین - بریندار.

**افندیدن(Efendîden)**: شەرکرن - هلێخستنا شەر و شەرەنیخا.

**اقبیل(Êqbîl)**: ئقبال، بەخت - خوەشبەختی.

**اکبیر(Êkbîr)**: پیس، کرێت.

**اکدش(Êkdêş-Ekdeş)**: دوقوڕ،

گیانەوەر یان مرۆڤێ کو ژ دو نەژادا بیت(دەیک ژ نەژادەکی و باب ژ نەژادەکێ دیتر).

**اکنون(Eknûn):** نهۆ، نۆکە، نها. (کنون و نون) ژی لکارن.

**اکوان(Ekvan):** گولا ئەرغەوان ـ گونەهکار ـ ناڤێ دێوەکی یە د داستانێن شەهنامێ(شاهکارا ئەبولقاسم فردوسی)دا کو دگەل روستەمی شەر کر و هاتە کوشتن.

**اگر(Eger):** هەگەر، هەکە. (گر و أر) پتر لکارن ب تایبەتی د هۆزانان دا.

**اگرچه(Egerçê):** هەرچەندە، هەکەرچی.

**الاخن(Elaxûn):** ئاوارە و دەربەدەر.

**الام(Ulam):** ئەڤ پەیڤە ژ تورکی یا مەغولی هاتیە وەرگرتن و ل سەر دەمێ قەرەقویونلو و قەجەرا کەسەک هەبوو کو بەلاش خزمەتا مەئموورێ دیوانێ دکر و رێ نیشا وی مەئمووری ددا ژ گوندەکی بۆ ئێکێ دی کو دگوتنە وی کەسی یان وی رێ نیشاندەری: «الام».

**الاو(Elav):** گوری یا ئاگری.

**البا(Ulba):** خوارنەکە کو پێک دهێت ژ دل و مێلاک و پیشازێن لبەر دوهنی سۆرکری. (قلیه پوتی و حسرة الملوک) ژی لکارن.

**الباد(Êlbad):** کویرنج.

**الپر(Elper):** زیرەک ـ فێلباز.

**الجخت(Elcext- Elçext):** هیڤی ـ چاڤەرێ(بۆ وی کەسی دهێتە گوتن یێ کو چاڤەرێ ول هیڤیێ بت کو دێ خەلکەک هەر تشتا دەتێ، بلا نەی پێدڤی بیت ژی).

**الدنگ(Eldeng):** بێعار ـ کەدوەر ـ کولانی(یێ کو ل کولانا مەزن ببیت و هەر رۆژ ل مالا ئێکی بخۆت و ڤەخۆت).

**الرد(Elerd):** تورەکا مەزنە کو ژ ریسی دهێتە چێکرن و بۆ ڤەگوهاستنا (کا، شینکاتی، سلک و......هتد) بکار دئینن.

**الست(Elest):** ران، رەهن.

**الفختن(Elfexten):** کۆمکرن، خرڤەکرن. (الفاختن، الفخدن، الفغدن، الفنجیدن)ژی لکارن و بۆ جهێ کۆمکرنێ پەیڤا (الفنجگاه: Elfencgah) بکار دهێت.

**الفیه(Elfiye):** دەزگەهێ گوهنێلی

بێ زەلامی. «الفیه شلفیه»: ناڤێ پەرتوکەکێ بوو یا پری وێنێن رویس و دلبر کو «حکیم ازرقی شاعر» بۆ «طغان»شاهێ سەلجوقی بەرهەڤ کربوو و ناڤێ وێ کربوو [الفیه(کیر) و شلفیه(قوز)]، هەروەسا هندەک دبێژن «الفیه و شلفیه» ناڤێ دو ژنا بوویە.

**الک(Elek):** بێژینک.

**الک دولک(Elek dulek):** یاری یەکا بچویکایە کو ئەم دبێژینێ (ترانێ).

**الکی(Elekî):** کارێ بێهودە ـ ئاخفتنا کو راستی بۆ نەبت، (ئەم د کوردی دا لشوینا ڤێ پەیڤێ، پەیڤا «ژقەستا» بکار دئینین).

**الگو(Ulgû):** نموونە(خەیات و پێلاڤ چێکەر پتر بکار دئینن).

**الم شنگه(Elem şengê):** قەرەبالغ، هۆسە، دەنگ و دۆر.

**النگو(Elengû):** بازنک(ئەوێ کو ژنک بۆ جوانیێ دکەنە دەستێن خوە). (دستبند و دستیارە و دست برنجن) ژی لکارن.

**الوار(Elvar):** دەپێ پان و درێژ و ستویر.

**الواط(Elvat):** زەلامێ بێعار ـ فەلیتە و کولانی.

**الوس(Elûs):** سپی ـ هەسپێ سپی.

**الیجه(Elîce):** جۆرەکێ پەرۆکێ گەخگەخێ ئارمیشی یان هریێ یە کو ب دەستی چێدکەن.

**امرداد(Emurdad):** ناڤێ فریشتەکێ یە د ئایینێ زەردەشتی دا ـ ناڤێ روژا هەفتێ یە ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی ـ هەیڤا پێنجێ یا سالا هەتاڤی یە(مرداد).

**امرود(Emrûd):** هرمیک.

**امروز(Êmrûz):** ئەڤروکە(روژا کو ئەم تێدا)، بێی پیتا (ز) ژی گەلەک بکاردهێت.

**امروزه(Êmrûzê):** ڤی زەمانی، ڤی سەردەمی.

**امسال(Êmsal):** ئەڤ سالە(سالا کو ئەم تێدا).

**امشاسپند(Emşaspend):** فریشتە. د ئایینێ زەردەشتی دا ناڤێ هەر شەش فریشتێن مەزنێن پلە یەک(بهمن، اردی بهشت، شهریور، اسپندارمذ، خرداد، امرداد)بوو، و مەزنێ ڤان هەر

شەش فریشتا (سپنتامینو) بوو کو پاشان ناڤێ (ئاهورامەزدا) دانانە سەر.

**امشب(Êmşeb):** ئیشەڤ، ئەڤ شەڤە (شەڤا کو ئەم تێدا).

**امل(Ummul):** کەڤنەپەرێس (پتر بۆ وان ژنکا بکار دهێت یێن کو هێشتا گرێدای ب داب و نەریتێن کەڤن ڤە بن).

**امیان(Emyan):** چزدانکا چەرمی (چزدانکا پارا).

**انار(Enar):** هنار.

**انار بن(Enar bun):** دارا هنارێ.

**انارستان(Enarêstan):** باغێ هنارا.

**اناهیتا(A-Enahîta):** پیس نەبووی (پاک)ـ ناڤێ فریشتەکێ بوو کو وەکیلا ئاڤێ بوو کو پاشان گوتنێ (ستێرا زوهرە)؛ (اناهید) ژی لکارە و (ناهید) ژی کورتکری یا وێ یە ـ هەروەسا ناڤێ پەرستگەهەکێ بوویە ل هەمەدانێ و ل سەردەمێ «هەخامەنشی یا» ـ پەرتووکا ئاڤێستا، اناهیتا ب کچەکا جوان دایە نیاسین.

**انبار(Enbar):** عنبار.

**انبارک(Enbarek):** جەبلخانە، ئەڤ ناڤە ل سەردەمێ ساسانیان بۆ عنبارا چەکی دهاتە گۆتن، و ئەوێ کو لبەر دراوەستا دگوتنێ (انبارک سالار، یان ژی انبارک بذ).

**انباز(Enbaz):** هەڤتا ـ هەڤکار ـ شریک.

**انباشتن(Enbaşten):** عنبارکرن، خەزنکرن.

**انباغ(Enbax):** هەڤتا ـ هەڤکار ـ شریک ـ هەوی (دەمێ زەلام دکەتە دوو یا چەند ژن، ئەو ژن دبنە هەوییێن هەڤ).

**انبان(H-Enban):** هنبان.

**انبردست(Enburdest):** پلاییس، کێلبتان.

**انبره(Enbere):** گیانەوەرێ کو موی یان هریا وی وی وەریابیت ـ هەسپ و حێشترێ کو ئاڤێ پێ دکێشن.

**انبست(Enbest):** مەیین، جەمسین، قەرسین، رەق بوون (بو ماست و شیر و خوینێ دهێتە بکارئینان).

**انبله(Enbele):** تەمەرهند (فێقی

یەکە).

**انبوب(Enbûb):** بەرک و مەحفویر یان هەر تشتەکێ کو بێتە رائێخستن.

**انبودن(Enbûden):** ئافراندن، چێکرن، خولقاندن ـ چنین(گول چنین) ـ سەفتاندن(وەکی نقینکێن مالێ دەمێ کو لسەرێک دسەفتینن) ـ خڕڤەکرن و تژی کرن.

**انبوه(Enbûh):** پڕ، گەلەک ـ ئالوز و دناڤێکڕا.

**انبوییدن(Enbûyîden):** بێهن کرن.

**انبیس(Enbîs):** گەنم یان نوک و......هتد، کو گێرەکری بن و دابنە بای.

**انتر(Enter):** جۆرەکێ مەیمونکایە کو رانێت وێ د بێ موینە و کوریا وێ درێژە و سێرکباز بۆ کەناندنا خەلکی، وانا فێری کارێن سەیر و کەنیلۆک دکن.

**انجمن(Encumen):** جڤات.

**انجوخ(Encûx):** کوریشکێن سەروچاڤا یان لەشی ل ژێر کارتکرنا پیریێ.

**انجیر(Encîr):** هێژیر ـ کون.

**انجیر بن(Encîr bun):** دارا هێژیرێ.

**انجیردن(Encîrden):** کون کرن.

**انجیره(Encîrê):** کون( پتر بۆ کونا قۆنێ بکار دهێت).

**انجین(Encîn):** پرت پرت کری.

**انچوچک(Ençûçek):** دندکا هرمیکێ ـ هەر تشتەکێ هویر یان بچویک ـ مرۆڤێ بەژن کورت و هویر(قەزم).

**انداختن(Endaxten):** ئێخستن ـ هاڤێتن ـ رائێخستن.

**اندازه(Endazê):** چەنداتی ـ قەدارە ـ قەدر و قیمەت.

**انداوه(Endavê):** مالنج ـ شکایەت.

**اندخس(Endexs):** پشتەڤان.

**اندخسواره(Endexsvarê):** کەلە.

**اندر(Ender):** هوندر، ژ ناڤدا ـ هندەجارا دبیتە پێشگر و ب هەردوو رەنگێن (اندر، در) ل پێشی یا (فعل)ی دئێن و جارا ژی دبیتە پاشگر و بدویڤ (ناف)ی را دهێت و ئانکوا (زڕ) ددەت، وەکی(پدر اندر = زرباب).

**اندربای( Enderbay )**: کـورتکری یا پەیڤـا «اندربایست»ە، ئانکو: پێدڤی، پێویست.

**اندرخـور( Enderxor )**: هەژی، ب سەرڤە، لایق.

**اندرز( Enderz )**: پەند، شیـرەت ـ وەسیەت، حیکایەت.

**انـدرزگـــــــــر( Enderzger )**: نصحەتکەر ـ ل سەردەمێ ساسانیا دگوتنە مستەشار(راوێژکار)ی.

**انـــــــدروا( Enderva-derva )**: ســـەرنـوخـین ـ هلاویســـــتی ـ سەرگەردان.

**اندروب( Enderûb )**: گـــــــوری یاتی(جۆرەکێ ئێشا پویستی یە).

**اندرورد( Enderverd )**: شـەلوارێ کورت.

**انـدرون( Enderûn )**: هـونـدر، ژ ناڤدا.

**اندک( Endek )**: پیـــــچـــــەک، کێم. [ اندک اندک = پیچ پیچە، کێم کێم].

**انـدک خــــــور( Endek xor )**: کێمخوارە.

**اندمە( Endeme )**: بیرئانینا خەمێن کەڤن ـ گوتنا سەرهاتیێن نەخوەش و خەمگین.

**اندوختن( Endûxten )**: خرڤەکرن، کۆمکرن، جەماندن.

**اندول( Endûl )**: بەرک.

**اندوە( Endûh )**: خـەم ـ کـۆڤـان ـ کەسەر.

**انـدوە زدا( Endûh zuda )**: ئـەو تشت یان ئەو کەسێ کو خەما کێم بکەت.

**اندوەفـــــزا( Endûh feza )**: ئەو تشت یان ئەو کەسێ کو خەما زێدە بکەت.

**اندوهگســـــار( Endûhgusar )**: خـەمـخـور ـ خـوە شـریـک زانین د خەمێن ئێکێ دی دا ـ ئەو کـەسێ کو دلەی دلی کەسێ دلمای ددەت.

**اندوهگین( Endûhgîn )**: خەمگین، دلتەنگ.

**اندی( Endî )**: ب هیڤی بوون ـ سەیر ـ هەروەســـا ئانـکوا «بـوو ـ بلا ببت(باشە) ـ ماژخوەنە ـ بەلکی» ژی ددەت.

**اندیشـمند( Endîşmend )**: خـودان هزر، رەوشەنفکر، رەوشەنبیر.

**اندیشـە( Endîşê )**: هزر ـ دالغـە ـ گومان ـ ترس.

**انر(Ener):** هەر تشتەكێ كرێت و پيس ـ ترسناک.

**انژه(Enje):** نیسک.

**انفـست(Enfest):** تەڤنێ تەڤنپیرکێ، تەڤنێ داپیروشکێ.

**انگ(Eng):** زرکێتک ـ مێشا هنگڤینی ـ دۆب(دۆبا هنگڤینی) ـ ئاڤا فێقی(عصارة) ـ بۆریکێت کو ژ تەقنێ هاتبنە چێکرن و دناڤ دیواری یانژی ل بن ئەردی ڕا بۆ ڤەگوهاستنا ئاڤێ دهێنە بکارئینان.

**انگار(Êngar):** هەروەکی، هەچکو.

**انگارده(Êngarde):** چیڤانۆک ـ چیرۆک ـ سەرهاتی.

**انگاز(Engaz):** ئالاڤ.

**انگبین(Engebîn- Engubîn):** هێنگڤین یانژی هەر تشتەکێ شرین.

**انگرده(Engurde):** تلیا تری.

**انگروا(Engêrva):** هەڤشی. هەروەسا (زاغه و آغل) ژی دهێنە بکارئینان.

**انگر مینو(Enger mînû):** انگره مەئین یەوە: روحا خرابکار(ئەهریمەن)، د ئایینێ زەردەشتی دا ڕێبەرێ خرابیێ و نیشانا شەر و فەساد و پیسیێ و سەرۆکانیا پویچی و کرێتاهی و تاریاتیێ یە.

**انگژ(Engej):** بێر، مەربێل.

**انگشت(Enguşt):** تبل، تل(تلێن دەستی یان پێی).

**انگشت(Engêşt):** رەژی.

**انگشتال(Engêştal):** نەخوەش، نەساخ.

**انگشتر(Enguşter):** گوستیرک.

**انگشت شمار(Enguşt şumar):** کێم(تەمەت تلێن دەستا).

**انگشته(Enguşte):** ملهێب.

**انگل(Engul):** تلێن دەستا.

**انگور(Engûr):** تری؛ لێ هەگەر نەگەهشتی بیت دبێژنێ «غوره Xûrê».

**انگورستان(Engûrêstan):** رەزێ تری. هەروەسا (تاکستان، موستان، رزستان) ژی گەلەک لکارن.

**انگور فرنگی(Engûr ferengî):** دڕی، تری رەشک.

**انگورک(Engûrek):** بۆ بچویک کرنا تری دهێتە گوتن ـ جۆرەکێ

تەڤنپیرکایە ـ بیبیک(بیبیکا چاڤی).

**انــــگــــوری(Engûrî)**: یــــا تری(مەبەست ژێ ئەو مەیە یا کو ژ تری دهێـــتـــە چێکرن) ـ یا باژێرێ(انگوریە، انگورا، آنقــرە، آنکارا، پایتەختێ تورکیا) کو د کـــەڤن دا لڤی باژێری جـــۆرەکێ شالا دهاتە چێکرن و یا ناڤدار بوو ب شالا ئەنگوری.

**انگیــختن(Engîxten)**: لڤـاندنا تشتەکی ژ جهێ وی ـ دانەکاری ـ ئاراندن.

**انگیزە(Engîzê)**: ئەگەر، سەبەب.

**انوشــــە(Enûşe-ê)**: نـەمـــــر، هەردەمی، هەردەم شین.

**انیران(Enîran)**: ناڤێ فریشتەکێ یە د ئایینێ زەردەشــتــی دا کـــو وەکیلە ب ژن ئینانێ ـ رۆژا سیهێ یە ژ هەمی هەیڤێن سالا هەتاڤی ـ یێ نە ئیرانی ـ ژ بلی ئیرانێ.

**انیـــسان(Enîsan)**: چیـڤـانۆک ـ ئاخفتنێن درەو و بێهودە.

**انین(Enîn)**: گـوزکێ بچـویکێ کـو ژ تەڤنێ هاتبیتە چێکرن.

**اوام(Evam)**: دەیـن، قــــــەر ـ رەنگ(لون).

**اوباردن(Obarden)**: داعویران.

**اودر(Evder)**: مام(برایێ بابێ).

**اور(Ever)**: خـەبەر، جنێـو، قەسێن کرێت، فەحش.

**اورا(E-Uvra)**: کەلە.

**اورمـــزد(Ormezd)**: کــورتکری یا ئاهورامــەزدا(خــودایێ ئێکانە) ـ ناڤێ ستـێرا موشتـەری یە ـ ناڤێ فـریشـتـەکێ یە ـ ناڤێ رۆژا ئێکێ یە ژ هەمی هەیڤێن سـالا هەتاڤی. بۆ زانـینا هەر رۆژەکێ نـاڤێ خـــوە هەبوویە کـــو ئەو ژی ئەڤـــەنە: «اورمـزد ـ وهـمن ـ اردی بهـشت ـ شـهریور ـ سفندارمذد ـ خورداد ـ امــرداد ـ دیبـآذر ـ آذر ـ آبان ـ خیر ـ ماە ـ تیر ـ گوش ـ دیبمهر ـ مـهر ـ سروش ـ رشن ـ فـروردین ـ ورهرام ـ رام ـ باد ـ دیبـدین ـ دین ـ ارد ـ اشتاد ـ آسمـان ـ زامیـاد ـ مانترسفند ـ انارام».

**اورنگ(Evreng)**: تەخت(تەخــتێ شــاهـینیێ) ـ عـــەقل و زانین ـ مەزناتی و جوانی.

**اوستـام(Ostam)**: زین یان لغـاڤێ هەسپی.

**اوشنگ(Evşeng):** رستا کو جلکا پێ داددەن.

**اولنج(Olênc):** ئوبشـیێ تری کـو تلییێن تری پێڤە نەمابن.

**اویارقلی(Evyarqulî):** دەبەنگ.

**اهتـوخـشی(Uhtûxuşî):** یان ژی اهنوخوشي: صنعەتکار.

**اهران(Ehran):** تەبەرک.

**اهرم(Ehrum):** لهازە.

**اهمر(Ehmer):** طۆری، توبری.

**اهوار(Ehvar):** سـەرگـەردان، حەیران.

**ایارە(Eyare):** بازنک، دەستبەند.

**ایاز(Eyaz):** فـێنکە بایێ کـو ب شەڤ دهێت.

**ایازی(Eyazî):** خێلی، پۆشی(پاتێ رەشێ کو ژنک ب سەر چاڤێ خوە داددەن).

**ایتـکین(Ît-Êytkîn):** خـودانێ خانی.

**ایتـوک(Ît-Êytûk):** مـوژدە، مزگینی.

**ایدر(Îder):** ڤـێرە، ل ڤـێرە ـ نوکـە، نها، نهو، نهە.

**ایدون(Îdûn):** نوکـە، ئەڤ دەمـە ـ ڤێرە ـ ئاها هۆسا.

**ایر(Êyr):** قـونێـر و پرسکێن هوبر ـ ئالاڤێ گوهنێلیێ زەلامی(کیر).

**ایرمان(Êyrman):** مێهڤان.

**ایزد(Îzed):** خودا.

**ایستادن(Îstaden):** راوەستیان.

**ایشان(Îşan):** ئەو(جـهناڤێ کـۆم بۆ کـەسـێن سـیێ یێن نەدیار)، هەروەسـا وەک رێزگـرتـن بۆ (جـهناڤێ کت بۆ کەسێ سیێ یێ نەدیار) ژی دهێت.

**ایمد(Eymed):** گـێسن(جوتیـار بۆ قلێب کرنا زەڤیێ بکار دئینن).

**این(În):** ئەڤـە(جهناڤێ نیشـاندانێ بۆ نێزیکیێ)، ئەڤ جهناڤە هەکەر ببیـتە کۆم، بۆ مرۆڤـا دێ (اینان) بکار ئینن و هەگەر کۆما گیانەوەرا یان تشـتـا بیت دێ (اینهـا) بکار ئینن.

**ایوار(Êyvar- Êyvare):** ئێڤار.

**ایـواز(Êyvaz- Êyvaze):** خەملاندی.



**ب(Ba):** تیپا دووێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی. هندەک جارا دهێتە گـوهارتن بۆ تیـپـا (و)، وەکی: (باز: واز = ڤـەکـری. یان آب: آو = ئاڤ)، و هندەک جـارا دبتـە (ف)، وەکی: (ابـزار: افــزار = ئالاڤ)، و ل هندەک جـهـان دبتـە (م)، وەکی: (غـژب: غـژم = لبـا تری) ـ ل دەستپێکا کارێ فەرمان ژی دهێت، وەکی: (برو: هەرە).

**با(Ba):** ئـامـــرازێ پەیـوەنـدیێ یە(دگـەل) ـ کـورتکریا پەیڤـا (بـاد)ە؛ ئـانـکـو: بـی، بـیـت، وەکی(زنـده بـا: ســاخ بی، هەر بژی) ـ پێشگرەکە د زمانێ کوردی دا بەرامـــبـــەر (ب)ە، وەکی: (بـاهـنـر«ب هـونـەر»، بـا ادب«ب ئەدەب» و......هتـد) ـ کـورتکریا (ابا) یا عـــەرەبی، وەکی: (ابا جعـفـر: با جعـفـر، ابا سـعـیـد: با سعید و......هتد).

**با آفـــرین(Ba aferîn):** هەژی پەسندانێ.

**با ارز(Ba erz):** گـرانبـهـا، هێـژا، بەرێز.

**باب(Bab):** باب ـ هەژی، لایق، ب ســەرڤــە ـ نســبــەت، حق، وەکی دبێـژن ب نسـبـەت یان دەرحـەقـا فـلان تشـتـی، د فـارسی دا دبێـژن (در باب فـلان چیـز) ـ بۆ پیـڤـانێ بکار دهێت بەرامبەر (٦٠)شێست گەزایە.

**بابا(Baba):** باب، باپیر، پیرەمێر.

**بابزن(Babzen):** سیخا کەبابا.

**بابک(Babek):** کـورتکریا پەیڤـا (باب)ە ئانکو بابێ بچـویـک ـ پەروەردەکـەر ـ جـهـێ باوەریێ و شول بنەجه.

**بـابـو(Babû):** کـــــــــورتـکـریـا پەیڤا (باب)ە ئانکو بابێ بچوبک ـ دەروێش یان مەزنێ دەروێشا.

**بابوتە(Babûte-ê):** گــوزکێ پری ئاڤ.

**بابیزان(Babîzan):** باوەشینک.

**باترە(Batere-ê):** دەف ـ بازنە.

**بـــاتـــنـــگـــان(Batêngan):** باجانرەشک.

**باج(Bac):** باج، خـویک ـ گـوتار ـ ئێک ژ مـەراسـیـمـێت ئۆلی یێن زەردەشـــتی یا ـ تاریـاتی و بێ دەنگی ل دەمێ دەســتـپـێـکرنا مەراسیمەکا ئۆلی ـ هەروەسا ئەو دوعـایێن کـو هێدی و لبن لێڤاڤە دخـوینن ـ ناڤێ ئێک ژ نڤـێـژێن زەردەشـتـیـا «سروش باج»ە ئانکو گـــوتنا ســـروش؛ ئەو ژی دەمێ سـپـێـدێ ژ خـەو رادبن و پشـتی دەست و روییێن خـوە دشـون ڤێ نڤێژێ بجه دئینن.

**باجریزە(Bacurbuze-ê):** هەژی ـ کـەسێ کـو بشـێت سـەرپەرشـتی یا هندەکێن دی بکەت.

**باخت(Baxt):** دۆڕا(خسارەت بوو).

**باختر(Baxter):** رۆژئاڤا، پەهلەڤی یا بۆ (باکور) بکاردئینان.

**باخە(Baxe-ê):** کویسەلە.

**باد(Bad):** با(هەوایێ کو بلڤلڤت). ـ وەرمـتـنا جـهـەکی ژ لـەشی لدەمێ ئلتـیـهـابێ ـ دفنبلندی(غـرور)ـ بۆ دوعـــایێ بـکـار دهێت ب ئانـکـویا «بی»، وەکی: (زنـده بـاد: ســـاخ بی، ســـاخ بت، هەر هەبت، هەر بژیت).

**باداباد(Badabad):** لشــوینا ڤێ رسـتێ دهێت: (چ دقـەومـیـت بلا بقەومیت).

**بادافراە(Badefrah):** سزا.

**بادام(Badam):** باهیڤ.

**بـــادام بـــن(Badam bun):** دارا باهیڤێ.

**بادام سـیـاە(Badamê siyah):** دڕکەیە بۆ چاڤێ دلبەرێ.

**بادبان(Badban):** ئەو خـیـڤـەتا کـو دئێخنە بەلەما دا بلڤلڤت، بعەرەبی دبێژنێ(شراع).

**باد بدست(Bad bêdest):** دڕکـەیە بۆ مرۆڤێ رویت و دەسـتـڤـالە و بێ شۆل.

**بادبر(Badber):** دڕکـەیە بۆ مـرۆڤێ مەدحۆک و چو ژێ نەئێت.

**باد بروت(Badê burût)**: دڕکەیە بۆ کەسێ کو ژ بلی خوە کەسێ نەبینت(خوە گەلەک مەزن دبینت).

**بادبز(Badbez)**: پاییز(وەرزێ پاییزێ).

**بادپا(Badpa)**: دڕکەیە بۆ ب حێل ڕێڤەچوونێ(پتر بۆ هەسپی بکار دهێت).

**بادپیما(Bad pêyma)**: بنێرە بادپا ـ بۆ مرۆڤێ بێکار و مفلس و درەوکەر و پرپێژ ژی لکارە.

**بادخیز(Badxîz)**: جهێ کو گەلەک با لێ بهێت.

**باد دار(Bad dar)**: وەرمەتی ـ دڕکەیە بۆ مرۆڤێ خوە مەزن بکەت ـ هەروەسا کارێ فەرمانە و ئانکو: وەسا هزر بکە کو بایە. یان ژی: چو هزرا ژێ نەکە.

**باد دست(Bad dest)**: کەسێ کو گەلەک پارا سەرف بکەت.

**بادرم(Badrem-rum)**: بێهودە ـ بێ کارتێکرن ـ ڤەمای.

**بادرو(Badro)**: خانییێ هاڤینی کو هەرچوار رەخێن وی با تێرا بێت و بچیت.

**بادروزە(Badrûzê)**: هەرۆک(یێ هەر رۆژ).

**بادزن(Badzen)**: باوەشینک و پانکە.

**بادسار(Badsar)**: عاقل سڤک ـ وەکی بای(مەبەست ژێ بۆ چوونێ).

**بادسنج(Badsenc)**: دڕکەیە بۆ کەسێ کو د هزرا دا دگەهتە ئارمانجێن خوە ـ ئالاڤەکە کو پلا لەزاتی یا بای دیار دکەت و بعەرەبی دبێژنێ(میزان الرياح).

**بادکنک(Badkunek)**: پفدانک ـ میزدانک، میزلدانک(مثانە).

**باد گند(Badê gund)**: ئێشا «فتق»، وەرمتنا کو دکەڤتە گونا.

**بادل(Badêl)**: دلێر، دلاوەر، عەگید، مێرخاس.

**بادنجان(Badêncan)**: باجانرەشک.

**بادنما(Badnema)**: ئالاڤەکە کو دادننە د رێیا بای دا، دا بزانن کا با ژ کیژ رەخی ڤە دهێت.

**باد نوروز(Badê nûrûz)**: بایێ بهارێ ـ ناڤێ ئاوازەکا موزیکی یە.

**بادوبود(Bado bûd)**:

دفنبلندی(غرور).

**بادوبید(Bado bîd):** بێ سوود، بێ مفا، بێهوده.

**باده(Bade-ê):** مەی.

**باده پەرست(Badê perest):** مەیڤەخۆر ـ مەی پەرێس.

**بار(Bar):** (بار)ێ هلگرتنێ ـ بچویک د زکێ دەیکێ دا ـ بەرێ دارێ(فێقی) ـ سفر یان هەر کەرەستێ کانی کو ب زێری یان زیڤی هاتبیتە طام دان ـ کیمیایا کو ب زەڤیێ وەردکەن ـ جار، کەرەت(ئێک جار، دو کەرەت) ـ بۆ مەزناهیێ دگەل ناڤێن خودێ دئێت کو کورتکریا (باریء)یا عەرەبی یە، وەکی (بارالله ـ باریء تعالی) ـ روخسەت، ئزنە، ئانەهـ ـ پاشگرە و ئانکویا کنار و تژیاتی یان مەشەیێ ددەت، وەکی(جویبار، رودبار) ـ هەروەسا هاتیە ژ «باریدن ـ بارین»، وەکی (اشکبار: رۆندک رێژ، خونبار: خوین رێژ).

**باراه(Barah):** کەسێ کو ل رێیەکا راست بچت ـ ب وژدان.

**بارجامە(Barcamê):** جهال ـ تێر.

**باردار(Bardar):** دارا ب بەر ـ ژنکا ب تشت(حال) ـ گیانەوەرێ ئاڤز.

**باردیچ(Bardîç):** دارەکێ درێژ کو ریتالەکا پەرۆکی ب سەرێ وی ڤەدکەن و وی پەرۆکی تەڕ دکەن و تەنویرێ پێ پاقژ دکەن.

**بارک(Barêk):** کورتکری یا (باریک)، ئانکو زراف.

**بارکش(Barkêş):** باربەر(حمال)، هەروەسا بو گیانەوەری و عەرەبانێ و ترومبێلێ ژی دهێت یێن کو باری بکێشن.

**بارکش(Barkeş):** خەمگین، خەمخور، خەمدار.

**بارگاه(Bargah):** ژ دو پەیڤێن (بار = روخسەت) و (گاه = پاشگرێ جهی، جهـ) پێکهاتی یە، ڤێکرا ئانکو ئەو جهێ کو شاه روخسەتێ بدەتە خەلکی کو وی لێ ببینن.. لڤێ داویێ ئەڤ پەیڤە هەر ب ڤێ ئانکویێ د ناڤ مە کوردا ژی دا پەیدا بوویە، لێ ئەم (بارەگەه) بلێڤ دکین.

**بارگین(Bargîn):** هەر تشتێ کو ئاڤێ تێدا یان ل پشت خرڤە

بکەن، وەکی: سکر، چاڵ.
**بارو(Barû):** دیواریَ کەلهیَ، شویرهە.
**باروا(Bareva):** هەژی، ب سەرڤە، لایق.
**بارور(Barver):** بنیَرە (باردار).
**بارە(Bare-ê):** هەسپ ــ تەرز و شێواز ـ ب نسبەت، دەرحەق(ب نسبەت فلان تشتی یان دەرحەق فلان تشتی) ـ جار، کەرەت ـ پاشگرە و ئانکویا حەژێکرنیَ ددەت، وەکی: (زنبارە = کەسیَ کو حەژ ژنکا دکەت. شاعر بارە = کەسیَ کو حەژ هوزانڤانا بکەت).
**بارەبند(Barê bend):** گۆڤ، جهیَ کو هەسپا لیَ گریَ بدەن.
**باریدن(Barîden):** باران ـ گژلوک ـ بارین ـ بەفر بارین.
**باریک(Barîk):** نازک ـ لەغەر ـ زراڤ.
**باریک بین(Barîk bîn):** زیرەک، هوشیار.
**باز(Baz):** پێشگرە و ئانکویا ویَ ب ویَ پەیڤیَ ڤە گرێدایە یا کو بۆ دبیتە پێشگر، وەکی(بازآمدن = هاتنەڤە، بازآوردن = ئینانەڤە، بازیافتن = دیتنەڤە)ـ کاریَ فەرمانە ژ (باختن = دۆراندن) ـ ئانکویا دۆراندی یان یاریکەر ددەت وەکی لدویڤ هندەک پەیڤا دهێت، وەکی: (جان باز = کەسیَ کو گیانیَ خوە گۆری تشتەکی یان کەسەکیَ یان ئارمانج و دۆزەکیَ بکەت، سرباز = ئەو کەسیَ کو ژ بۆ خاترا تشتەکی یان کەسەکی سەریَ خوە ژ دەست بدەت؛ حقەباز = کەسیَ کو یاریا ب حیلا دکەت(حیلەکەر)، کبوترباز = کەسیَ کو یاریا ب کوترکا دکەت ـ ڤەکری(دژی گرتی) ـ بازی(ناڤیَ فرندەکیَ نێچیریَ یە) ـ ژ سەریَ تبلا تا ئەنیشکیَ.
**بازار(Bazar):** بازار، سویک(جهیَ کرین و فروتنا تشتا)، هەروەسا بۆ قەیسەریێ ژی دهێت.
**بازارگان(Bazargan):** بازرگان(تجار)؛ هەر ژ ڤیَ پەیڤیَ یە: (بازرگانی = تجارة).
**بازآورد(Bazaverd):** خەلات(ئەو خەلاتێن کو لدەمیَ کەسەکیَ ژ وەغەرەکیَ بزڤریتەڤە، بۆ هەڤال و نیاسێن خوە بینیت)، (رەآورد،

سوغات، ارمغان و پیشکش) د زمانێ فارسی دا پتر لکارن.

**بازپرس(Bazpurs):** پرسیارکەر(کارمەندێ رێڤەبەرییێن پولیسا یان دادگەهێ دەمێ کو گونەهباری پرسیارپێچ دکەن).

**بازپس(Bazpes):** ل پەی، لدویڤ.

**بازپیچ(Bazpîç):** ئەو زرزرکێن کو بهنداڤ سەرێ بچویکی ڤەدکەن دەمێ دلاندکێ دا، دا بۆ خوە یاریا پێ بکەت.

**بازجو(Bazcû):** ڤەکولەر(کەسێ کو ژ ئالیێ دەولەتێ ڤە ل ئەشکەراکرنا هندەک نەپەنی یا بگەرییێت).

**بازداشت(Bazdaît):** رێگری ـ گرتن. هەر ژ ڤێ پەیڤێ یە: (بازداشت کردن = زیندانکرن).

**بازدم(Bazdem):** هەوایێ کو مرۆڤ یان گیانەوەر هلدکێشیت دبێژنێ(دم = dem)، و ئەڤ هەوایە دەمێ کو دەردکەڤیتە ژ دەرڤە دبێژنێ (بازدم).

**بازدید(Bazdîd):** سەرەدان(دیدارکرن).

**بازرس(Bazres):** چاڤدێر.

**بازرستن(Bazresten):** ئازادبوون، رزگاربوون، قورتال بوون، ڤەرەستن.

**بازماندن(Bazmanden):** د جە دا مان ـ پاشڤەمان ـ وەستیان.

**بازنشستن(Baznêşesten):** روینشتن، خوە دانەپاش ژ کاری؛ هەر ژ ڤێ پەیڤێ یە: (بازنشستە = خانەنشین).

**بازو(Bazû):** زەند(ژ ملی تا ئەنیشکێ).

**بازودادن(Bazû daden):** دڕکەیە ژ هاریکاری کرنێ.

**بازولە(Bazûle-ê):** جەنجەر.

**بازە(Baze-ê):** ڤەکری ـ گەلی(ناڤبەرا دو چیایا) ـ ناڤبەرا دو دیوارا، یان ژێ پانی یا کولانێ ـ د زاراوێ جوتیاری دا سنورێ کو دو زەڤی یا یان دو لاتکا ژێک جودا کەت.

**بازهشتن(Bazhêşten):** ئازادکرن، لێ گەڕان(بەلا خوە ژێڤەکرن).

**بازی(Bazî):** یاری، گەمە.

**بازیگوش(Bazîgûş):** ترانەکەر، کەسێ کو هەردەم حەز ژ یاریا بکەت.

**باژرنگ(Bajreng)**: بەرگلیسکێ بچویکا ـ زەخمە(یێن کو ژنک بسەر مەمکێن خوە دادگرن).

**باستار(Bastar)**: د کوردی دا ل شوینا «فلان» دهێت، فارس دبێژن: (باستار و بیستار) و ئەم دبێژین: (فلان و بێهڤان).

**باستان(Bastan)**: کەڤن ـ بۆری ـ دێرین.

**باستان شناس(Bastan şênas)**: شوینوارناس.

**باسەرە(Basere-ê)**: زەڤی یا بەرهەڤ بۆ چاندنێ.

**باسک(Basuk)**: باوشکێن خەوێ، (خمیازە، دهن درە، فاژ، ڤاژ، پاسک، پاشک) ژی لکارن.

**با سنگ(Ba seng)**: ب سەنگ، ب قیمەت، گرانبها.

**باسواد(Ba sevad)**: ئەو کەسێ کو بزانت بخوینت و بنڤیست، خوبندەوار.

**باشام(Başam)**: پەردە.

**باشامە(Başame-ê)**: عەبا ـ دەرسوکا ژنکا.

**باشتین(Baştîn)**: فێقیێ کو ژ دارێ هاتبیتە چنین ـ ناڤێ گوندەکی یە سەر ب باژێرێ «سبزوار»ڤە.

**باشگاه(Başgah)**: حەوشەک یان تالارەکی مەزن کو خەلکەک لێ خرڤە ببیت، چ بو وەرزشکرنێ ببیت یان ژی بو یاریکرنێ و بێهنڤەدانێ، لێ نۆکە پتر بۆ یاریگەها وەرزشی دهێتە بکاربرن.

**باشنگ(Başeng)**: ئویشێ تری یێ هلاویستی ب دارمێوێ ڤە(چ هشک بت، چ هێشتا یێ تەڕ بت) ـ خیارێ مەزن کو جوتیاری هلگرتبیت بۆ تۆڤی.

**باشنگان(Başengan)**: شێڤا خیار و گوندورا و تشتێن ژ ڤی رەنگی، هەروەسا (جالیز و پالیز و باغترە) ژی دهێنە بکارئینان.

**باغچ(Baxeç)**: بێسیرە(ترێ نیڤ گەهشتی).

**باغچە(Baxçê)**: باغێ بچویک.

**باغ سیاوشان(Baxê Siyavuşan)**: ناڤێ ئاوازەکا موزیکا کەڤنا ئیرانی یە.

**باغ شەهریار(Baxê Şehriyar)**: ناڤێ ئاوازەکا موزیکا کەڤنا ئیرانی یە.

**باغ شیرین(Baxê Şîrîn)**: ناڤێ

ئاوازەکا موزیکا کەڤنا ئیرانی یە.

**باغوش(Baxûş)**: گـەڤـزین ـ نقۆبوون د ئاڤێ دا.

**بافتن(Baften)**: راچـانـدن، ڤەهاندن.

**بافدم(Bafdum)**: سەرەنجام.

**باک(Bak)**: ترس.

**بال(Bal)**: زەندکێ مـرۆڤی، ژ ملی تا سەرێ تبلا ـ چەنگ(ئەندامێ کو فرندە پێ دفرن).

**بالا(Bala)**: سلال، بلند ـ بەژن.

**بالاخره(Bêlexerê)**: پەیڤـەکـا شـاشـە کـو د فـارسی دا کـەفـتـیـە کـاری، بەلێ هەرچەوا بت ئانکوێن (سەرەنجام، وەلحاصل) ددەت.

**بالش(Balêş)**: بالیفک، پالگەهـ.

**بالو(Balû)**: بەهلویلک، بالویل.

**بالوایه(Balvayê)**: حاجی رەشک.

**باله(Balê)**: ئەو پەرێن کـو مـاسی پێ مەلەڤانی یا دکەت ـ زاراوەکێ مـەحـەلی یێ باژێرێ سـمنانێ یە، ئانکو بێر، مەربێل.

**بالین(Balîn)**: نڤـینـێ نڤـسـتـنێ، بالیـفک، ئەو جـهـێ کـو ل دەمێ نڤستنێ پالا خوە ددەنێ(ئەو جهە ژ نڤـینـکێ یێ کـو ژ سـەری تا سینگی دکەڤیتە سەر).

**بام(bam)**: بانێ خـانی ـ سـپـێـدە زوی ـ د زاراوێ مـوزیـکـێ دا دەنگێ ستویرە(بم).

**بامداد(Bamdad)**: سپێدە زوی.

**بامره(Bamreh)**: رێکا کـو دچیـتـە سەربانی(دەرەجک، پێسترک).

**بامزه(Bamezzê)**: تام خوەش.

**بامس(Bames)**: پابەند، گرفتار.

**بام غلتان(Bam xeltan)**: باگـوردان(یێ کـو سـەربانی پێ دگێرن).

**بامه(Bame-ê)**: ریهـێن درێژ. یان ژی مرۆڤێ ریهـ درێژ.

**بان(Ban)**: ئـێـک ژ پـاشـگـرێـن خـاوەنداری و پارێزڤـانیێ یە و ئانکویا (پارێزەر، خـودانکەر) ددەت، وەکی: (باغـبـان = کـەسێ کـو سـەرەگـوهیـا باغی دکـەت، دروازەبان = گـزۆلچی، دژبان = کـەسێ کـو زێرەڤـانیێ ل کـەلهێ دگریت) ـ بانێ خانی ـ کورتکریا (بانگ = ئاواز ـ هەوار).

**بانگ(Bang)**: ئـاواز ـ هـەوار ـ (بانگێ نڤـێـژێ ژی هەر ژ ڤێ پەیڤێ هاتیە).

**بانو(Banû)**: پەیڤا رێزگـرتنێ بۆ ناڤێ ژنکێ: خاتوین، خانم.

**بـــانـــە(Bane-ê)**: رێـــڤ، شـەرمگەه(جـهێ کـو رێڤ لێ دهێن).

**باور(Baver)**: باوەری، بروا.

**باهار(Bahar)**: ترارک یان ئامـانێ کو زاد تێدا بیت ـ جۆرەکێ مقام بێژیێ یە.

**باهت(Bahet)**: بەرەکێ سپی یە کو د کەڤن دا وەسا هزر دکرن کو هەر کەسێ کو لێ بنێریت، بێ حەمد دێ کەتە کەنی، (حجر الضحک) ژی دبێژنێ.

**باهک(Bahek)**: ئازار و ئەشکەنجە ـ بیبیکا چاڤی.

**باهم(Ba hem)**: ب هەڤـــــرە، ئێککگرتی.

**بایا(Baya)**: پێـدڤی، پێـویست، (بـایـسـت، و دربـایـسـت) ژی لکارن.

**باید(Bayed)**: ئیلەه، دڤێت(ئیلەه بچیت، دڤێت بچیت).

**بـــایـــگـــان(Baygan)**: ئارشـیـڤـیـست(کەسێ کـو بکارێ ئاریشڤکرنێ رادبیت)ـ ئارشیڤ.

**ببر(Bebr)**: پلنگێ خیچخیچی.

**ببر بیان(Bebrê beyan)**: لدویڤ گـوتنا شەهنامێ(کتابا فـردوسی) ئەو جلکە یێ کـو روستـەمی دکـرە بەر خـوە دەمێ دچوو شـەرِا کـو ژ کەڤلێ پلنگی هاتبوو چێکرن.

**بت(But)**: بـوت، پەیکەرێ مـرۆڤی یان گـیـانەوەری کـو ژ بەری یان داری یان ئاسنی بهـێـتە چێکرن و بێتە پەراستن.

**بتـــاوار(Betavar)**: دوپاهیک، سەرەنجام.

**بتـاییدن(Bêtayîden)**: رەهاکرن، ئازادهێلان.

**بتفوز(Betfûz)**: دورماندوری دەڤێ گـیـانەوەری، هەروەسـا (بتـپـوز، برپوز، برفـوز، پتـفـوز، بتـفـور، بنفوز، بتغور و پوز)ژی لکارن.

**بتگر(Butger)**: پەیکەرساز.

**بتیا(Betya)**: سینگ.

**بـتـــیـــــار(Betyar)**: رێـنج، خوەوەستاندن.

**بج(Buc)**: هوندرێ دەڤی ـ بزن.

**بجا(Bêca)**: د جهێ خوەدا.

**بجز(Bêcuz)**: ژ بلی.

**بجکم(Beckem)**: خـانیێ هاڤـینی

کو ژ هەرچەند رەخاڤە دەر و پەنجەر لێ هەبن.

**بچم(Bêçem):** لێکدای.

**بچە(Beçê):** زاروک، مندال.

**بچەخوار(Beçêxwar):** گیانەوەرێ کو بچویکێ خوە بخۆت.

**بچەزا(Beçêza):** هەر گیانەوەرەکێ کو بزێت(مەبەست ژێ نە هێککەر بت).

**بخاری(Buxarî):** سۆپە ـ خەلکێ باژێرێ بوخارا.

**بختک(Bextek):** کابووس، هەروەسا پەیڤێن: (خفتک، خفتو، برفنجک، درفنجک، فرنجک، فدرنجک، برغفج، برخفج، خفج، فرهانج، کرنجو و سکاچە) ژی لکارن.

**بختو(Buxtû):** برویسی ـ هەر تشتێ کو نرێنا وەکی یا عەورا ژێ بهێت.

**بختور(Bextver):** خودان بەخت، خوەش شانس، بەختیار، بەختەوەر.

**بختە(Bexte-ê):** قەلەو، ب خوەڤە ـ ربیتەکری ـ هەر تشتێ کو پویستێ وی، یان قەلپیشکێ وی ژێڤەکربیت، وەکی: (نوک، کونجی، نیسک، ماش، بزن، بەرخک و......هتد).

**بخسان(Bexsan):** شاراندی(بۆ ئاسنی) ـ چرمسی.

**بخش(Bexş):** باهر(حصة) ـ پشکەکا بچویک ژ باژێری.

**بخشدار(Bexşdar):** رێڤەبەرێ ناوچێ، دەڤەردار(مدیر ناحیة).

**بخشنامە(Bexşnamê):** بژاندن(تعمیم).

**بخشودن(Bexşûden):** لێبورین، عەفووکرن، هەروەسا پەیڤێن: (بخشایش، بخشش، بخشاینده، بخشوده، بخشایشگر، ببخشای، بخشنده) ژ ڤی ژێدەری نە.

**بخون(Bexûn):** ستێرا مەریخ.

**بخیە(Bexyê):** قەیدک، قولپک(درووینا جهەکێ بری ژ لەشی یان ژی هەر تشتەکێ دی).

**بد(Bed):** پاشگرە و ئانکوا (سەروەر و خودان)ی دگەهینت، وەکی: (سپهبد = سەروکێ سوپای، موبد = سەروکێ مغان«حەکیم و زانا و پێشەوایێ روحانی یێ زەردەشتی یا» ـ

خـراب، كـريت، كـو پتـر دگـەل پەيڤـەكا دى(ل پێشيـا پەيڤـەكا دى)دهێت، وەكى: (بدبو = بێـهن نەخـوەش: گـەنى؛ بدبين = يێ كـو ب چاڤێ گومان و بێ هيڤياتيێ ل پاشـەروژێ دنێـرت: رەشـبين؛ بدچشم = يێ كو ب چاڤەكێ كرێت ب نێريتە نامـويسا خەلكى: چاڤ حيز).

**بداختـر(Bedexter)**: بێ بەخت، بەخت برەش.

**بدست(Bêdest)**: بهوست.

**بدهكار(Bêdêhkar)**: دەيـنـدار، قەردار.

**بر(Ber)**: پێـشگرە و ئانكوا (ل سـەر، سـلال) ددەت، وەكى(برافـراشتن = هلدان«وەكى: هلدانا ئالاى»، برآمـدن = بلندبوون«وەكى: بلندبوون يان دياربوونا حەملێ ژنكا ب تشت»، بر روى = ل سەر«وەكى: تشتەكێ ل سەر مێزێ»)ـ بار(فێقيێ دارێ) ـ كورتكريا(برگ = بەلگێ دارێ)ـ هەمبێز، باغەڵ.

**برابر(Beraber)**: بەرامـبـەر ـ هەڤكێش ـ روى ب روى ـ تەمەت هەڤ.

**برادر(Berader)**: برا.

**برادر اندر(Berader ender)**: براماک ـ هەروەسا بو وان برايێن كو بابێ وان ئێک بت لێ دەيكێن وان ئێک نەبن ژى هەر ئەڤە پەيڤە دئێتە بكارئينان.

**برادرانه(Beraderanê)**: برايانە.

**براز(Beraz)**: سپێنە.

**برازنده(Berazendê)**: ژ هـەژى، بسەرڤە، لايق.

**برافتاد(Beruftad)**: ژ بن چوو، نەما.

**براى(Berayê)**: ژ بۆ، ژ بەر.

**برباد(Berbad)**: خـراب، وێران، كاڤل.

**بربست(Berbest)**: دەسـتـوور، رێسا(قاعدە)، شێواز.

**بربستن(Berbesten)**: گـرێدان، پابەندكرن ـ ئامادەكرن ـ سوود ژێ هەلگرتن.

**بربسته(Berbestê)**: بەسـتى(منجـمـد) ـ بێ گيان(جماد).

**بربند(Berbend)**: ئێـلـەک، زەخـمـە(يێ كـو ژنک دادنـە سـەر

مەمكێن خوە).

**برپا(Berpa)**: سەرپێ راوەستیان ـ پێ رابوون.

**برتر(Berter)**: بلندتر.

**برتن(Berten)**: یێ كو خوە مەزن بكەت و زێدە د خوە بگەهت(متكبر).

**برتنگ(Berteng)**: تەنگا دەوارا ـ دەسبلینكێن كو بچویكا د لاندكێ دا پێ گرێددەن.

**برجستن(Bercesten)**: خوەهاڤێتن(ج ژ جهەكێ بلند بۆ خوارێ یان ژ خوارێ بۆ سلال یان وەكی رێڤەچوونا كێچا).

**برجسته(Bercestê)**: بلندبووی، دیارە(وەكی زكێ ژنكا ب تشت) ـ هەروەسا بۆ مرۆڤێ ناڤدار و مەزن ژی لكارە.

**برخ(Berx)**: باهر، پشك، بەش.

**برخاستن(Berxasten)**: رابوونەسەرخوە، ژ جه رابوون، ژ پێڤە راوەستیان.

**برخج(Berexç)**: كرێت، پیس.

**برخور(Berxor)**: شریك(شریكێ مرۆڤی د باهرا مرۆڤی دا).

**برخورد(Berxord)**: ڤێككەتن(وەكی لێكدانا دو ترومبێلا) ـ هەڤدو دیتن.

**برخوردار(Berxordar)**: خودان بەهرە.

**برخی(Berxî)**: پچەك، هندەك، پشكەك ـ قوربانی، خوە گۆری كەر.

**برخیزانیدن(Berxîzanîden)**: كەسەك ژ جه راكرن.

**برد(Burd)**: بر(كارێ برنێ بۆ كەسێ یێ بەرزە) ـ سوودمەند(ئەوێ د قومارێ دا فایدە بووی)ـ ئەو مەسافا كو گولله دپیڤت هەر دەمێ ژ تۆپێ یان تڤەنگێ دەردكەڤیت و هەتا دكەڤیتە ئەردی.

**بردابرد(Burdaburd)**: دەنگۆدۆر و هەنگامە.

**بردادن(Berdaden)**: فێقی دان ـ بەر دان(مەبەست ژێ هەم بەرێ داروباری یە و هەم ژی بەردانا ب واتایا ئازاكرن و تەرك كرنە).

**برداشتن(Berdaşten)**: راكرن(تشتەك ژ ئەردی راكرن) ـ هلگرتن(بۆ نموونە: هلگرتنا دەخل و دانی بۆ زڤستانێ).

**بردبار(Burdbar)**: بێنفرەھ، سابر.

**بردک(Burdek)**: تشتک، مامک ـ چیڤانۆک.

**بردن(Burden)**: ڤەگوھاستن، برن(تشتەک ژ جھەکی بۆ جھەکێ دی برن) ـ برن(فایدە بوون د قوماریێ دا).

**بردنگ(Berdeng)**: گرک، کومت.

**بردە(Berdê-êh)**: تیپا(h) لدەمێ ئاخفتنێ باش نادەرکەڤت: خولام، خدام، بەنی.

**بررسی(Berrêsî)**: ژ (بررسیدن) یا ھاتیە وەرگرتن، ئانکو: لدویڤچوون.

**بر رفتن(Ber reften)**: چوونەسلال، بەرەڤ بەرزیێ چوون، ژێھەل چوون.

**برز(Burz)**: بەژن و بال ـ بلندی ـ گر، چیا ـ مەزناھی ـ جوانی.

**برز(Berz)**: کار ـ جوتیاری؛ (برزگر: جوتیار).

**برزدن(Burzeden)**: د یاریا قومارێدا ئانکو تێکڤەدان(یا وەرەڤێن کۆمکانێ یان دۆمینێ).

**برزم(Berzem)**: ناز، نازداری.

**برزن(Berzen)**: تەنویر ـ سۆپە ـ سێھلا کو ژ تەڤنا جێرکا ھاتبیتە چێکرن و نانی لسەر بپێژن ـ کۆلان(زقاق)ـ تاخ(محلە).

**برزە گاو(Berzê gav)**: گایێ جۆتی.

**برزین(Berzîn)**: ناڤێ پەرستگەھەکێ بوو ل خوراسانێ، (آذربرزین، آتش برزین و آذربرزین مهر)ژی لکارن.

**برس(Bers)**: ئەو دارێ کو دکەنە د دفنا حێشترێ را و دەست ھەفساری ب وی دارکی ڤەدکەن.

**برساد(Bersad)**: ئێک ژ دعایێن زەردەشتیان کو بۆ بدویماھیک ئینانا نڤێژێ تێتە گۆتن.

**برسان(Bursan)**: ئەژدەھا، مارێ مەزن.

**برسان(Bersan)**: دۆشاڤا رەش.

**برش(Burêş)**: برین ـ کۆپن(کارتێن کو بەرامبەری وان ئەرزاقێ حکومی پێ دھێتە وەرگرتن).

**برشتن(Bêrêşten)**: براشتن.

**برشمردن(Berşêmurden)**: دوبارە ھژمارتن.

**برغمان(Berxeman)**: ئەژدەھا، مارێ مەزن.

**برغندان(Berxendan)**: جەژن و خوەشی بێن کو ل رۆژێن دویماهییێ ژ هەیڤا «شعبان» دکەن، و ئەو مەیا کو ل وێ رۆژێ ڤەدخۆن ژ بەر کو ژ وێ رۆژێ و پاشتر تا ئێکی هەیڤا «شوال» دڤێت خوە ژ مەیڤەخوارنێ بدەنە پاش ـ هەروەسا بۆ جەژنا دویماهیا رۆژی گرتنێ ژی دئێتە گوتن.

**برغو(Burxû)**: زڕنا، بۆق.

**برغول(Berxûl)**: ساڤار، دانقوت.

**برف(Berf)**: بەفر.

**برفر(Berfer)**: قەدر و قیمەت.

**برفنج(Berfenc)**: دژوار ـ رێکێن ئاسێ و دژوار(ئاستەنگ).

**برکشیدن(Berkêşîden)**: کێشان بۆ سلال ـ ئینانەدەر ـ فێرکرن.

**برگ(Berg)**: پەڕ(ورق) ـ بەلگێت داروباری ـ ساز و ئاواز ـ سامان.

**برگردیدن(Bergerdîden)**: زڤرینەڤە ـ لدویڤ هاتن ـ لێ قولپین(وەکی ئێکێ خیانەتێ ل هەڤالەکێ خوە دکەت، دبێژنێ فلان کەس ل فلانی قولپی).

**برگریزان(Bergrîzan)**: وەرزێ پاییزێ، دەمێ کو بەلگێن دارا دوەریێن.

**برگزیدن(Berguzîden)**: هەلبژارتن ـ پەسەندکرن.

**برگستوان(Bergustvan)**: زری و کومزری.

**برگشت(Bergeşt)**: زڤرینەڤە.

**برگماردن(Bergumarden)**: دامەزراندن.

**برگه(Berge-ê)**: بەلگ ـ وەکی بەلگی ـ قەیسی ـ فیش.

**برم(Berm)**: هش و بیر ـ کانی، کەهنی ـ چالا کو ئاڤ تێدا خڕڤە دبت.

**برم(Berem)**: چارچووڤە یان سیخمێن کو دهێنە چێکرن دا شاکێن دارمێوێ یان کولندا و......هتد باڤێژنە سەر.

**برمخیدن(Bermexîden)**: سەرسەری و نەگوهدار.

**برمر(Bermer)**: هیڤیداری ـ چاڤەرێیاتی ـ مێشا هنگڤینی.

**برملا(Bermela)**: ئاشکەرا، فاش.

**برمنش(Bermenêş)**: حەژخوەکەر ـ خوەپەرێس.

**برنا(Burna)**: خۆرت، لاو، تۆلاز ـ

گەنج، جحێل.

**برناس(Bernas):** های ژخـوە نە ـ نەزان ـ خەوتە.

**برنامە(Bernamê):** بەرنامە.

**برنج(Bêrênc):** مـەعدەنێ پرنجـوک کـو بو چێکرنا سـەمـاوەر و سـێنیکێت ترازی یا و... بکار دهێت ـ برنجێ خوارنێ.

**برنجـار(Bêrêncar):** زەڤـیـێت برنجی(جهێ کو برنجی لێ دکەن).

**برنجن(Berencen):** حـجـول و بازنک.

**برندک(Berendek):** گر، چیا.

**برنشـاندن(Bernêşanden):** سوار کرن ـ دانان(وەکی کەسەکی دادننە سەر کورسیکا دەستهەلاتداریێ).

**بروت(Burût):** سـمـبێل(مـویێ کـو لهنداف لێـڤـا سـەری یا زەلامی دهێن).

**بـروشـک(Burûşek):** ئـاخ، تـوز و غوبار، توز و عەجاج.

**برومـنـد(Berûmend):** باردار، ب بەر ـ کورتکریا پەیڤا «آبرومند»ە، ئانکو: ب هەتک(هەتکدار).

**برون(Bêrûn):** کورتکریا «بیرون»: ژ دەرڤە، هەندەران.

**برە(Berrê):** بەرخکا میهێ، خفشا خەزالێ.

**برهنە(Burehnê):** رویس، تازی؛ هەروەسا (لخت، ورت، تهک، لاج و غوشت) ژی لکارن.

**برهوت(Berehût):** ناڤێ نهـالەکێ و ناڤێ بیـرەکـا گـەلەک کـویرە ل «حـضـرمـوت» کـو دبێـژن (ارواح خـبـیـثـە) لێ د ئاکنجی نە، و چ جهێ گەرم و نەخوەش و بێ ئاڤ و گیا بت، ڤی ناڤی بۆ بکار دئینن.

**برهود(Berhûd):** نیڤ سۆتی.

**بریان(Bêryan):** براشتی(بۆ کەباب و تککا و......هتد).

**بریدن(Burîden):** برین، لەت لەت کرن.

**بریدە گـیس(Burîdê gîs):** کـەزی بری(د کـەڤـن دا ئـەڤ گـوتنە خـەبەر«جنێـو» بـوو کـو دگـوتنە ژنکا).

**بریزن(Bêrîzen):** بێژینک.

**بریغ(Bêrîx):** ئویشیێ تری.

**برین(Berîn):** یێ سـلال، سـلال تر، بلندتر، وەکی: (بهـشـت برین = بەهشـتا سلال). بۆ زانین پەیڤەک وەکی ڤێ پەیڤێ مـە یا د زمـانێ

کوردی دا ژی هەی لێ ئانکوا وێ نە وەکی یا فارسی یە، ئەو ژی: (بەرین = بەرفرەھ)ە، ھەروەکی دبێژن: (بەھشتا بەرین = بەھشتا بەرفرەھ).

**بز(Bez):** کورتکریا پەیڤا «بزم»، ئانکو: جەژن و میڤانی، جڤاتا کەیف و خوەشیێ ـ ئۆل و رێ و رەسم ـ گر، کومت.

**بز(Buz):** بزن.

**بزداغ(Bêzdax):** ئالاڤەکە کو ژەنگارا خەنجەر و شیرا و تشتێن وەکی وان پێ پاقژ دکەن.

**بزدل(Buzdêl):** درکەیە بۆ کەسێ ترسنۆک.

**بزرگ(Buzurg):** مەزن(چ قەبەیی یا تشتەکی بت، یان شیان و رێزگرتنا کەسەکی بت، وەک: «بەرێ مەزن، بابێ مەزن(باپیر)، مەزنێ ئویجاخێ و...).

**بزرگوار(Buzurgvar):** کەسێ مەزن و ھەژی رێزلێگرتنێ.

**بزغ(Bezex):** بەق؛ ھەروەسا(وزغ، غوک، غورباغە) ژی لکارن.

**بزغاله(Buzxalê):** کارکێ بزنێ.

**بزغسمه(Bezexseme-ê):** کەڤز(کو ل بەر لێڤا ئاڤێن نەلڤ دا دیار دبت و بەق ھێلینکا خوە دناڤرا چێدکەت).

**بزغه(Bezxe-ê):** کەپرا دارمێوێ.

**بزک(Bezek):** جوانکرنا سەر و روی یا.

**بزم(Bezm):** جەژن و میڤانی و کەیف و خوەشی و مەی ڤەخوارن.

**بزماورد(Bezmaverd):** بالۆلکا ھێکا کەلاندی(ساندەویچا ھێکا کەلاندی).

**بزنگاه(Bêzengah):** ئەو جھێ کو دز و رێگر رێڤنگا د شەلینن ـ درکەیە ژ وێ ھوزانێ یان پەخشانێ کو ھۆزانڤان یان نڤیسەر مەرەما خوە تێدا ئاشکەرا بکەت.

**بزه(Beze):** گونەھ.

**بزەکار(Bezehkar):** گونەھکار.

**بزیدن(Bezîden):** لڤلڤینا بای.

**بژ(Bej):** پەتیلێت بەفرێ.

**بس(Bes):** زێدە، گەلەک ـ بەس، تمام(کافی)، ئەڤە و(بسا، بسیار، ای بس، چە بسیار) ھەمی ژ ریشالێ خوە یێ پەھلەڤی (Vas) ھاتینە وەرگرتن.

**بساردن(Besarden):** کێلانا

زەڤیێ، قلێبکرنا زەڤیێ.

**بساک(Besak)**: ئەفسەر ـ تانجا کو ژ گولا دهێتە چێکرن و د جەژن و بەریکانا دا دکەنە سەرێ کەسەکی.

**بسان(Bêsan)**: وەکی.

**بساوایی(Bêsavayî)**: ئێک ژ هەستێن پێنجینەیێن مرۆڤی کو مرۆڤ ب ڤی هەستی، هەست ب گەرمی و ساری و نەرمی و زڤری یێ دکەت و ئالاڤێ وی پویستێ لەشی یە؛ ب عەرەبی دبێژنێ(حاسة اللمس).

**بسباس(Besbas)**: ئاخفتنا بێ مەعنە.

**بست(Best)**: گرت(وەکی: دەرگەھ گرت) ـ سکر ـ گرێ ـ جهەکێ کو کەسەک ژ ترسا دا بچیتێ دا کەس وی نەگریت، وەکی جهێن پیروز یان خانیێن مەزن و ئاغەواتا ـ پچەکا ترياکێ کو تێرا جارەکا کێشانێ بکەت.

**بست(Bust)**: بیستان، باغ، گولستان ـ ناڤێ باژێرەکێ کەڤنارە ل پارێزگەها خوراسانێ کو نوکە د ناڤ ئاخا «ئەڤغانستان»ێ دایە.

**بستار(Bêstar)**: نە بنەجە، نە موکوم، لەقلەقۆک.

**بستر(Bêster)**: دوشەک، نڤینک، جهێ نڤستنێ.

**بستری(Bêsterî)**: کەسێ کو ل خەستەخانێ نڤاندی.

**بستن(Besten)**: راپێچان(وەکی خەلاتەکی د ناڤ کاغەزەکی را بپێچن)ـ گرتن(قفل کرن)ـ بەستین(وەکی ئاڤ دبیتە جەمەد«بەستی»).

**بستنی(Bestenî)**: هەر تشتێ کو ببیتە بەستی(نهو پتر بۆ دوندرمێ بکار دئێت).

**بستو(Bestû)**: گوزک، جەرک.

**بسد(Bussed)**: مەرجان.

**بسراق(Busraq)**: یاقوتیا زەر.

**بسغدیدن(Besexdîden)**: بەرهەڤ بوون، ئامادەبوون.

**بسکلە(Beskelê)**: دارێ کو دادنن پشت دەری دا دەر نەڤەبیت.

**بسیار(Bêsyar)**: گەلەک، زێدە، مشە، پر.

**بسیج(Besîc)**: سامان ـ ساز و بەرگێن شەری ـ بەرهەڤبوونا قووەتا لەشکەری.

**بش(Buş)**: موێ ستوێ هەسپی،

(یال) ژی لکاره.
**بشتک(Buştek)**: گوزک، جەرک.
**بشک(Beşk)**: خوناڤ ـ خوبسار.
**بشک(Buşk)**: بسک.
**بشک(Bêşk)**: ناز و نازداری.
**بشکاری(Bêşkarî)**: جوتیاری.
**بشکلیدن(Bêşkelîden)**: سەلخاندن ـ کەلاشتن ـ کونکرن.
**بشکن(Bêşken)**: تل لێکدان لدەمێ سەماکرنێ و ئاوازگوتنێ.
**بشکول(Bêşkûl)**: چالاک ـ مالێ کارکرنێ ـ زەحمەتکێش.
**بشل(Beşel)**: پێکڤە نویسیای.
**بشم(Beşem)**: مەلویل ـ خەمگین.
**بشمە(Beşme)**: کەڤلێ گیانەوەرا.
**بشن(Beşen)**: بەژن و بال ـ سینگ و بەر.
**بشور(Buşûr)**: نفرین، دعایێن خراب، لەعنەت.
**بشیز(Beşîz)**: ئامانێ ئاڤێ کو ژ چەرمی هاتبیتە چێکرن(راوی).
**بغ(Bex)**: خودا، یەزدان.
**بغا(Bexa)**: پویچە مرۆڤ.
**بغاز(Bêxaz)**: سپێنە.
**بغپور(Bexpûr)**: بغ = خودا و پور = کور(پسر): کورێ خودێ(ئەڤ پەیڤە نازناڤەک بوو کو د کەڤن دا دگوتنە شاهێن چینێ؛ هەروەسا (فغفور)ژی لکارە.
**بغرنج(Buxrenc)**: ئاریشە ـ ئالوز ـ دژوار.
**بغستان(Bexêstan)**: بوتخانە، جهێ کو پەیکەر لێ دهاتنە پەراستن.
**بغل(Bexel)**: باغەڵ، هەمبێز ـ رەخ، بەرکێلەک.
**بغند(Bexend)**: چەرم، پویستێ گیانەوەرا.
**بفج(Befc)**: تفا دەڤی.
**بفخم(Befxem)**: گەلەک، زێدە.
**بفنج(Befenc)**: مارێ بێ ژەهر، مارێ کو زیانێ نەگەهینتە چو کەسەکی.
**بکتر(Bekter)**: زری و کومزری کو جلکێن شەرینە و ژ ئاسن و پویلای دهاتنە چێکرن.
**بکسە(Bukse-ê)**: پرتا گوشتی.
**بکنک(Beknek)**: گیانەوەرێ کوری بری.
**بکونک(Bekûnek)**: شیرێ کو ژ داری هاتبیتە چێکرن.
**بگاه(Bêgah)**: ل دەم، زوی،

سپێدە زوی.

**بگماز(Bêgmaz)**: مەی ـ جاما مەیێ.

**بگنی(Begnêy-nî)**: جۆرەکێ مەیێ یە کو ژ برنجی یان جەهی دهێتە دروستکرن.

**بل(Bul)**: پێشگرە و ئانکویا پر، گەلەک، ددەت، وەکی: (بلعجب = گەلەک سەیر) ـ سنج(دارا وێ وەکی دارا تەڤزێنەیە لێ تشتەک پێڤە دهێت کو بەرک و قەلپێ وێ وەکی یێ قەسپێ یە و تنێ تشتێ کو ژ سنجێ دهێتە خوارن ئارکە).

**بل(Bêl)**: کورتکریا پەیڤا (بهل Bêhêl:کارێ فرمانە ژ هلیدن = هێلان): بهێلە، لێ گەرێ، ژێڤەبە ـ پەحنیا پێی.

**بلادر(Belader-dur)**: زێر و تشتێن جوان کو ب ژنکا یان بویکا ڤەدکەن.

**بلادە(Belade-ê)**: خرابکار ـ فاسق.

**بلارج(Belarec)**: لەگلەگە.

**بلال(Belal)**: گەنم شام، گەنمۆک.

**بلبلی(Bulbulî)**: مەی، جاما مەیێ.

**بلح(Beleh)**: خورما نەگەهشتی.

**بلد(Beled)**: رێبەر ـ رێ نیشاندەر ـ کارەک زانین یان رێیەک نیاسین ـ هەر ب ئانکویا خوە یا عەرەبی کو «باژێر»ە د فارسی ژی دا لکارە.

**بلسک(Belesk)**: حاجی رەشک.

**بلسک(Bulusk-ş)**: سیخێن کەبابا.

**بلغاک(Bulxak)**: فتنە ـ شورەش ـ تێکهاتن و تێکچوون.

**بلغندر(Bulxender)**: سەربەردای، بێ هەفسار ـ بێ دین.

**بلغندە(Bulxundê)**: سەرێک خرڤەبووی ـ مێدەک ـ رەخەکێ باری.

**بلغور(Belxûr)**: ساڤار، دانقوت، شوربا ساڤارێ.

**بلغونە(Bulxûnê)**: سۆراڤا ژنک ل روییێ خوە ددن.

**بلفرخج(Bulferexc)**: پیس، کرێت، نەباش.

**بلک(Bêlk)**: گوریا ئاگری.

**بلک(Buluk)**: چاڤ گر.

**بلکفد(Bulkefd)**: بەرتیل.

**بلکک(Bêlkek)**: ئاڤــا تێــهن شیر(نیڤ گەرم).

**بلکنجک(Bulkencek)**: سـەیر، عنتیکە، هەر تشتێ کو سەیر بت و کەنیا مرۆڤی پێ بهێت.

**بلم(Belem)**: بـەلەم، قـــایکا بچویک.

**بلند(Bulend)**: بلند ، درێژ، بەرز.

**بلندین(Bulendîn)**: مــەلبــەنێ دەرگەهی ـ سەرەدەرا دەرگەهی.

**بلوچ(Bulûç)**: کـومـرکـا دیکلی ـ ناڤێ نەتەوەکێ یە ل ئیـرانێ کـو ل بلوچستانێ د ئاکنجی نە.

**بلوک(Bulûk)**: ناوچەکـا کـو چەند گـوند بسـەرڤـە بن ـ ئامـانێ مـەی ڤـەخـوارنێ ـ هەروەسـا پـەیڤـەکـا فرەنسی یە لێ د زمـانێ فـارسی دا گەلەک لکارە و ئـانکویا(دەستە = سـەفــتــە«وەکی پـارێ بلـوک» و کــۆمــەل، تـاگــیـــر«وەکی بلوکێ رۆژهەلاتی کو کومونیستن وبلوکێ رۆژئـاڤـــایی بـۆ وان وەلاتێـن نە کومونیست دهێتە گوتن»).

**بن(Bun)**: شـەنگسـتـە، بنیـات، ئاسـاس ـ بن(وەکی: بنێ گـوهی، بنێ دارێ)ـ هەگـەر لدویڤ ناڤێ فـێـڤـی را بهـێت ئانکوا دارا وی فێقی ددەت یێ کو لدویڤرا هاتی، وەکی: (خرما بن = دارا خورمێ).

**بناخـــواست(Bênaxast)**: بێی دلی(هەگەر مرۆڤ بێی دلێ خوە ب کارەکی رابیت).

**بناغ(Benax)**: کنف، وەریس، داڤا ئـارمــویشـی ـ هەوی(دو ژنا گــەر شـوی ب مـێرەکی کرن هەردو دبنە هەوییێن هەڤدو).

**بنام(Bênam)**: ناڤدار ـ هەڤناڤ.

**بناور(Bunaver)**: هەر تشتەکێ ب ریهـ و ریشـــال ـ کـوبر ـ قـونێــرا مەزن.

**بنجک(Buncek)**: گلولکا پەنبی.

**بنجل(Buncul)**: تشــتێ ب کـێـر نەهاتی کو بکرِ بۆ نەبن.

**بند(Bend)**: گــەه(جــهێ پێکڤــە نویسیانا دو هەستیا د لەشی دا) ـ پشکەک ژ پەرتوکێ یان یاسـایێ ـ وەریس یان زنجیــرا کـو گـیـانەوەرا پـێ گـــــــرێددەن ــ سـکـر ــ دبێژنە(٤٨٠ـ٥٠٠)پەرا:(یک بند = بەندەک) ـ د یاریا خوەلێکدانێ دا هونەرێت ل ئەردی خستنێ نە.

**بندار(Bundar)**: مـالدار، زەنگین،

خودان باغ و بیستان.

**بند انداز(Bend endaz)**: ژنکا کو سەر و رویێ ژنکا حەفاف بکەت.

**بند تنبانی(Bendê tenbanî)**: هوزانا بێ مەعنە و بێ کێش و سەروا.

**بند شهریار(Bendê Şehryar)**: ناڤێ ئاوازەکا کەڤنا ئیرانی یە.

**بنده(Bendê)**: خولام، بەنی.

**بندەوار(Bendêvar)**: وەکی بەنی یا، وەکی عەبدا.

**بندیه(Bendîmê)**: مەهیک، قومچە، قولپک.

**بنساله(Bunsalê)**: دانسال، دانعەمر، ئێختیار، پیر.

**بنک(Bunek)**: شویندەوس، شوینپێ.

**بنکران(Bunkeran)**: بنێ قازانێ، ڤەرەنیکا بنێ قازانێ.

**بنگان(Bêngan)**: فنجان، پەیالە.

**بنگاه(Bungah)**: جهێ کرین و فرۆتنێ ـ خانی.

**بنگره(Bengere)**: ئەلاک(ئاوازێن کو دەیک بۆ زاروکێ خوە دبێژت تا کو زارۆکێ خوە بنڤینت).

**بنگش(Bunguş)**: داعویران.

**بنلاد(Bunlad)**: ئاساس، بنیات، شەنگستە.

**بنو(Bunû)**: بێدەر، بێدەرا گەنمی یان جەهی.

**بنوان(Bunvan)**: زێرەڤانێ بێدەرێ، زێرەڤانێ زەڤیا چاندی.

**بنه(Bune)**: جھ ـ خانی و دوکان ـ جل و بەرگ ـ بار و پێدڤیاتیێن سەفەرێ ـ ریھ و ریشال ـ بنیات.

**بنیاد(Bunyad)**: بنیات، شەنگستە.

**بو(Bû)**: بێھن ـ کورتکریا (بود Buved = ببت، وەسا بت).

**بواشه(Bevaşe-ê)**: ملھێب.

**بوب(Bûb)**: مەھفویر، بەرک یان ھەر تشتەکێ کو بێتە رائێخستن.

**بوبرد(Bûburd)**: بلبل.

**بوبک(Bûbek)**: ھوپ ھوپک(ھدھد).

**بوته(Bûtê)**: تراش ـ جۆرەکێ نەخشی یە لسەر پەرۆک و جلکا دھێتە چێکرن ـ کەزی و بسک ـ ئامانەکێ بچویکە کو زێر و زیڤی تێدا دحەلینن.

**بوتیمار(Bûtîmar)**: بالندەکێ

مـاسی خۆره کو نکلێ وی درێژه و کــوریکا وی کــورته و پەڕێن وی سپی و کەسک و شینن، پتر ل بەر لێـڤا رویبـارا نێـچیـرا مـاسی یا دکـەت.. دبێـژن ئەڤ فـرنده چەندا تێـهنی بیت ئاڤێ ناڤەخوّت تا کو مەجبور دبت و دبێژن ئەڤ فرنده ل جـەم خــوه وەسـا هزر دکـەت کـو هەگـەر ئاڤ ڤـەخوار دێ ئاڤ کـێم بیت، ژ بـەر هنـدێ ژی نـاڤێ ڤـی باڵـندەی بۆ دڕکـــه دادنـنه ســەر کەسێن قەلس(بخیل).

**بوجار(Bûcar):** کەسێ کو کارێ وی پاقـژکرنا گـەنم و جـەهـ و نیـسک و...... بت.

**بودن(Bûden):** بوون.

**بـور(Bûr):** ڕەنـگـێ زێـری، زەر یـان سۆرێ ڤەبی، هەسپێ سۆر ـ بۆ وی کـەسی دهێــتــه گـوتن یێ کـو ب کــارەکی رابـبـیت و د دەرهەق وی کاری دەرنەکەڤیت و لداویێ شـەرم بکەت ژ کردارا خوه.

**بوران(Bûran):** سـڕا دژوار و زریان پێکڤه.

**بوز(Bûz):** هەسـپـێ کـو بلەز بکەتە غار ـ بۆ مرۆڤێ زیرەک ژی دهێت.

**بوزینه(Bûzînê):** مـەیموینـک(ئەوا بچـویک و کـوری درێژ و رانکێت وێ بێ موی).

**بوژنه(Bûjenê):** کولیلک، بشکوژ.

**بوشـاسپ(Bûşasp):** خـەو، خـەونا خوەش.

**بوف(Bûf):** بوم، کوند.

**بوقلمــون(Bûqlemûn):** پەڕۆکێ ڕەنگین ـ عەلۆک.

**بوک(Bûk):** خـــــوەزی، بـەلـکـی، چێدبت.

**بوگــان(Bûgan):** مـــالـبـــچـــویـک، هەروەسـا (بون، بچـەدان، زهدان، بـویگان، پـوگـــان، بـوهـمـــان) ژی لکارن.

**بوم(Bûm):** جه، وار.

**بومهن(Bûmehen-Bûmhen):** بیــــــڤــــــەلەرز، بوومـــــــەلەرز، ئەردهژ(زلزال).

**بون(Bûn):** مـــالبـــچـــویـک ـ باهر، پشک ـ بنێ هەر تشتەکی.

**بویژه(Bêvîjê):** ب تایبەت.

**بویه(Bûye-ê):** ئارەزو، هیڤی.

**بوییدن(Bûyîden):** بێهن کرن.

**به(Bêh):** باش، قـەنج ـ بیـهـ(دارا بیهێ).

**به(Beh)**: پەیڤا سەرسورمانێ یە(پەح، وەح، حەو، و......هتد).

**بها(Beha)**: قیمەت، نرخ، بوها.

**بهار(Behar)**: وەرزێ بهارێ ـ بوت، بوتخانە ـ پەرستگەهـ، هەروەسا ناڤێ پەرستگەهەکێ یە ل «بلخ» کو (نوبهار) ژی دبێژنێ.

**بهاران(Beharan)**: دەمێ بهارێ.

**بهارە(Beharê)**: بهارە(ئەو تشتێ کو ل بهارێ شین دبیت و تێتە بەری).

**بهاری(Beharî)**: ئەو تشتێ کو یێ بهارێ بت، وەکی: (ئەورێن بهاری، بارانا بهاری).

**بهاز(Bêhaz)**: هەسپێ رەسەن کو بەرددەنە ناڤ ماهینا دا ب کارێ گوهنێلیێ رابیت.

**بهامین(Behamîn)**: وەرزێ بهارێ.

**بهانە(Behanê)**: هێجەت، مهانە.

**بهبود(Bêhbûd)**: (بەرەڤ باشی، ساخلەمی و سلامەتی)یێ چوون.

**بهتر(Bêhter)**: باشتر، قەنجتر، چێتر.

**بهداری(Bêhdarî)**: وەزارەت یان رێڤەبەریا ساخلەمیێ.

**بهدین(Bêhdîn)**: کەسێ کو ئۆلەکێ باش هەبت ـ ئۆلا زەردەشتی کو (دین بهی) ژی بۆ دهێت ـ کەسێن کو ب دویڤ ئۆلا زەردەشتی کەتین کو کۆما وێ دبت(بهدینان).

**بهر(Behr)**: باهر، پشک، بەش ـ ژ بۆ، ژ بەر(وەکی: از بهر تو = ژ بۆ تە، از بهر فلان چیز = ژ بەر فلان تشتی).

**بهرام(Behram)**: ستێرا مەریخ ـ ناڤێ رۆژا بیستێ ژ هەر مەهەکا سالا هەتاڤی ـ ناڤێ فریشتەکێ.

**بهرامن(Behramen)**: یاقووتا سۆر ـ پەرۆکێ ئارمویشی یێ رەنگین ـ سۆراڤ.

**بهرامە(Behrame-ê)**: ئارمویش ـ جلکێ کەسک ـ ناڤێ دارەکێ یە کو لشوینێ پتر «بیدمشک» لکارە.

**بهرە(Behrê)**: باهر، پشک، بەش ـ سوود، مفا.

**بهزاد(Bêhzad)**: نەژاد باش، رەسەن ـ ناڤە بۆ کورا.

**بهشت(Bêhêşt)**: بەهشت.

**بهم(Bêhem)**: دگەلێک، بهەڤرە.

**بهمن(Behmen):** هەیڤا یازدێ یە ژ سالا هەتاڤی کو دبیتە هەیڤا دووێ ژ وەرزێ زڤستانێ ـ ناڤێ رۆژا دووێ ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی ـ ناڤێ فریشتەکێ د ئۆلێ زەردەشتی دا ـ رەنیا بەفرێ ـ ناڤێ گیایەکێ پر ستری یە کو ل چیای شوین دبت.

**بهـــــمنگان(Behmengan):** جەژنەکا کەڤنا ئیرانیایە کو ل رۆژا دووێ ژ هەیڤا بهمن دگێران.

**بهنانە(Behnane-ê):** بنێـــــرە (بوزینە).

**بهوش(Bêhûş):** هشیار، سەرخوە.

**بهیزک(Bêhîzek):** د کەڤن دا هەر هەیڤ (٣٠) شەڤ و رۆژ بوون ئو هەر سال (١٢) هەیڤ بوون ئەڤە دکەت (٣٦٠)رۆژ؛ مە پێنج رۆژ دمینن تا کو سالا مە دروست بیت چونکی یا زانایە سالا ئاسایی (٣٦٥)رۆژ و (٥) دەمژمێر و (٤٨)دقیقە و (٤٩)ثانیەنە، لەورا پێنج رۆژ دهاڤێتنە سەر (٣٦٠)روژا دا کو سال تمام ببا و دگوتنە وان پێنج رۆژا «بهیزک». دیسان هەر چار سالا جارەکێ سال دبیتە «سالا کەبیسە» کو دەمژمێرێن زێدە ژ هەر سالەکێ کۆم دکەنە سەرێک و دبیتە نێزیکی رۆژەکێ و دبێژنە وێ رۆژا ب کەم و کورێ: «اورداد».

**بهین(Bêhîn):** باش، باشترین ـ هەفتی(اسبوع).

**بی(Bî):** بێ، وەکی: (بی آب = بێ ئاڤ).

**بیابان(Bîyaban):** دەشت، ئەردێ پان و بێ ئاڤ و شینکاتی.. ئەڤ پەیڤە د بنیات دا (پەهلەوی)یە.

**بیات(Beyat):** ژ ئاوازێن کەڤنێن ئیرانیا (بیات اصفهان، بیات ترک) ـ ناڤێ ئێلەکێ ژ ترکێن ئیرانێ ـ ناڤێ کەلهەکێ یە ل (لورستان)ێ.

**بیاستو(Beyastû):** باوشکێن خەوێ ـ بێهنا کو ژ دەڤی دهێت.

**بیاوار(Beyavar):** شۆل، کار، پیشە.

**بیباک(Bîbak):** بێ ترس، نەترس.

**بی بندوبار(Bî bendo bar):** سەربەردای، بێ هەفسار(بۆ وان کەسا دهێت گوتن یێن کو پابەند و گرێدای ب داب و نەریتێن جڤاکێ

خوەڤە نەبن).

**بی بی(Bîbî):** خـاتوین، خـانم ـ ژنکا باش ـ داپیـر(دەیکا بابێ، یان دەیکا دایێ).

**بی پایاب(Bî payab):** دەریـایـا کویر.

**بیجا(Bîca):** بێ جھ( چ بۆ مرۆڤ و گیـانەورێن بێ خـانی و هێلین، چ بۆ پەیڤێـن نەراست و نە دجھ دا)، هەروەسـا (بێ هەڤـال) ژی دئێت وەکی: (خندەء بیـجا = کەنییێ بێ هەڤال) یێ کو ب تشتـەکی بکەته کەنی کو نە جهێ کەنی بت و کەس ژ بلی وی بخوە پێ نەکەنت.

**بی چشم و رو(Bî çeşmo rû):** درکـەیەکـە مـینا یا کـوردی، دەمێ دبێـژت: فــلان کــەس (بێ سەروچاڤ)ە.

**بیچون(Bîçûn):** بێ هەڤتا.

**بیخ(Bîx):** بنێ هەر تشتەکی.

**بیـختن(Bîxten):** تشـتــەک ل بێژینکێ کرن.

**بید(Bîd):** دارا بی یێ.

**بیداد(Bîdad):** زولم، ستەم.

**بیدار(Bîdar):** هشیار، نەنڤستی.

**بیداشت(Bîdaşt):** بێ خەبەر، های ژ خوە نە.

**بیـدخ(Beydex):** هەسـپێ ب لەز بچیت و یێ شەڕی بیت.

**بیـدخت(Bîduxt):** سـتـێـرا ناهید(زهرة).

**بیر(Bîr):** نڤینک، جهێ نڤستنێ، جلکێن نڤـسـتنێ ـ برویسی ـ تۆفان.

**بیرم(Beyrem):** جۆرەکێ پەڕۆکێ تەنک کو ژ بەنکا هاتیە چێکرن.

**بیـرو(Bîrû):** کـیـسکێ پارا ـ بێ شەرم.

**بیرون(Bîrûn):** ژ دەرڤە.

**بیزار(Bîzar):** بێزار، پەریشان و ب پاتک ـ رەڤۆک ژ تشتەکی، کەسێ کو ژ تشتەکی برەڤیت و کەرب ژێ ڤەببیت.

**بیست(Bîst):** هژمارا (٢٠).

**بیستون(Bîstûn):** بێ ستوین ـ بێ ئاسـاس ـ ناڤێ چیـایەکێ یە ل ئیـرانێ کـو د چیـرۆکـا شـیـرین و فەرهاد دا یێ ناڤدارە.

**بیسـراک(Bîsurak):** حـێـشـتـرـ هێستر.

**بیش(Bîş):** زێدە، گەلەک، فراوان.

**بیشتر(Bîşter):** پتر، زێدەتر.

**بیشترین (Bîşterîn)**: پترین، زێدەترین.

**بیشە (Bîşê)**: بیش، جهێ تێر داروبار.

**بیغار (Beyxar)**: تەعن، چک.

**بیغال (Bêyxal)**: رم ـ تیر.

**بیغولە (Bîxûlê)**: کونج، کوژی، قورنەت ـ کاڤل.

**بیکران (Bîkeran)**: بێ دویماهی، بێ پایان.

**بی کیار (Bî kêyar)**: چست و زیرەک.

**بیگار (Bîgar)**: سوخرە (کارێ کو ب زۆری و بێ بەرامبەر ب ئێکی بدەنە کرن).

**بیگانە (Bîganê)**: بیانی، نەنیاس، غەریب.

**بیل (Bîl)**: بێر، مەربێل.

**بیلک (Bîlek)**: تیرا دو سەر، تیرا کو سەرێ وێ پان بیت ـ مەربێلا بچویک.

**بیلە (Bîlê)**: بنێرە (بیلک)ـ ئەو بەفربێن کو قایکا بێ دهاژۆن ـ گزیرتە.

**بیم (Bîm)**: ترس.

**بیمار (Bîmar)**: نەخوەش، نەساخ.

**بیمناک (Bîmnak)**: ب ترس، ترسدار، ب سەهم.

**بینا (Bîna)**: ب چاڤ، کەسێ کو دبینیت (یێ کو هەر دو چاڤێن وی د ساخلەم بن بۆ دیتنێ).

**بیناس (Bînas)**: کولەک، پەنجەرە. هەروەسا پەیڤێن (پیناس و پیناسک) ژی لکارن.

**بی نماز (Bî nemaz)**: کەسێ کو نڤێژا نەکەت ـ درکەیە بۆ ژنکێن د (عادێ: بێ نڤێژاهیێ) دا، بێ نڤێژ.

**بینندە (Bînendê)**: بینەر، تەماشەڤان ـ چاڤ.

**بینە (Bînê)**: جهێ کو جلکێن خوە لێ دئێخن بەری بچن د حەمامێ (سەرشویێ) ڤە.

**بینی (Bînî)**: دفن، کەپو، پۆز.

**بینی کردن (Bînî kerden)**: دفنبلند (مغرور).

**بیوارە (Bîvarê)**: بێ کەس، غەریب، تنێ، بێچارە، بیانی، نەناسیار.

**بیواز (Bîvaz)**: شەڤرەڤینک، چەکچەکیلە.

**بیور (Bîver)**: دەهـ هزار (دەهـ هزار

دانە ژ تشتەکی).

**بیـوراسب(Bîver esb)**: خـودانێ دەه هزار هەسـپا (نازناڤێ ضـحاک ی یە).

**بیوس(Bêyûs- Beyûs)**: ئومێد، ئارەزو، هیڤی.

**بیوگ(Beyûg)**: بویک(عروس).

**بیـوند(Bêyvend-bîvend)**: بێ وەفایی ـ غـەدر ـ خیـانەت ـ حیلە، فێل.

**بیوە(Bîvê)**: بیژن(ژنکا کو هاتبیـتە بەردان یان مێر لێ نەمابیت).

**بیهن(Bîhen)**: سیخور.



**پ:** تیپا سیێ یه ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی، کو هنده جارا دهێته گوهارتن و دبیته (ف)، وەکی(پیل = فیل، پارس = فارس، سپید = سفید).

**پا(Pa):** پێ(ئەندامەکێ لەشی یه) ـ بنێ هەر تشتەکی.

**پا افزار(Pa efzar):** پێلاڤ.

**پا انداز(Pa endaz):** ئەو تشتێن کو لبن پێ خوه برائێخن، وەکی(مەحفویر و کومبار و......هتد) ـ کەسێ کو بو قومارباز تشتێن قومارێ بەرهەڤ دکەت ـ گەواد(ئەوێ کو دبتە دەستک بۆ پویچکرنا ناموسا کەسەکێ دی).

**پابرجا(Paberca):** موکوم، بنەجه ـ سەرپێ، ژپێڤە.

**پابرچین(Paberçîn):** جورەکێ هێدی رێڤەچوونێ(وەسا کو دەنگ ژ پێێن مرۆڤی نەهێت).

**پابست(Pabest):** پابەند، گرێدای.

**پاباه(Pabêmah):** ژنکا ب حال کو لەها دویاهیێ ژ ئاڤزیێ بت(وەکی ئەم ب کوردی دبێژین: یا لسەر مەه و رۆژێن خوه).

**پاپاسی(Papasî):** پارێ بچویک و کێم بها(هویردە).

**پاپک(Papek):** بابێ بچویک.

**پاپوش(Papûş):** پێلاڤ.

**پاتختی(Patextî):** جەژنا رۆژا دووێ ژ داوەتێ(لجەم یا ئەڤ رۆژا یا ناڤدارە ب «سەرسبەحی»).

**پاتوغ(Patûx):** جهێ هلدانا ئالای.

**پاتیل(Patîl):** مەنجەلا سفری یا دەر مەزن.

**پاجامە(Pacamê):** بێجامە، شەلوال.

**پــاجـــــــــــــوش(Pacûş)**: کوبشەکری(زاراوەکێ جوتیاری یە، وەکی کوبشەکرنا دارمێوێ).

**پاچک(Paçek)**: ریخـا چێلێ کـو هشک ببیت.

**پاچنبری(Paçenberî)**: پێ خوەهر.

**پاچنگ(Paçeng)**: کولەک، کونکا دیواری.

**پاچین(Paçîn)**: دەلنگێ دەرپێــیێ ژنکا کو ب کوریشک بیت.

**پاخـره(Paxerê)**: تەرمــە(جــهێ روینشتنێ ل دەرێ مالێ).

**پاد(Pad)**: زێرەڤــانی، زێرەڤــان ـ تەخت.

**پـــــاداش(Padaş)**: پــــــاداش، سزا(حەقێ کریارێ، چ باش بیت و چ خراب).

**پادرەم(Padrem)**: کۆما خەلکی.

**پـــــادزهــــــر(Padzehr)**: دژی ژەهرێ(هەر دەرمانێ کو کارتێکرنا ژەهرێ ژ بن ببەت).

**پادشـاه(Padşah)**: شـاهێ خـودان تانج و تەخت.

**پادگان(Padgan)**: جهێ زێرەڤانییێ ل تاخەکی.

**پادگـانه(Padganê)**: بان، سەربان ـ پەنجەر ـ کولەک.

**پادوسپان(Padûspan)**: نازناڤ و پلا چوار کاربدەستێن مەزن لسەر دەمێ ئەنوشێروانی.

**پاده(Padê)**: کــەل(کــەلێ پەزی، کەلێ گامێشا).

**پادیاب(Padyab)**: شـــــویشـتن، دەستنمێژ گرتن.

**پادیر(Padîr)**: سـتـوینێ کـو دادنـه بـەر دیـوارێ ژجــــــە چووی دا نەهەرفیت.

**پار(Par)**: بـۆری، ســـــالا بۆری ـ کورتکریا (پارە = پارچە، قطعە)، وەکی (پارچەکا پەرۆکی)هەروەسا هەگەر دوجار لدویڤ ئێک بهێت: (پار پار = زیڤــال زیڤــال، ریتــال ریتال).

**پاراو(Parav)**: پیرەژن.

**پارت(Part)**: مللەتەکێ ئیـرانی بوو کـــو ل دەڤـــەرا «پارت» یان ژی «پارتیـا»(دەڤـەرەک بوو ل باکورێ رۆژهلاتا ئیـرانێ کـو ژ خـوراسـانا نهـۆ تا سنسـلا چیـاییێن ئەلبـورز و دەریاچا خــەزەر پێکدهات) ژیانا خــوە دبرنە ســەر، و پرانیــا وان کــۆچەرات بوون و ل بن کــوینا

دژیان. سەرۆکێ ڤی مللەتی یێ ناڤدار ب (ئەشک) ل سالا ٢٥٠ بەری زایینێ ل دژی سلوکی یا راوەستیا و دەولەتا ئەشکانی دامەزراند.

**پارچ(Parç)**: دۆلکێ ئاڤێ.

**پارچە(Parçê)**: پەرۆک ــ پرت، قەد، کەر(وەکی کەرەکێ نانی).

**پاردم(Pardum)**: پالیڤا کورتانی یان زینێ، کو دئێخنە بن کوریا دەوارا.

**پارس(Pars)**: نەتەوەکێ ئیرانی یە، هەروەسا ئەو دەڤەرە یا کو ئەڤ نەتەوە لێ ئاکنجی بووین ـ دەنگێ سەی.

**پارسا(Parsa)**: دەهمەن پاقژ ـ کەسێ کو خوە ژ گونەهێ بدەتە پاش.

**پارسنگ(Parseng)**: بەرێ کو دکەنە د رەخێ دی یێ ترازیێ دا، دا هەردو رەخ هندی ئێک لێ بهێن.

**پارسە(Parsê)**: گەدایی ــ کەدخودایی.

**پارگین(Pargîn)**: گۆم، چالا ئاڤا پیس و گەنی.

**پارنج(Parenc)**: پارێ کو ددەنە سترانبێژ و موزیکژەنا دا ل داوەتێ ئامادە ببن ـ پارێ کو ددەنە دختوری دا سەحکەتە نەخوەشی.

**پارنجن(Parencen)**: خرخالێن کو ژنک دکەنە پێن خوە، حجول.

**پارو(Parû)**: بەفری، هەروەسا ئالاڤەکێ مینا بەفری یێ یە کو قایکا پێ دهاژۆن.

**پارە(Pare-ê)**: پرت، قەد، لەت، کەر ـ پنی ـ درپای ـ کەلاشتی ـ بەرتیل.

**پاریاب(Paryab)**: چاندنا ئاڤی.

**پارینە(Parînê)**: یێ پار، کەڤن، دێرین.

**پازاچ(Pazaç)**: پیرک.

**پازن(Pazen)**: نێری ـ بزنێ کویڤی.

**پاس(Pas)**: زێرەڤانی ـ چاڤدێری ـ رێزگرتن ـ دانەک ژ شەڤێ یان رۆژێ.

**پاسبز(Pa sebz)**: (درکەیە بۆ کەسێن پێ برەشک، بێ ئیقلەح، کور و بەش، کو پێ وان نە یێ خێرێ بت).

**پاسخ(Pasux)**: بەرسڤ، وەلام.

**پاشنە(Pşnê)**: پەحنی یا پێی.

**پاشـیب(Paşêyb):** دەرەجکێن کـو پێ بچنە بن ئەردی.

**پاشیدن(Paşîden):** رەشاندن(ئاڤ رەشاندن).

**پاغـر(Paxer):** سـتـوینا لبن بانێ خانی.

**پافشـاری(Pafêşarî):** بەرخـودان ـ اصرار.

**پاک(Pak):** پاقژ.

**پاکار(Pakar):** خزمەتکار، خولام.

**پاکـبـاز(Pakbaz):** کـەسێ کـو د قـومـارێ دا هەمی سـامـانێ خـوە بدۆرینت ـ ئەڤینداری کو ژ دلەکی پاقژ بنێرتە یارا خوە.

**پاک جامە(Pak camê):** دەهمەن پاقژ(د دەرحەق ناموییسێ دا).

**پاک جـفت(Pak cuft):** ژن یان زەلامێ کـو خـیـانەتێ ل هەڤژین(ێ،ا) خوە نەکەت.

**پاک چهر(Pak çêhr):** خـشکوک، روی دەلال.

**پاکـدامن(Pakdamen):** بنێـرە: (پاک جامە).

**پاکی(Pakî):** پاقژی، دەهمەن پاقژی ـ گـویزان(ئالاڤێ کـەڤن یێ سەرتراشینێ).

**پاکیزە(Pakîzê):** پاک، پاقژ.

**پاگشـا(Pa guşa):** مێـهڤـان کـرنا بویک و زاڤـا پشـتی داوەت تمام دبیت، ئەو ژی ژ بەر هندێ یە کـو رێکا وانا ل مـالا خـوە ڤەکـەن(دا بویک و زاڤـا هاتن و چوونا مـالا وان بکەن).

**پالان(Palan):** کورتان.

**پالانە(Palanê):** بەیتوتا خانی.

**پالانیدن(Palanîden):** گـڤاشتن ـ پاقژکرن، بێژینک کرن ـ زێدەکرن.

**پـالاون(Palaven):** ئـالاڤـێ پالاوتنێ(صافینک، صافوک).

**پالاهنگ(Palaheng):** هەڤسار.

**پالایشگاە(Palayêşgah):** جـهێ پالاوتنێ(جهێ پالاوتنا گازێ).

**پالیز(Palîz):** باغ، بیستان، وەرزێ خیار و گوندۆر و زەبەشا.

**پامس(Pames):** گرێدای، گرفتـار، بێچارە.

**پانزدە(Panzdeh):** هـژمـارا (١٥)پازدە.

**پانصـد(Pansed):** هژمـارا (٥٠٠)پێنج سەد.

**پانیذ(Panîz):** شەکر.

**پاورچین(paverçîn):** بـنێـرە:

(پابرچین).

**پاياب(Payab)**: بيـرا ئاڤێ كـو ب دەرەجک بيت دا د وان دەرەجکا را بچن خـــوارێ و ئاڤێ بينـنه دەر ـ جهێن كێم ئاڤ لبەر لێڤا رويبارى يان دەريايێ كـــو پێ مـــرۆڤى ژ ئەردى بگريت ـ هێز، شيان، زاخ، خۆراگرى.

**پاياپاى(Payapay)**: پێككگوهارتنا تشتا ل ناڤبەرا دو وەلاتان دا بێى كو پارەكێ بدەنە هەڤدو.

**پايان(Payan)**: دوماهى، ئەنجـام ـ خوارێ، نشيڤ.

**پـــــــاى بـــــــاز(Paybaz)**: سەماكەر(رقاص).

**پـايـتـــــــــــخـت(Paytext)**: پايتـەخت(باژێرێ كـو سـەرۆک و جڤاتا حوكمەتێ لێ بيت).

**پايدار(Paydar)**: مـوكوم، بنەجه ـ بەرقـــرار ـ نـەمـــر، هەردەمى، هەروهەر.

**پايدام(Paydam)**: تەلهە.

**پـايـكـوبـى(Paykûbî)**: داوەت، گوڤەند، سەما.

**پـايـگـاه(Paygah)**: جـــــه، در ـ مەقام، قەدر ـ دەرازينک.

**پـايـمـرد(Paymerd)**: هـاريـكـار ـ ناڤبژيڤانى.

**پـاى مـــــــــوزە(Pay mûze-ê)**: جەزمە.

**پايندان(Payendan)**: گرەو ـ جهێ پى يا(بنێ كۆچكێ).

**پاينـدە(Payendê)**: هەر و هەر ـ موكوم.

**پايە(Payê)**: پێپک ـ شەنگستە ـ قـــەدر و قـــيـــمـــەت ـ پلە و پايە(رتبە).

**پايەدار(Payêdar)**: تشـــتێ كـــو پێـــــــپک هەبت ـ پلەدار د رێڤەبەريێن ميرى دا.

**پاييـــدن(Payîden)**: زێرەڤـــانى لێكرن، چاڤدێرى لێكرن.

**پاييز(Payîz)**: وەرزێ پاييزێ.

**پاييـزە(Payîzê)**: پاييـزى(چاندنا پاييزى).

**پايين(Payîn)**: خـوارێ، نشـيـڤ، بن، ژێر.

**پـايـين پـرست(Payîn perest)**: خزمەتكار، خولام.

**پـپـــــــــــتـک(Pêptek)**: تلمـسـک(تلمـسـكا خـورمێ يان تلمسكا ترى).

**پت(Pet):** پەڕۆکێ کو ژ مـوییێ بزنا تێتە چێکرن.

**پتت(Pêtet):** توبە، توبەنامە.

**پتک(Putk):** چەکوێچێ ئاسنگەرا.

**پتو(Petû):** بەتانی.

**پتو(Petev):** بەرۆژ.

**پتواز(Petvaz):** بەرسڤ ـ پەسـەند ـ هێلینا فرندا.

**پته(Pete):** پێهێل، بلیت.

**پتی(Petî):** ڤاله ـ رویس، تازی.

**پتیاره(Petyarê):** ئاتاف، زیان ـ بەلا ـ کرێت و ترسناک ـ خرابکار ـ دێو ـ ژنا خرابکار.

**پچ پچ(Pêç pêç):** پسـت پسـت، نم نم(هێـدی و د بن لێـڤـاڤـه دگەلێک ئاخفتن).

**پچشک(Puçuşk):** کوشپل(پشکل)ێ بزنێ و مەڕێ و حێشترێ و......هتد.

**پچل(Peçel):** قرێژی، پیس.

**پخپخو(Pêxpêxû):** گلیزانک.

**پختن(Puxten):** کەلاندن، لێنان.

**پخته(Puxtê):** کەلیای(بەرهەڤ بۆ خوارنێ) ـ گەهشتی(بۆ فێقی) ـ مرۆڤێ کاردان و ب سەربۆر.

**پخش(Pexş):** پەلاتە، بەلاڤـه ـ پەحن، پان ـ قـوتای، هەرشی، پەرچقی.

**پخش و پلا(Pexş û pela):** ژێک بژاله، پرت و بەلاڤ.

**پخل(Pexel):** قەسـەلێ گـەنمی یان جەهی.

**پخمه(Pexmê):** کـێم عـاقل، دەبەنگ.

**پدر(Pêder):** بـاب(زەلامێ کـو خودان زاروک بیت).

**پدرام(Pêdram):** پیـروز ـ خوەش(بۆ جهی) ـ قەنج.

**پدراندر(Pêderender):** زرباب.

**پدرخته(Pedrextê):** خەمگین.

**پدرخوانده(Pêderxandê):** ئەو کەسێ کو کەسەک دی وی ل شوینا بابێ خوە دانت.

**پدرزن(Pêderzen):** خـەزویر(بابێ ژنێ).

**پدید(Pedîd):** ئاشکرا، پەیدا.

**پذیرا(Pezîra):** پەسـەندکـەر ـ پێشوازی کەر.

**پذیرفتن(Pezîruften):** پەسەندکرن ـ پێشوازیکرن.

**پر(Pur):** پر، تژی، مشت.

**پر(Per):** پەرێ فرندا.

**پرازده(Perazde-ê)**: گــــرکــــا هەڤیری.

**پـــراکـــنـــدن(Perakenden)**: پەلاتەکرن، بژالەکرن، بەلاڤکرن ـ پەریشانکرن.

**پراکوه(Perakuh)**: سەرێ چیای، وی رەخێ چیای.

**پران(Perran)**: فرندە، هەر تشتێ کو بفرت ل دەمێ فرینێ.

**پر آوازه(Pur avazê)**: پڕ ئاواز، پڕ دەنگ ـ ناڤــدار، ب ناڤ و دەنگ.

**پر آهو(Pur ahû)**: پڕ عێب.

**پرپایه(Pur payê)**: زیڤزیڤە.

**پرت(Pert)**: دوور ـ رەخ، کنار.

**پرتاب(Pertab)**: هاڤێتن(هاڤێتنا تیر و گوللەتوپا و......هتد).

**پرتابیان(Pertabîyan)**: کڤاندار، تیرهاڤێژ.

**پرتگاه(Pertgah)**: فرەک ـ رزدە.

**پرتو(Pertuv)**: رۆناهی، تیـرۆژک، تیشک.

**پرچانه(Purçanê)**: پربێژ.

**پرچم(Perçem)**: ئالا.

**پرچین(Perçîn)**: پیژان، پەرژان.

**پرخاش(Perxaş)**: شەڕ، شەڕەدەڤ، شەرەنیخ، جرڕە.

**پرخش(Perexş)**: رانێت هەسپ و هێسترا ـ شیر(شمشیر)ـ دەڤک، مۆس.

**پرخو(Perxev)**: کوار ـ کەزاخە ـ ئادە.

**پرداختن(Perdaxten)**: ڤەهوسوین ـ لێکدان ـ ئەنجامدان ـ مژویل بوون ـ تمام بوون ژ کـــارەکی ـ ڤالاکرن ـ پارەدان، مەزاختن.

**پردوش(Perdûş)**: شڤێدی(شەڤا بۆری).

**پرده(Perdê)**: عــــەبا ـ پەردە ـ پەردێن ئالاڤـێن مـوزیکی وەکی (عـود، بزق، سێ تار و......هتـد)ـ هەر پارچەیەک ژ شانویێ.

**پررو(Pur rû)**: بێ شەرم، زرشەرم.

**پرز(Purz)**: پویـرتـک(پـویـرتـکێ خوخێ)ـ هەروەسا رویێ ب سەرڤە یێ ئەزمانی پڕی چوکلکێن گەلەک هویرن کو ئەو جوکولک د ناڤدارن ب (پرز زبان: Purzê zeban).

**پرس(Purs)**: پرس، پرسیار.

**پرس(Pers)**: پەردە.

**پرستار(Perestar)**: خزمەتکار، کەسا کو خزمەتا نەخوەشی دکەت،

سستەر.

**پرستـــارزاده(Perestar zadê):** کـورێ(یان کـچـا) خـولامـی یان خودامێ یان ژی بەنی.

**پرستش(Perestêş):** پەراستن.

**پرســـتک(Perestuk):** حـــاجی رەشک(فڕندەکە).

**پرستک(Perestek):** خزمەتکار.

**پرستو(Perestû):** حاجی رەشک.

**پرسش(Pursêş):** پرسیار.

**پرسم(Persum):** ئـارێ کـــو ب گـرکـێت هەڤـیـری وەردکـەن دا نەمینە پێکڤە.

**پرسە(Pursê):** سەرەدانا نەخوەشی ـ پرسە و سەرەخوشی ل بەهیداریێ.

**پرسە(Perse- ê):** کۆلانی، فەلیتە ـ گەڕۆک، گەدا.

**پرسیدن(Pursîden):** پرسیارکرن.

**پرش(Perêş):** فرین، خوە هلاڤێتن، خـوە هاڤـێتن ژ جـهـەکی بۆ جـهـەک دی.

**پرغونە(Perxûnê):** کرێت.

**پرکاوش(Perkavêş):** کەزاختن.

**پرکم(Perkem):** بێ کـەڵک، بێ مفا، تشتێ کو چو پێ نەڤەتیت.

**پرکوک(Perkûk):** خـانیـێن مـەزن، قەسر.

**پرگار(Pergar):** ئالاڤەکێ دو چقە د زانسـتـێ هەندەسێ دا بکار دهێت و وێـنێن بـازنەیی پێ دهێـــتـــە چێکرن(فرجال).

**پرگـالە(Pergalê):** باهر ـ پارچە ـ پنی.

**پـرگـنـە(Pergenê):** نـاوچـە ـ پارێزگەه.

**پرمـا(Perma):** ئالاڤـەکـە کـو دارتـراش بـۆ کــــونـکرنا داری بکاردئینن.

**پرمـاس(Permas):** پەرخـانـدن ـ دەست کرن(لەمس کرن).

**پرن(Peren):** ستێرا پەروین(ثریا)ـ ئارمـیش، پەڕۆکێ ئارمـویشی یێ گولدار ـ بۆری ـ دوهی.

**پرند(Perend):** ئـارمــــویـش ـ شیـر(شمشیـر) ـ شڤێدی(شەڤا بۆری).

**پرندە(Perendê):** فـرندە، باڵندە؛ (پرندگان = کۆما فڕندا).

**پرنیان(Pernêyan):** ئارمویش.

**پروا(Perva):** بێـــهـن فــرەهی ـ حەزکرن(رغبة)ـ تێبینی ـ چاڤدان ـ ترس.

**پروار(Pervar):** قـەلەو ـ خـانيێ هاڤينى ـ ئاگردانک.

**پرواز(Pervaz):** پەرڤەكرنا فرندا ـ فـــرين(فـــرينا فـــرندا و فرۆكا«بالەفرا» )ـ دەپێت نازک و كورت كو لسەر كاريتێن خانى رێز دكەن بەرى بێتە ئاخبانكرن.

**پروازە(Pervazê):** خـــوارنا كـــو رێڤنگ يان نێچيرڤان دگەل خوە دبەن ـ ئاگرێ كو لبەر پێن بويک و زاڤا هلدكەن ـ پلپلک و زرزرک و تەيسوكێن كو بسەر سەرێ بويک و زاڤا دادكەن.

**پروانە(Pervanê):** پـەلاتـينـک ـ هەروەسـا گـيـانەوەرەكـە وەكى طورى كـو ل پێش يان پاش شێرى دچيت دا بەرمـاييكێن شـێـرى بخـــۆت و ب دەنـگێ خـــوە گـيـانەوەرێن دى ژ هاتنا شـێـرى ئاگـەهدار دكـەت ـ ئالاڤـەكێ پەردارێ دەسـتكردە كـو ب كـوردى ژى هەر دبێـژنێ پەروانە، وەكى: (پەروانا ترومبێلێ يان فروكێ) ـ روخسـەت، ئيجازە، دەستورنامە.

**پـــــرورانـــــدن(Perveranden):** پەروەردەكرن ـ فێركرن.

**پـروردگـــــــار(Perverdêgar):** پەروەردەكـەر، ناڤـەكـە ژ ناڤـێن خودێ.

**پروژ(Pervej):** نەژاد.

**پروزن(Pervêzen):** بێـــــژينـک، مـوخـەل، يـان هەرتشـتـەكێ ژ ڤى رەنگى.

**پروندە(Pervendê):** دوسيە.

**پرويز(Pervîz):** سەركەفتى(مظفر، فاتح)ـ هەروەسا بنێرە(پروزن).

**پرويش(Pervîş):** ســـــــتى، بێ خەمى، قوسيرى، تەنبەلى.

**پروين(Pervîn):** كۆمەكا ستێرانە، لێ تنێ شـــەش ژ وان كـــو وەک ئويشـــەكى نە لجـەم هەڤ خـرڤـە بووينـە، و ب چاڤ دهێـنە ديـتن، بعەرەبى دبێژنێ (ثريا).

**پرە(Perrê):** پەر، كنار، رەخ(پەرێ باژێرى) ـ هەر تشـتێ وەكى پەرى بيت، وەكى: پەرێ ئاشێ ئاڤى.

**پرهازە(Perhazê):** دارێ پێـتـى كـو زوى ئاگر تێ بەربيت.

**پرهون(Perhûn):** هەرتشـــتـــەكێ بازنەيى(بێـدەر ـ توک، رســتک و......هتد).

**پرهيـــز(Perhîz):** هشـــيـــاربوون،

خوەدوورئێخستن ژ هەر تشتەکێ زیاندار.

**پرهیزانە(Perhîzanê):** پارێز(خوە دوورئێخستن ژ خوارنێن خراب بۆ ئێشێ) ـ رۆژی، رۆژیگرتن.

**پری(Perî):** کورتکریا پەیڤا «پرير»، کو ل پێشیا هندەک پەیڤێن وەکی(روز، شب، سال) دهێن و ئانکویا (بەری دو) ددەت، وەکی(پريروز = بەری دو رۆژا، پێر ـ پريشب = بەری دو شەڤا، شەڤا دی ـ پريسال = بەری دو سالا، پێرار) ـ پەری، فریشتە.

**پریدن(Perîden):** فرین، خوە هلاڤێتن.

**پریدن(Purîden):** پر بوون، تژی بوون.

**پریز(Perîz):** قێرین، نرین، بعەرەبی دبێژنێ(زئير) ـ فریز(گیایە) ـ بێژینک.

**پریسا(Perîsa):** کورتکریا پەیڤا لێکدایا (پەری افسا)یە، ئانکو: کەسێ کو ئەجن و پەریا ئێخسیر دکەت ـ حیلەکەر.

**پریشان(Perîşan):** بژالە ـ خەمگین، پەریشان ـ ئالوز ـ دەست تەنگ، دەستکورت.

**پریون(Peryûn):** گورِی بوون.

**پز(Pez):** ئانکوا وێ یا دەقوودەق هەمان پەیڤا «پێژ»ە، کو ژ پەیڤا («پختن»؛ ئانکو: پەحتن، پاتن) هاتیە وەرگرتن، وەکی: نانپز(نانپێژ)، لێ پرانیا جاران ئانکوا وێ یا گرێدایە ب پەیڤا بەری وێ ڤە، وەکی: آشپز: خوارن لێنەر(طبّاخ) ـ زودپز: قازانا بوخارێ(ژ بەر کو تشتێ تێدا زوی دکەلیت) و......هتد).

**پزا(Peza):** کەلەک(ئەو تشتێ زوی بکەلیت).

**پزاوە(Pezavê):** کویرهە، ئێتوین.

**پزشک(Pêzêşk):** پزیشک، نوژدار، دختور.

**پژ(Pej):** گر، کومت، چیا ـ ئەداف، کێم، پیساتی.

**پژاوند(Pejavend):** شینک(یێ کو جلکا و هریێ پێ دشۆن) ـ دارێ کو دادننە پشت دەری دا نەڤەبیت.

**پژمان(Pêjman):** خەمگین ـ دلتەنگ ـ پەشێمان.

**پژمردن(Pejmurden):** خەمگین

بوون ـ چرمسین.

**پــــــژواک(Pejvak):** دەنـــــگ، دەنگڤەدانا دەنگی.

**پژوم(Pejûm):** دەرویش ـ هەژار ـ گەدا.

**پژوهیدن(Pêjûhîden):** لێگەریان، ڤەکولین.

**پس(Pes):** لدویف، ل پاش(وەکی: پس فـردا = ل دویف سوباهی را، دوزبا ـ پس افـتـادن = پاشکەتن) ـ ئالاڤێ پەیوەندیێ یا کـــو ئەم دبێژینێ (پا)، وەکی: (پس تو هم آمدی؟ = پا تو ژی هاتی؟).

**پس(Pus):** پس، کور.

**پساپیش(Pesapîş):** پاش و پێش.

**پساوند(Pesavend):** د هۆزانێ دا ئانکو: (سـەروا«قـافـیـە») ـ د ریزمانێ دا ئانکو: پاشگر.

**پست(Pest):** کـورت ـ ژێر ـ نشـیـڤ ـ چوننە(بێ بها ـ مرۆڤێ بێ بها) ـ قەلس.

**پست(Pêst):** ئار، ئارێ قـەلاندی یێ گـەنمی یان جەهی یان نوکا کـو بعەرەبی دبێژنێ (سویق).

**پســــــتـــــــا(Pesta):** پاش قولاچک(ذخیرة) ـ جار، کەرەت.

**پستان(Pêstan):** مەمک، چچک، گوهان(بێت ژنکا یان گـیـانەوەرێ مێ).

**پســـتـــان بند(Pêstan bend):** ئێلەک، زەخمە.

**پستک(Pestek):** چوخک.

**پستو(Pestû):** پاش مەزەلک.

**پسته(Pêstê):** فستەق.

**پس خـــــــورده(Pes xûrdê):** بەرماییک.

**پسر(Pêser):** کور، بچویکێ نێر.

**پســــــر اندر(Pêser ender):** نەڤسی(نەڤسیێ کور).

**پسربچه(Pêser beçê):** سنێلە.

**پســرخـوانده(Pêserxandê):** ئەو کـــورێ کـــو کـــەســـەک بۆ خـــوە خـــــودانکەت، ب عــــــەرەبی دبێژنێ(تبني).

**پســرو(Pêserû):** کـورتکریا پەیڤـا (پسر)ە، ئانکو: کورکێ بچویک، کورکۆک.

**پسروار(Pêservar):** وەکی کورکا ـ د زاراوێ فــقـــەهی دا ئانکو ئەو باهرا کو ژ میراتێ بابینیێ دگەهتە کوری.

**پســـغـــده(Pesexdê):** چێکری،

بەرهەڤ، ئامادە.

**پس فـــــــــردا(Pes ferda):** دوزبا (پشتی دو رۆژێن دی).

**پس فرستادن(Pes fêrêstaden):** زڤراندنەڤە.

**پس کـوچە(Pes kûçê):** کـولانا بچویک و بن گرتی.

**پـســنــدیــدن(Pesendîden):** پەسـەندکـرن، قـەبویل کـرن، هەلبژارتن.

**پسوند(Pesvend):** پاشگر.

**پش(Peş- puş):** مـوییێ پاتکا هەسپی.

**پش(Puş):** بوم، کوند.

**پشـام(Peşam):** هەر تشـتـەکێ رەنگ تارى.

**پشت(Puşt):** ژ دەرڤـە یان لسـەر تشـتـەکی ـ ل پشت، لدویڤ ـ پشت ـ پشتەڤان.

**پشـتاپشت(Puştapuşt):** لدویڤ ئێک.

**پشـت پا(Puştê pa):** بەرپێـک ـ سەر پێ ی(بەروڤاژی بنێ پێ ی).

**پشت پایی(Puştê payî):** درکـەیە بۆ کورێ خرابکار(مخنث).

**پشـتک(Puştek):** قـولیـپـانک، قولپینک ـ چوخک.

**پشت کوژ(Puşt kûj):** پشت قلۆز، پشت قوز.

**پشـتـوار(Puştvar):** پشـتـەڤـان، پەیڤـێن ( پشـتـوان، پشـتـیـبـان، پشت و پناە) ژی لکارن.

**پشک(Pêşk):** پشکلێن گیانەوەرا ـ پشک هاڤێتن(قرعة).

**پشک(Peşek):** خوناڤ.

**پشک(Puşek):** کـێـتک، پشـیـک، هەروەسـا پەیڤـێن (پوشک، پیـشـیـک، پیـشی، گـربە) ژی لکارن.

**پشلنگ(Puşleng):** عـێـبـەلو ـ پاشـڤـەمـای ـ سـست و خـاڤ ـ کەلهـێن کو لسەرێ چیایان دهێنە چێکرن.

**پشم(Peşm):** هری یا مـیـه و حێشترا.

**پشە(Peşê):** پێشی.

**پشـیـز(Peşîz):** پویلەک ـ پارێ هویردە یێ کێم بها.

**پشیمان(Peşîman):** پەشێمان.

**پغنە(Pexne):** پێپکێن پێسترکێ.

**پـف(Puf):** پـف(بـایـێ دەڤـی) ــ وەرمتی، باوی.

**پفج(Pefc)**: ئاڤـــا دەڤی(تف و گلیز).

**پفیوز(Pufyûz)**: زەلامێ سست و تەنبەل و بێ شیان و بێ غیرەت.

**پک(Puk)**: پش(تشتێ کو نیڤا وی ڤـالە بیت)ـ مـەزن، قـەلەو ـ بێـهن(هەوایێ کـو مـرۆڤ یان گیـانەوەر هلدکێشن)ـ لشـوینا (ملق ـ مـێـژ ـ فـڕ)ێ دهێت بۆ جگارکێش و قەلوینکێشا.

**پکر(Peker)**: گێژ ـ سەرگەردان ـ خەمگین.

**پکند(Pekend)**: نان(خـەلکێ خوارەزمێ ڤێ پەیڤێ بکار دئینن).

**پکنە(Pekne)**: قەلەو ـ قەزم(بەژن کورت).

**پگاە(Pêgah)**: سپێدە زوو.

**پل(Pul)**: پر(جسر).

**پل(Pêl)**: پەحنی یا پێی.

**پلاس(Pêlas)**: بەڕک.

**پلخ(Pelex)**: گەوری، حەفک.

**پلخـــتــــە(Pêlexte)**: صافینک(ئامانەکێ کون کونە، کو دەخل و دانی تێدا دشۆن).

**پلشت(Peleşt)**: پیس، دژین، قرێژی، ب کێم و عەداڤ.

**پلغدە(Pelexde-ê)**: رزی، خراب بووی(بۆ هێکا و فێقی بکار دهێت).

**پلک(Pêlk)**: چەرمکێ کـو مژویلانک لسەرن.

**پلگان(Pêllegan)**: پێستـرک، پەییسک، دەرەجک.

**پلمس(Pelmes)**: هێجەت، مهانە ـ درەو، نەوەیی ـ بێبەختی.

**پلنگ(Peleng)**: پلنگ.

**پلوان(Pulvan)**: کـەرتکێن د ناڤـبەرا مـشـار و حـەودان دا(زاراوەکێ جوتیارانە).

**پلوس(Pêlûs)**: زمـانخـوەشی، مەللاقی.

**پلە(Pêllê)**: پلە، پایە(رتبـة، درجة)ـ پێپکێن پێسترکێ.

**پلیتە(Pelîtê)**: فتیلە.

**پلید(Pelîd)**: پیس(نجس).

**پلید ازار(Pelîd êzar)**: زناکەر.

**پناباد(Penabad)**: پارەکێ زیڤی بوو ب کێشا نیڤ مسقالی(نیڤ قران) کـو لسەر زەمانێ قەجەرا دهاتە بکارئینان.

**پناغ(Pênax)**: ئارمـویش، داڤـا ئارمویشی.

**پنام(Penam)**: پەرۆکـەکێ سـپی یێ چوارکـوژی کـو ژ پەنبی دهاتە چێکرن و زەردەشتی یان دئێخستنە بەر دەڤێ خوە و ل پشـتڤە گرێدان لدەمێ کو لهەمبەر ئاگرێ پیرۆز، ئاڤێستا دخواندن ـ ڤەشارتی.

**پناه(Penah)**: پشتەڤان ـ زێرەڤان ـ سیبەرا دیواری.

**پنبە(Penbê)**: پەمبی.

**پنج(Penc)**: هژمارا پێنج(٥).

**پنجـــــاە(Pencah)**: هـژمـــــارا پێنجی(٥٠).

**پنج پا(Penc pa)**: کێڤژاله، قرژال.

**پنجرە(Pencerê)**: پەنجەرە.

**پنجگان(Pencgan)**: پێنج پێنجە.

**پنج گـــــاە(Penc gah)**: ئێـک ژ ئاوازێن موزیکا ئیرانی یە.

**پنجـــــول(Pencûl)**: پەنجـــێن گیانەوەرێن درندە.

**پنچـــە(Punçê)**: ئەنی ـ مـــویێن هنداڤی ئەنیێ ـ ئەو پەرۆکێ کـو ژنک دئێخنە ئەنیا خوە.

**پند(Pend)**: پەند، شـیـرەت ـ ناڤێ فرندەکێ یە کو وەکی قەلێ یە بەس ژ وێ بچویکترە.

**پندار(Pêndar)**: هزر ـ دالغــــە ـ گومان ـ سەیر ـ دفنبلندی.

**پنزە(Penzê)**: داوەت، گۆڤەند.

**پنگ(Peng)**: ئویشـیێ خـورمێ(چ خورمە پێڤە بن یان پێڤە نەبن).

**پنگان(Pêngan)**: پەیاله، فنجـان. هەروەسا (بنگان، فنجان، پیاله) ژی لکارن.

**پنهـــان(Pênhan)**: ڤـەشـارتـی، نەپەن، نەدیار.

**پنیر(Penîr)**: پەنیر.

**پوچ(Pûç)**: خرش.

**پودە(Pûdê)**: کەڤن و پێتی.

**پور(Pûr)**: کور، پس.

**پوران(Pûran)**: ناڤەکە بۆ ژنکا.

**پور دســــتـــــان(Pûrê destan)**: روستەمێ زال.

**پوزخند(Pûzxend)**: ناڤێ جــورە کـەنی یەکی یە کـو بۆ کـێـمکرن و یاری پێکرنێ دهێتە بکارئینان کو بعەرەبی دبێژنێ (استهزاء).

**پوزش(Pûzêş)**: لێبورین.

**پوسـانە(Pûsanê)**: زمـانخـوەشی، مەللاقی.

**پوست(Pûst)**: پویست، چەرم.

**پوش(Pûş)**: خیڤـەتا مەزن ـ پەردە ـ جلک ـ زری و کومزری.

**پوشـاک(Pûşak):** هەر تشـتێ کـو بکەنە بەرخوە.

**پوشال(Pûşal):** پویش و پەلەخ.

**پوشی(Pûşî):** پەڕۆکـەک بوو کـو شـاشک و شـویتک ژێ دهاتنە چێکرن.

**پوشیدن(Pûşîden):** د بەرخوەکرن.

**پوک(Pûk):** خرش ـ پویش و پەلەخ.

**پوکە(Pûkê):** قالکا فیشەکێ.

**پول(Pul):** پر(جسر).

**پول(Pûl):** پارە.

**پولاد(Pûlad):** پیلا.

**پـولـک(Pûlek):** پـویـلـەک ـــ پویلەکێت ماسی ـ کورتکریا پەیڤا (پول: پارە)یە.

**پولکی(Pûlekî):** پارەپەرێس، یێ کو حەژ پارا دکەت ـ بەرتیلخۆر.

**پونگ(Pong):** کیفکو، کیفکویی.

**پوییـــدن(Pûyîden):** غـــاردان، بەزین، بلەز چوون ـ لێگەڕیان و لێڤەکۆلین.

**پە(Peh):** بۆ ســەرســورمــانێ بکاردهێت(پەح، وەح، حـــەو و......هتد).

**پهرو(Pehrû):** پنی.

**پهرە(Pehrê):** زێرەڤانی ـ چاڤدان.

**پهـلـو(Pehlû):** رەخ، ئـال، کـنـار، کێلەک.

**پهـلـو(Pehlev):** مـلـلـەتـێ پـارت؛ هەروەسـا وەکی دبێـژن «پهلوی»، ئانکو پارتی(مـللـەتێ پـارتی ـ بنێـرە: «پارت») ـ شـار، باژێر ـ دلێـر، ب هێـز(ئەو ژی ژ بەر هندێ یە کو پارتی(پهلوی) د مێرچاک و دلێر بوون).

**پـهـلـو دادن(Pehlû daden):** هاریکاریکرن.

**پهلودار(Pehlûdar):** مـــالدار و زەنگینێ کـو کـەس و کـارێن وی خێرێ ژ وی و مالێ وی ببینن.

**پهمزک(Pehmezek):** سیخور.

**پهن(Pehn):** پان، پەحن، بەرین.

**پهن(Pêhên):** پشـکلێ هـەسپ و هێستر و کەرا.

**پهنا(Pehna):** فــــرەهـ، بەریـن ـ فرەهی، پانی.

**پهناور(Pehnaver):** گەلەک پان، بەرین.

**پهند(Pehend):** طەلە، طەلی.

**پی(Pey):** دەمارێن سپی یێن درێژ د لەشێ گیانەوەر و مرۆڤان دا کو ژ دەمـاغ و نخـاعێ دەردکـەڤن و ل

سەر زەڤلەکا بەلاڤە دبن دا هاتن و چوون و لڤلڤین ب رێکا وان بێتە ئەنجامدان، ب عەرەبی دبێژنێ (عصب) ـ شەنگستە، ئاساس ـ لدویڤ، ل پشت ـ پێ (ئەندامەکێ لەشی یە).

**پیاپی (Peyapey):** لدویڤ ئێک، بەردەوام.

**پیادە (Pîyadê):** پەیا ـ د یاریا شەترنجێ دا هەر شازدە جندینە.

**پیادەرو (Pîyadêro):** شوستە، رەسیف.

**پیاز (Pîyaz):** پیڤاز.

**پی افکندن (Pey efkenden):** دانانا بەرێ بنیاتی.

**پیالە (Pîyalê):** پەیالە، فنجان.

**پیام (Peyam):** پەیام.

**پی بردن (Pêy burden):** ڤەدیتن، سەرهلبوون.

**پیجامە (Pîcamê):** بیجامە.

**پیچ (Pîç):** لێک بادای، وەربادای ـ چەمیای ـ بورغی ـ هەر گیایێ کو لدور تشتا بئالیێت.

**پیچپا (Pîçpa):** کێڤژالە، قرژال.

**پیچە (Pîçe-ê):** پۆشی، پێچە، خێلی.

**پیچیدە چشم (Pîçîdê çêşm):** چاڤ وور، چاڤ ویر.

**پیدا (Pêyda):** ئاشکەرا، پەیدا.

**پی در پی (Pêy der pêy):** لدویڤ ئێک، بەردەوام.

**پیر (Pîr):** پیر، دانسال ـ لدەڤ صوفی یا ئانکو (رێبەر و رێ نیشاندەر).

**پیرار (Pîrar):** پێرار، بەری دوو سالا.

**پیراستن (Pîrasten):** خەملاندن.

**پیرامون (Pîramûn):** دۆرماندۆر، دەوروبەر.

**پیراهن (Pîrahen):** فانێلێ زەلاما یان ئەتەکێ ژنکا.

**پیرایشگاە (Pîrayêşgah):** سەرتراشخانە (حلاقە).

**پیروج (Pîrûc):** عەلۆک.

**پیروز (Pîrûz):** سەرکەفتی (د شەران دا).

**پیش (Pîş):** بەر، بەرامبەر، هەمبەر ـ بەری، وەکی: (پیش دم = بەری بێهنەکێ) ـ لجەم ـ حەرەکەکە بەرامبەر (ضمّە) یا عەرەبی.

**پیشاب (Pîşab):** میز، دەستاڤا زراف.

**پیش آمد(Pîşamed):** رویدان(رویدانا کو ژ نشکەکیڤە روی بدەت).

**پیشانی(Pîşanî):** ئەنی ـ بەخت، شەنس ـ ژ هەژی و بسەرڤە ـ دفنبلندی و خوەمەزنکرن ـ تڕانە و گەلتە ـ زڕشەرمی ـ بێ دەلنگی و بێعاری.

**پیشاوند(Pîşavend):** پێشگر.

**پیشرفت(Pîşreft):** بەرەڤ پێشڤە، پێشکەتی.

**پیشکار(Pîşkar):** کەسێ کو لبەر دەستێ بەرپرسەکی مەزن کار دکەت و هندەجارا شۆلێت وی برێڤە دبەت ـ بەرپرسێ دارایی یێ پارێزگەهێ ـ ئەو کەسێ کو د نانپێژخاناڤە نانی ژ تەنویرێ دئینتە دەر.

**پیشکش(Pîşkêş):** خەلات، دیاری.

**پیشگاه(Pîşgah):** دەرازینک ـ بەر تەختێ شاهی.

**پیش گفتار(Pîş guftar):** پێشگۆتن.

**پیشنهاد(Pîşnehad):** پێشنیار.

**پیشوا(Pîşva):** سەرکردە، رێبەر، رێ نیشاندەر.

**پیشواز(Pîşvaz):** پێشوازیکرن.

**پیشوند(Pîşvend):** پێشگر.

**پیشه(Pîşê):** شۆل، کار، پیشە.

**پیشیار(Pîşyar):** خزمەتکار ـ شاگرد ـ هاریکار ـ جێگر.

**پیغاره(Pîxarê):** تەعن.

**پیغاله(Pîxalê):** پەیالە.

**پیغام(Pêyxam):** پەیام.

**پیغامبر(Pêyxamber):** پەیامبەر، پێغەمبەر.

**پیغان(Pêyxan):** پەیان ـ سوز ـ مەرج.

**پیک(Peyk-Pêyk):** پیلک، قاسد.

**پیکار(Pêykar):** شەڕ، جەنگ.

**پیکان(Peykan- Pêykan):** کۆما پیلکا ـ پرتەکا سەرتیژا ئاسنی یە کو دئێخنە سەرێن رما و تیرا.

**پیکر(Pêyker):** کەلەخ، لەش ـ پەیکەر، بوت ـ کەڤال، تابلۆ ـ د زانستێ ماتماتیکێ دا ئانکو(رقم)، بۆ نموونە: (٧٦٥)هژمارەکا سێ رەقەمە(سە پیکر)ی یە کو ژ (٥، ٦، ٧)پێک دهێت.

**پیگرد(Pêygerd):** لدویڤچوون(تعقیب).

**پیل(Pîl)**: فیل.

**پیلپـا(Pîlpa)**: پێ یێن فـیلی ـ خـودانێ پێ یێن مـینا یێن فـیلی ـ ناڤێ ئێشـەکێ یە کـو دکەڤـتە پێن مـــرۆڤـی، ب عـــەرەبی دبێژنێ(داءالفیل) ـ جۆرەکێ چەکی یە وەکی گـورزی یە ـ ستـوینێ کـو دادننە بن بانی ـ جۆرەکێ پەیالا کو مەیێ پێ ڤەدخۆن.

**پیلو(Pîlû)**: سـیـواک(کـو ژ دارا «ئەراک» دهێـتـە چێکرن)، هەروەسـا بۆ فـرچێ ددانا ئەڤـێن دەستکرد ژی دهێتە گۆتن.

**پیلە(Pîlê)**: تەڤنەکێ نازکە کو کرمێ ئارمویشی ژ دەڤێ خوە دئینتە دەر و لدۆر خـوە دپێـچت، ئەڤ تەڤنە ب گـەرمـاتی یەکـا تایبـەت دبیـتـە ئارمـویش ـ ئاڤزە(پدیێن وەرمتی و ئەداڤ گرتی).

**پیمان(Pêyman)**: پەیمان، سـۆز ـ هەڤبەست ـ مەرج.

**پیمودن(Pêymûden)**: رێ ڤـەبرین، قـۆناغ ڤـەبرین(هەروەکی دەمێ رێڤنگەک ژ جـهـەکی ددەتە رێ و تاکـو دگـەهیـتـە جـهێ بێـهنڤـەدانێ، دێ بێـژت من هندە رێ یا ڤەبری)ـ پیڤان، کێشان.

**پینکی(Peynekî)**: هـینشـکـێـت خەوێ.

**پینو(Pînû)**: کەشک.

**پینە(Pînê)**: پنی(پنیـێن جلکا و پێـلاڤـا و......هتـد) ـ پەڤیـشـکێن رەق بووی، کـو ل دەسـتـی دیار دبن ل ژێر کـارتێکرنا زێدە کـارکـرنێ ـ ئەو پنی یا کـو ل ئەنیـا مـرۆڤێ نڤـێـژکـەر دیار دبیت ژ بەر زێدە چوونا بۆ سوجدێ.

**پیواز(Peyvaz)**: شـەڤـرەڤـینک، چەکچەکیلە.

**پیوستن(Pêyvesten)**: پێکڤـە نویسیان، گەهشتنە هەڤ ـ هەردەم.

**پیوند(Pêyvend)**: گەهشتنەهەڤ، پێکڤە نویسـیـان ـ مـرۆڤـاهینی، خـــزمـــانی ـ پـیـک(زاراوەکێ جوتیاری یە ـ پیک کرن ـ).

**پیوندی(Pêyvendî)**: پەیوەندی(عـلاقـات)ـ خـزمـانی ـ دارا کو هاتبیتە پیک کرن.

**پیە(Pîyê)**: دوهن، بەز، دینگ.

**پیەسوز(Pîyêsûz)**: چراکێ ب فـتیلە کـو لشوینا گـازێ، ب دوهنی کـار بکەت.



**ت(Ta):** پیتا چواریٰ یه د ئەلفابێیا زمانیٰ فارسی دا کو مشه جاران دبیته (د)، وەکی: (توت: تود = توی، توختن: دوختن = دورین(بۆ جلکا)، کتخدا: کدخدا = مەزنیٰ گوندی).

**تا(Ta):** ئالاڤیٰ پەیوەندی یێ یه، وەکی: (از مشهد تا تهران = ژ مەشهەدیٰ تا تەهرانیٰ) ـ طا(رەخەکیٰ باری، رەخەکیٰ کاغەز یان پەرۆکیٰ طاکری ـ کت(بەروڤاژی جوٚت) ـ لدویڤ هژمارا دهێت و ئانکویا دانه ددەت، وەکی: (دوتا = دو دانه، سیٰ تا = سیٰ دانه)ـ داڤ(داڤێن بەنکا، داڤێن موی، داڤێن تێلێن سازیٰ«ژەه») ـ هەروەسا ناڤیٰ دارەکیٰ یه ژی کو پەیڤا (داغداغان) پترتر بۆ دهێته بکار ئینان.

**تاب(Tab):** بادانا کو دکەڤیته پرچیٰ و وەریسی ـ روناکی ـ گەرماتی ـ شیان ـ زاخ ـ قرار(بێهن فرەهی)ـ هێزک.

**تاباک(Tabak):** تا(حرارة) ـ دلقوتک ـ نەرەحەتی.

**تابان(Taban):** شەوقدەر(وەکی شەوقا هەیڤیٰ).

**تابستان(Tabêstan):** هاڤین، وەرزیٰ هاڤینیٰ.

**تابوک(Tabûk):** ژۆر، پاشمەزەلک.

**تابه(Tabê):** ئاقلەویک.

**تابیدن(Tabîden):** شەوقڤەدان، تەبیسین ـ تشتیٰ کو بهێته لێک بادان.

**تابین(Tabîn):** بندەست، ژێردەست ـ فەرمانبەر ـ جندی یێ کو چو پلێن لەشکەری نەبن.

**تاپال(Tapal):** ریخا چێلێ.

**تاپو(Tapû):** ئامانەکێ مەزنە کو ژ ئاخا جێرکا دهاتە چێکرن و دەخل و دان دکرنە تێدا.

**تاتا(Tata):** لالوتە، تورتوری.

**تاتلی(Tatêlî):** سوفرە، خوان.

**تاتو(Tatû):** هەسپێ کورتک و تێر موی کو بۆ غاردانێ گەلەک بهێزە.

**تاتورە(Tatûrê):** وەریسێ کو دئێخنە پێن دەوارا و لجهەکی طەول بکەن.

**تاتول(Tatûl):** دەڤ خوەهر.

**تاچە(Taçê):** جهال.

**تاختن(Taxten):** غاردان ـ هێرش برن ـ بەزاندن.

**تاخیرە(Taxîrê):** بەخت، شەنس ـ قەدەر(ئەڤ پەیڤە ب باوەرێن ئۆلی ڤە گریدایە و ئانکوا وێ ئەو نەصیب یان قسمەتە یێ کو پێشدەم یانژی چێتر بێژین بەری بوونا مرۆڤی، بۆ مرۆڤی هاتیە دەسنیشانکرن).

**تار(Tar):** بەنک، دەزی ـ داڤ ـ تەڤنێ تەڤنپیرکێ ـ ئالاڤەکێ موزیکێ یە(بزق)ـ راستکا سەری ـ تاری.

**تارا(Tara):** ستێر.

**تاراج(Tarac):** تالان.

**تاراندن(Taranden):** هاژوتن ـ دوورکرن ـ دەرێخستن ـ بژالەکرن.

**تارتار(Tartar):** ریتال ریتال، پرت پرت، کەرکەر.

**تارتن(Tarten):** تەڤنپیرک، داپیروشک.

**تارک(Tarek):** سەر ـ راستکا سەری. ل هەروەسا پەیڤێن (تار، تارە، کاچک، کلاک، کلال، هباک)ژی لکارن.

**تارم(Tarem):** گونبەد(قوببە) ـ خانیێ ب داراهاتبیتە چێکرن ـ پێسترکا داری یان ئاسنی.

**تارمیغ(Tarmîx):** مژ، مژەوی.

**تاریک(Tarîk):** تاری.

**تاز(Taz):** مرۆڤێ پویچ و بێ بها ـ گەنجێ کو حەژ شۆلێن پویچ بکەت.

**تازاندن(Tazanden):** بەزاندن(بۆ هەسپ و دەوارا دهێت گۆتن).

**تازە(Tazê):** نوو ـ کەیفخوەش و دلڤەکەر ـ گەش.

**تازی(Tazî):** تاژی ـ عەرەب، عەرەبی، وەکی دبێژن: (اسب

تازی = هەسپێ عەرەبی).

**تازیانە(Tazyane):** شلاق(یێ کو دەوارا پێ دبەزینن یانژی مرۆڤا پێ دقوتن).

**تاژ(Taj):** خیڤەت، کوبن ـ نازک ـ خوبن شرین، هەستی سڤک.

**تاس(Tas):** ترارکێ سفری ـ زار(النرد)ـ سەرێ بێ موی، شامی(اصلع)ـ خەم ـ بێ قراری و بێ ئارامی.

**تاسانیدن(Tasanîden):** بێ هێز کرن ـ خەندقاندن ـ بێ دەنگکرن.

**تاسە(Tasê):** خەم ـ بێ قراری و نەئارامی ـ مەهبیران(ئەو حالەتە کو لدەڤ ژنکێن ئاڤز دیار دبت دەمێ کو دلێ وان ژ هندەک تشتا رەش دبیت و هندەک تشتێن دی بۆ دبنە داخواز).

**تافتان(Taftan):** سەوکێت تەنوبرێ.

**تافتن(Taften):** بادان ـ هلکرن و شەوقڤەدان ـ شاراندن و سۆرکرن.

**تاک(Tak):** دارا تری(دارمێو).

**تاکستان(Takêstan):** رەزێ تری.

**تالاب(Talab):** حەود ـ مەلەڤانگەه.

**تالار(Talar):** ژۆرا مەزن، هۆل.

**تاوان(Tavan):** تاوان.

**تاول(Tavel):** پەقیشک(ئەڤێن کو لسەر دەستی دیار دبن)ـ گۆلک، گۆلکێ نێر.

**تاهو(Tahû):** مەی، عەرەق(یا کو ژ ئاڤا مێویژا هاتبیتە چێکرن).

**تب(Teb):** تا(حرارة).

**تبار(Tebar):** نەژاد، خانەدان، بنەمال.

**تباسیدن(Tebasîden):** ژ بەر زێدەبوونا گەرمێ ژ حالچوون، فەراک، ئەلەمک.

**تبانی(Tebanî):** دەست دانە هەڤ ژ بۆ بهەڤرا ب کارەکی رابن.

**تبخال(Tebxal):** تامێسک، شەڤترسک.

**تبر(Teber):** تەڤر، تەبەرک.

**تبرک(Tebrek):** کەلە.

**تبست(Tebest):** خراب بووی(فاسد) ـ بێ کەلک و ژ کارکەفتی.

**تبستغ(Tebestux):** کەسێ کو بلەز باخڤیت.

**تبشی(Tebşî):** فەرخە سێنی(سێنی یا مەزن).

**تبند(Tebend):** فەند و فێل، حیلە.

**تبنگ(Tebeng):** طەبەکێن فێقی یێن کو ژ شڤکێن داری بهێنە چێکرن(طەبەک، سەلک، زەنبیل، سەڤی و......هتد)ـ دەف و داهۆل ـ هەروەسا دەنگێ زەنگل و چنگ(ناقوس)ێ یە ژی. هەروەسا پەیڤێن (تبکان، تنگان، تبوک، تپنگ و تبنگو) ژی لکارن.

**تبوراک(Tebûrak):** دەف ـ داهۆلا بچویک ـ بازنە(دایرە).

**تپانچە(Tepançê):** شەق، زللەه(یێن کو مرۆڤ ب دەستی دادنتە رویێ کەسەکێ دی)ـ دەبانجە، وەروەر.

**تپنکوز(Tepenkûz):** دەبەنگ، حوتک، بێ فەهم.

**تپە(Teppê):** گر، تەل.

**تپیدن(Tepîden):** لەرزین ـ بێ قەراری، نەئارامی ـ دلقوتک.

**تتربو(Tetrebû):** ترانە، یاری.

**تتری(Tutrî):** سماق.

**تتق(Tutuq):** خیڤەت، کوین.

**تجارە(Tecare-ê):** جانیکێ هەسپی، یێ کو هێشتا زین لێ نەکربیت.

**تخت(Text):** کورسیکا شاهینیێ.

**تخت اردشیر(Textê Erdeşîr):** ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن کەڤنێن موزیکا ئیرانی یە.

**تختخواب(Textêxab):** تەختێ نڤستنێ.

**تختە(Textê):** دەپێ داری ـ هەر تشتێ کو راست و پەحن بت، وەکی:(مەحفویرا، پارچێن ئەردی، وەرەقێن مەزنێن کاغەزی یان ئاسنی و......هتد)ـ فەرشێ کو مریا لسەر دشۆن ـ تابووت.

**تخجم(Texeccum- Tex-cum):** نە پیروز، پێ برەشک، بێ یوم، بێ ئیفلەح.

**تخس(Texs):** گەرمی، تا(حرارة)ـ دلقوتک ژ بەر خەم و کوڤانا.

**تخش(Texş):** تیر، تیرو کڤان ـ سەرێ جڤاتێ.

**تخشا(Tuxşa):** بزاڤکەر.

**تخشایی(Tuxşayî):** کارگەها چێکرنا چەکی.

**تخلە(Texle-ê):** گۆپال ـ هویرهویرک و پرت پرت.

**تخم(Tuxm):** طۆڤ(بذر ـ نطفە)ـ

هێک ـ گون، رطلێن مرۆڤی یان گیانەوەرا.

**تخمه(Tuxme-ê)**: نەژاد، بنیات ـ تۆفکێت زەبەش و گوندۆر و کولندا.

**تر(Ter)**: نیشانا هەڤبەرینێ، وەکی: (بهتر = باشتر، بزرگتر = مەزنتر، مهتر = چێتر)ـ نوی ـ تەڕ، شل(بەرۆڤاژی هشک).

**ترا(Tera)**: دیوار ـ سکر.

**تراز(Teraz)**: خەمل ـ نەخش و نیگارێن لسەر پەڕۆکا ـ میزانا بەنناى.

**ترازو(Terazû)**: ترازی.

**تراشیدن(Teraşîden)**: تراشین.

**تراک(Terak)**: شەق شەق بووی ـ دەنگێ کو ژ شکەستنا تشتەکی رادبیت، هەروەسا بۆ دەنگێ برویسی یا ژی لکارە.

**ترانه(Teranê)**: سروود ـ ئاواز ـ هۆزانا دوریزی(دو بەیتی)ـ تەر و طول ـ دلبەرا جوان ـ طولازێ روی دەلال.

**تراهی(Terahî)**: فێقیێ ژ نوی بگەهیت.

**ترب(Turub)**: تفرێت مەزن.

**تربچه(Turubçê)**: تفرێت بچویک.

**تربسه(Terbesê)**: کەسکوسور، کەسکوئالا(قوس قزح).

**ترد(Turd)**: تەنک، هەر تشتێ کو زوی بشکێت.

**تردامن(Terdamen)**: دەهمەن پیس، قەحبە.

**ترس(Ters)**: ترس.

**ترس(Turus)**: ئەردێ رەق کو کولانا وێ ب زەحمەت بیت.

**ترسا(Tersa)**: یێ کو بترسید ـ مەسیحی ـ عیبادەتکەر و خودێناسێ ئۆلێ مەسیحی یە، کو د دێرێ ڤە دروینت و ل وێرێ ب طاعەت و عیبادەتی مژویل دبت(راهب).

**ترسو(Tersû)**: ترسنوک، کولافە.

**ترش(Turş)**: ترش.

**ترشک(Turşek)**: ترشۆک(گیایەکە).

**ترشیدن(Turşîden)**: ترش بوون.

**ترغ(Turux)**: هەسپێ رەنگ سۆر.

**ترغو(Terxû)**: جۆرەکێ حەریرێ رەنگ سۆر.

**ترفنج(Terfenc)**: دژوار، رێکێت

ئاسێ، ئاستەنگ.

**ترفند(Terfend):** فەند و فێل ـ درەو ـ قەلپ، سەختە ـ ئاخفتنێن بێ مەعنە.

**ترقە(Tereqqê):** تەقتەقوشک.

**ترک(Terek):** شەق شەق، دەرزتی ـ خەندەکا کو لدۆرماندۆری کەلهێ دهێتە کولان ـ نمیای ـ تەڕ، شل ـ کچکا نە شوی کری ـ جۆرەکێ حەلاوێ یە.

**ترک(Terk):** کومزری (کولاڤێ ئاسنی کو شەرڤانا دشەڕا دا دکرنە سەرێ خوە )ـ پاتکا سواری دەمێ کو ل هەسپی سوار.

**ترکش(Terkeş):** کیسکێ کو تیرا دکەنە تێدا (تیردانک).

**ترکە(Terke-ê):** شڤک، ترک.

**ترکیدن(Terekîden):** دەرزین ـ شکەستن ـ پەقین.

**ترلک(Têrlêk):** قەمیسێ هچک کورت ـ نەعال، شمک.

**ترمە(Têrme):** شال، جۆرەکێ پەرۆکی یە.

**ترمە(Terme- Turme):** تەحتیێ زینا هەسپی.

**ترنانە(Ternanê):** تەشریب (جورەکێ خوارنێ یە ).

**تروال(Terval):** چقێ زراڤ یێ دارێ ـ بەلگێ شینکاتی یا.

**تروند(Tervend):** فێقیێ نوی گەهشتی.

**ترەبار(Terêbar):** هەمی رەنگێن فێقی و شینکاتیێن خوارنێ.

**تریت(Terît):** تەشریب، نانێ هویرهویرکری د ناڤ ئافکێ، شیری یان ئاڤەماستێ دا.

**تریز(Têrîz):** دەهمەنا جلکی، دانگ.

**ترین(Terîn):** نیشانا هەڤبەرکرنێ، وەکی: (بهترین = باشترین، داناترین = زاناترین).

**تریوە(Terîve):** رێکا پڕ کەند و کۆر.

**تز(Tez):** ددانکێت کلیلێ ـ فرندەکێ خوەشخوانە ـ کەچەل، شامی (اصلع).

**تژدە(Tejde):** دەستحەقێ کو ئاشڤان وەردگریت بەرامبەر ئارکرنا گەنمی ـ دەستحەقێ کو ئاشچێکەر وەردگریت بەرامبەر تیژکرن یان چێکرنا ئاشی.

**تس(Tus):** بایێ کو بێ دەنگ ژ

قۆنێ دەرکەڤیت ـ تف، گلیز.

**تس(Tes)**: شەق، زللەھ.

**تساچە(Tesaçê)**: تیمساح ـ نەھەنگ.

**تسمە(Tesmê)**: قایشا چەرمی، کەمەربەندا چەرمی.

**تش(Teş)**: کورتکریا پەیڤا (آتش = ئاگر)ـ تەبەرک، تەڤرک.

**تش(Têş)**: تێهنی.

**تشت(Teşt)**: تەست.

**تشتر(Têşter)**: د ئایینێ زەردەشتی دا ناڤێ فریشتا بارانێ یە.

**تشلیخ(Teşlîx)**: جێ نڤێژک، سوجادک، شەملک.

**تشنک(Teşnek)**: ئەو جەھ ژ ھەستیێ سەری یێ کو ل بچویکاتیێ نەرم.

**تشنە(Têşnê)**: تێهنی.

**تشی(Teşî)**: سیخور.

**تشیرە(Teşîrê)**: تەبەل، مەرمەر(ئێک ژ پێ یاریکێن بچویکایە).

**تف(Tef)**: گەرمی ـ ھلم(بخار)ـ رۆناھی.

**تف(Tuf)**: تف، گلیز.

**تفالە(Tufalê)**: سومارتە.

**تفت(Teft)**: گەرم ـ ب جم و جۆل ـ ب لەز.

**تفتان(Teftan)**: گەرم و شاریای ـ کەرەکێ نانی ـ ناڤێ چیایەکی یە ل سەر توخیبێ ئیران و ئەڤغانستانێ کو جارجارا ھلما گەرم ژ دەڤێ وی دەردکەڤیت.

**تفتە(Teftê)**: تەڤنێ تەڤنپیرکێ ـ گەرم بووی.

**تفتیک(Teftîk)**: ھری یا نەرم.

**تفسە(Tefsê)**: پنیکێن رەش یێن کو ل سەر رویێ مرۆڤی دیار دبن ـ خەم و دل کەسەری ـ بنێرە: (تاسە).

**تفش(Tefş)**: شێرەتکرن، نسحەتکرن، گازندە ژێکرن.

**تفنگ(Tufeng)**: تڤەنگ.

**تک(Tek)**: کت ـ تنێ ـ ئێکانە ـ کێم ـ بن(قعر)ـ غاردان.

**تک(Tuk)**: نکلێ فرندا ـ سەرێ تیژێ ھەر تشتەکی وەکی شویژن و خەنجەر و رم و......ھتد.

**تک(Têk)**: پاری.

**تکاپو(Tekapû)**: ڤەکۆلین، لێگەریان.

**تکان(Têkan)**: لڤلڤین، لەرزین.

**تکاور(Tekaver):** بەزۆک، یێ کو دکەتە غار ـ هەسپێ کو حێل بکەتە غار.

**تک تک(Tek tek):** ئێک ئێکە.

**تکژ(Tekej):** تۆڤێ دناڤ بەرکێ تری دا.

**تکل(Tekel):** میها ب شاخ ـ زەلامێ گەنج و بەژن بلند، زەلام باش.

**تک لپە(Tek leppê):** ئێک لب(هەر گیایەکێ کو دندکا وی ئێک لب بیت، وەکی: گەنمی و جەهی و......هتد).

**تکمار(Tukmar):** تیرا کو سەرکێ تیژ پێڤە نەبیت.

**تکمە(Tukmê):** مەهیک، قومچە، قولپک ـ ئالاڤەکێ بچویکە کو هەرگەر بدەوسینن دێ گلوپ هەل بیت یان زەنگ هێتە لێدان و......هتد(پلاک).

**تکند(Tekend):** کۆلکێ مریشکا.

**تکو(Tekû):** مویێ خەلەک و قژاڤژ ـ نانێ دوهن دای.

**تکوک(Tekûk):** جاما مەیێ، جاما عەرەقێ.

**تکە(Têkkê):** پرت، کەر ـ پاری.

**تکە(Tekkê):** بزنێ نێر ـ بزنێ کو ڤ بەر پەزی دکەڤیت(سەرکێشێ پەزی).

**تکیدە(Tekîdê):** لەغەر، لاواز، زراف.

**تگرگ(Tegerg):** گژلوک.

**تگل(Têgel):** پنی یێن کو دئێخنە جلکێن دریای.

**تلاتوف(Telatûf):** پیس و قرێژی ـ دەنگ و دۆر و قەرەبالغ.

**تلاش(Telaş):** بزاڤ، پێکۆل.

**تلالا(Telala):** دەنگ ـ گازی ـ ئاواز ـ سترانبێژی.

**تلان(Tellan):** گەلەک قەلەو، بخوەڤە.

**تلغ(Telx):** تەحل ـ مرۆڤێ بێ لۆق و بێ طبعەت.

**تلخە(Telxê):** زەرداف.

**تلکە(Telekê):** پارێ کو ب فەند و فێل ژ ئێکی هاتبیتە ستاندن.

**تلمبە(Tulumbê):** ئالاڤەکە کو ئاڤێ پێ ژ بیرێ دکێشنە دەر(پەمپە).

**تلنگ(Teleng-Tuleng):** داخواز ـ ئارەزوو ـ پێویستی ـ گەدایی، خاستن، هەروەسا پەیڤا

(تلنه) ژی لکاره.

**تلو تلو(Têlu-têlu)**: هەژهەژۆک، تی و تی برێڤەچوون(دەمێ مرۆڤ سەرخوەش دبیت).

**تلوک(Telûk)**: ئارمانج.

**تله(Tellê)**: طەلە، طەلی.

**تله(Têllê)**: دەرەجک، پێپکێن پێسترکێ.

**تلی(Tulî)**: کیسکێ کو دەرزیک و بەنکا بکەنە تێدا.

**تم(Tem)**: تاریاتی ـ رەشاتی ـ هلم، مژ ـ نەخوەشی یەکا چاڤی یە.

**تماخره(Temaxerê)**: ترانه، یاری، سحبەت.

**تماغه(Tumaxê)**: کولاڤ.

**تمرگیدن(Temergîden)**: ئاخفتنەکا کولانکی یە ئانکو روینشتن، بۆ نموونە هەگەر مامۆستا بێژیتە قوتابیێ تەنبەل روینە، دێ بێژیتێ: «بتمرگ = Bêtemerg)، کو نێزیکی (وەلی بە، بقەلعە)یا مەیە.

**تملیت(Temlît)**: سەرباک ـ رەخەکێ باری.

**تمنده(Temende)**: لالوتە، تورتوری.

**تمنه(Temene)**: شویژنا کو لحێفا پێ ددروین.

**تموک(Temûk)**: ئارمانج ـ جۆرەکێ تیرا کو سەرێ وان پەحن بوو و هەگەر چووبا د لەشی را ب ساناهی ژێ نەدهاتە دەر.

**تن(Ten)**: لەش، کەلەخ، بەروبەدەن.

**تناور(Tenaver)**: قەلەو ـ ب هێز(بۆ مرۆڤ و گیانەوەر) و ئازا(بۆ دارا).

**تنبان(Tenban)**: شەلوال، بێجامە.

**تنبسه(Tenbesê)**: مەحفویر، فەرش.

**تنبک(Tunbek)**: طمبلک(ئالاڤەکێ موزیکی یە).

**تنبل(Tenbel)**: تەمبەل، کەسلان، بێ کار، کەدوەر.

**تنبل(Tunbul)**: فێل، حیله ـ جادوو(سحر).

**تنبو(Tenbû)**: جۆرەکێ خیڤەتایه.

**تنبور(Tenbûr)**: تەمبویر(ئالاڤەکێ موزیکی یە)، هەروەسا (دنبره) ژی لکاره.

**تنبوشه(Tenbûşê)**: بۆرییا کو ژ

ئاخا جێرکادهێته چێکرن و د ناڤ ئاڤاهیا دا بکار دئینن.

**تنبـوک(Tenbûk):** ئەو رەختێ زینا هەسپی یێ کو (رکاب) پێڤە بیت.

**تنبـیـدن(Tenbîden):** لەرزین ـ هەرفین ـ دلقوتک.

**تنخـواه(Tenxah):** پارە ـ زێر ـ متا.

**تند(Tund):** تیژ و برەک ـ چست و چەلەک ـ طام تیژ، وەکی طاما فلفلێ ـ بێ طبعەت، تۆڕە ـ نەترس ـ بەلاکڕ ـ بلنداهی.

**تنداب(Tundab):** بەزەک(ئاڤا کو لسەر ئەردی یان د مشارا دا ببەزیت ژ بەر سەرنشیڤی یا وان) ـ تێزاڤ.

**تندباد(Tundbad):** هرەبا، تۆفان.

**تندبار(Tundbar):** گیانەوەرێ درندە و گەزندە یان لەقەهاڤێژ و پێڤەدەر، گیانەوەرێ ئازارگەهینەر.

**تندخو(Tundxû):** بەدفەڕ، بێ سنج ـ تۆڕە.

**تندر(Tunder):** دەنگێ گرگرا ئەورا، یان هەر تشتێ کو وەکی ئەورا گرگرێ بکەت.

**تـن دردادن(Ten derdaden):** رازی بوون(یێ کو بەریکێ هندی مابنە پێڤە کو ب کارەکی رابیت لێ وی قەبوول نەدکر و ل داوییێ رازی ببیت کو وی کاری بکەت).

**تندرست(Ten durust):** ساخلەم، لەش ساخ.

**تندرو(Tundrû):** یێ کو بلەز بچیت ـ تۆرە(یێ کو زوی بفوبریێت) ـ بێ ترس ـ لێڤ و لامتۆر شۆڕ ـ بەخیل.

**تنده(Tunde):** سەرنشیڤ، ژۆردانی ـ بشکوژ ـ بەلگێ دارێ یێ کو ژ نوی دەردکەڤیت.

**تنديس(Tendîs):** وەکی لەشی ـ پەیکەر، بوت.

**تنزيب(Tenzîb):** فانێلە ـ پەرۆکێ سپی کو فانێلا ژێ چێدکەن یان دادننە سەر برینا.

**تنک(Tunuk):** تەنک ـ پەحن ـ کێم جە ڤەگر.

**تنکه(Tunuke):** دەرپێ کورت، تەبانە.

**تنگ(Teng):** تەنگ(جهێ تەنگ) ـ دۆل، نهال ـ تەنگا دەوارا ـ جهال ـ بار، خرار، بۆ نموونە دبێژن: (تنگ شکر = بارێ

شـەکـرێ کـو دڕکـەیە ژ لێـڤـێن دلبەرێ).

**تنگ(Tung)**: گوزک، جەڕک.

**تـنـگـاتـنـگ(Tengateng)**: دناڤێکرا، د بنێکرا.

**تنگبیز(Tengbîz)**: بێژینک.

**تـنـگـنـا(Tengna)**: جـهـێ تـەنـگ(کـولانا تـەنـگ، رێکا تـەنـگ)ـ تـەنـگـی ـ دژواری ـ جەخت، فشار.

**تنگە(Tengê)**: جـهـەکێ تەنگ ژ دەریایێ د ناڤبەینا دو هشکیا دا کو دو دەریایا بگەهینتە ئێک، ب عـەرەبی دبێـژنێ «مـضـیق»، وەکی(تنگەء هرمـز = مـضـیق هرمـز، تنگەء سـوئز = مـضـیق سـوئز) ـ پرتەکا بچـویک ژ زێری یان زیڤی.

**تنگیـاب(Tengyab)**: تشـتێ کـو بزەحمەت بدەست بکەڤیت.

**تنو(Tenû)**: زاخ، شیان.

**تنور(Tenûr)**: تەنویر.

**تنورە(Tenûrê)**: جـوٚرەکێ جل و بەرگێ شەڕی یە.

**تنوز(Tenûz)**: شکەن، دەرز.

**تنومند(Tenûmend)**: بخـوەڤـە، قەلەو ـ بەژن بلند ـ ب هێز ـ ئازا.

**تنە(Tenê)**: لـەشێ مـرۆڤی ـ دار(هەر ژ ئەردی تا چقـا)ـ تەڤنێ تەڤنپیرکێ.

**تـنـهـا(Tenha)**: کت ـ تنێ ـ ئێکانە.

**تنیزە(Tenîzê)**: دەهمـەن، دەهمـەنا چیای یان دەشتێ.

**تو(To)**: تو(جـینـاڤێ دووێ یێ کت).

**تو(Tû)**: تێدا، دناڤدا.

**تواسی(Têvasî)**: مـەحـفـویرا ب نەخش.

**توان(Tevan)**: هێز ـ زاخ ـ شیان.

**توانا(Tevana)**: یێ ب هێـز ـ یێ ب زاخ ـ یێ ب شیان.

**توانستن(Tevanêsten)**: کـارین، شیان، پێ چێبوون.

**توبان(Tûban)**: ئەو دەرپیێن کورت یێ کـو وەرزشـڤـان دکـەنە پێ خـوە لدەمێ یاریا خوە لێکدانێ.

**تویرە(Tûbreh)**: چنـتـکێ کـو نێچیرڤان یان رێڤنگ خوارنا خوە یان کەلوپەلێن نێچیرێ دکەنە تێدا و ب ملێ خـوەڤـەدکـەن ـ جـهـوٚرێ کای و جەهی(جهوٚرێ دەوارا).

**تویە(Tûbe):** کەسکوسۆر، کەسکوئالا(قوس قزح).

**توپ(Tûp):** تەپە ـ توبا پەرۆکی ـ تۆپ(کو وێ ژی رەنگێن خوە هەنە، وەکی: تۆپا نەمساوی، تۆپا ١٠٦ملم و تۆپا ١٢٠ملم و......هتد).

**توت(Tût):** توی.

**توتک(Tûtek):** طوطی، بەبەغاـ پشکەک ژ بلوولێ کو شڤان موزیکێ پێ لێددەن ـ سندوقا پارا، گەنجینە.

**توچال(Tûçal):** کونبەفر.

**تودە(Tûdê):** گر ـ تەل ـ کۆما خەلکی.

**تور(Tûr):** تۆر، وەکی تۆرا ماسی یا ـ د چیروکێن شەهنامێ دا ناڤێ کورێ ناڤە یێ فرەیدونی یە کو (تورج) ژی دبێژنێ ـ دلێر و پەهلەوان.

**تورک(Tûrek):** طوری، توبری(گیانەوەرەکێ درندەیە).

**توریدن(Tûrîden):** شەرمین بوون ـ رەڤین، هەلاتن ـ دویرکەفتن.

**توسن(Tûsen):** شەمبۆز.

**توش(Tûş):** خوەلبەرگرتن ـ هێز ـ زاخ ـ لەش، بەدەن ـ زاد.

**توشک(Tuşek):** دۆشەک.

**توشکان(Tûşkan):** ئاگردانکا حەمامێ.

**توشە(Tûşê):** زاد، خوارنا هندک، خوارنا کو رێڤنگ بۆ دەمێن پێدڤی دگەل خوە هلدگرت.

**توشی(Tûşî):** ئەو پێکڤەخوارنا کو هەرئێک خوارنا خوە دانیتە سەر سوفرێ و پێکڤە خوارنێن هەڤدوو بخۆن.

**توغ(Tûx):** ناڤێ دارەکێ یە کو بۆ سوتنێ دهێتە بکارئینان ـ ئالا(علم) ـ نیشانە(علامة).

**توف(Tûf):** هەوار و فریاد ـ دەنگ و دۆر ـ قەرەبالغ و هۆسە.

**توفال(Tûfal):** پرتە دەپێن بچویک کو لسەر گاریتێن بانێ خانی رادئێخن و ئاخێ دکەنە سەر.

**توفان(Tûfan):** تێک هاتن و تێکچوون ـ دەنگ و هەرا ـ ڤێککەڤتنا هەوای و بایێن دژوار ـ رابوونا ئاڤێ و لەبیزتنا پێلێن دەریایێ.

**توک(Tûk):** کولەکا موی یان هریێ ـ پوچک یان مویێ هنداف چاڤێ

هەسپی ـ چاڤ.

**تول(Tûl)**: رەڤین، هەلاتن.

**تولک(Tûlek)**: زیرەک، چەلەنگ ـ مریشکا کو پەرێن وێ وەریابن.

**توله(Tûlê)**: تویلە یان کویچکێ سەی و طوری(تویری)یا.

**تونی(Tûnî- Tûnêyî)**: خەلکێ «تون» (باژێرەکێ ل دەڤەرا خوراسان کو نوکە دبێژنێ «فردوس»)ـ ئاوارە ـ دز، رێگر.

**تویل(Tevîl)**: سەر شامی(اصلع) ـ ئەنی ـ راستکا سەری.

**تـه(Teh)**: بن، وەکی (بنێ دەریایێ).

**تهک(Tehek)**: ڤالە، خالی ـ رویس، تازی ـ توز و غوبار ـ ئەرد، گویا زەمین.

**تهم(Tehm)**: ب زاخ، ب هێز ـ مەزن، ب کەلەخ ـ بێ هەڤتا د مەزناهی و دلێری وئازاتییێ دا.

**تهی(Tuhî)**: ڤالە، خالی.

**تیان(Têyan)**: مەنجەلا مەزن.

**تیب(Tîb)**: سەرگەردان، حەیران.

**تیبا(Tîba)**: ناز و نازداری ـ فێل و فند ـ ترانە.

**تیپ(Tîp)**: دەستەکەکا رێک و پێک ژ خەلکی ـ زاراوەکێ لەشکەری یە.

**تیتال(Tîtal)**: فێل و فند ـ مەللاقی.

**تیج(Tîc)**: کاتێن دارێ ـ ئارمویشێ خاڤ.

**تیر(Tîr)**: تیر(تیرا کڤانێ)ـ تەلقە، فیشەک، گوللە ـ گاریتە ـ باهر، پشک ـ ناڤێ ستێرا(عطارد) ـ ناڤێ مەها چوارێ یە ژ سالا هەتاڤی و سەرێ وەرزێ هاڤینێ یە ـ ناڤێ رۆژا سێزدێ یە ژ هەمی مەهەێن سالا هەتاڤی ـ ژ بەر کو د کەڤن دا ناڤێ هەیڤا دەستپێکا وەرزێ پاییزێ (تیر) بوو، لەورا دگۆتنە پاییزێ ژی (تیر) ـ تاری.

**تیرست(Tîrset)**: هژمارا سێ صەد(٣٠٠).

**تیره(Tîrê)**: بنەمال، خانەدان، دەستەکەک ژ مرۆڤا کو ژ نەژادەکی یان ژ نەتەوەکی بن ـ تاری، رەنگ رەش.

**تیریز(Têyrîz)**: دەهمەنا جلکی، دانگ ـ چەنگ و پەرێن مریشکێ.

**تیز(Tîz)**: برەک، تیژ ـ چست و

چەلەک، حیّل و بەزەک ـ تیژ(بۆ طامیٚ) ـ بایێ ب دەنگێ کو ژ قۆنێ دەردکەڤیت.

**تیشه(Tîşê):** تەبەرک، تەڤرک.

**تیغ(Tîx):** شیر، شمشیر ـ دەڤک(موس) ـ ستری، درک ـ بلنداهی و سەرێ چیای ـ تیروژکێن تاڤێ(شعاع الشمس).

**تیغال(Tîxal):** هێلینا فرندا.

**تیغه(Tîxê):** هەر تشتێ کو وەکی دەڤکی تیژ و برەک بت ـ ناڤبر(دیوارکێ تەنک).

**تیکوز(Tîkûz):** کەشک.

**تیل(Tîl):** خال(نقطه).

**تیلا(Tîla):** وەریس، ئالاڤێ وەریس بادانێ.

**تیله(Tîlê):** تەبەل، مەرمەر(پێ یاریکەکا بچویکایه).

**تیم(Tîm):** جهەکێ مەزن کو بازرگان ل وێرێ بازارا بکەن ـ خەمخوری، دلتەنگی.

**تیمار(Tîmar):** سەرەگوهی و چاڤدێری و برین پێچی یا نەخوەشێ بریندار ـ خەمخوری، دلسوژی ـ هزر(فکر) ـ ئێش و رێنج(وەستیان، زەحمەت، وەکی: رێنجبەر = یێ کو خوە دواستینیت ل پێناڤ کارەکی، زەحمەتکێش).

**تیمارستان(Tîmarêstan):** شێتخانه(شماعي).

**تیمسار(Tîmsar):** پلەیەکە بۆ ئەفسەرێن لەشکەری کو ژ (سرتیپ)ی مەزنترە ـ جەناب(حضرت).

**تیموک(Tîmûk):** لێڤ شۆر، گرتی، بێ مەعد.

**تیوا(Tîva):** بێ ترسی، بێباکی.



**ث:** ئەڤ تیپە نە د زمانێ كوردی و نە ژی د زمانێ فارسی دا نینە و چ پەیڤا د ناڤ زمانێ فارسی دا ب بەرچاڤ بكەڤت كو ئەڤ تیپە د ناڤ دا بیت، هەگەر مرۆڤ لدویڤ بچیت دێ بینیت كو ئەو پەیڤە د بنەڕەت دا عەرەبی نە. هەروەسا هندەك پەیڤ ژی، پەیڤێن دارشتی یان لێكداینە ژ زمانێ عەرەبی و زمان و پاشگرێن فارسی، وەكی ڤان نموونێن ل خوارێ د دیار.

بۆ زانین بلێڤكرنا ڤێ تیپێ لجەم فارسان هەروەكی بلێڤكرنا (س، ص)ە، ئانكو هەمان (S) دهێتە بلێڤكرن.

**ثابت(Sabêt):** موكوم، بنەجە.

**ثابت ساختن(Sabêt saxten):** سەلماندن، راڤەكرن.

**ثابت شدن(Sabêt şuden):** راست و دروست بوون ـ دیاربوون، سەلمین.

**ثابتە(Sabête):** ستێرا نەلڤ یان ژی مرۆڤ تێ نەئینتە دەر كو یا دلڤیت.

**ثافل(Safêl):** رەپالهان ـ هەر تشتێ كو ب بن بكەڤیت(ب تایبەتی د ئاڤێ دا).

**ثالث(Salês):** سێ یەم.

**ثامن(Samên):** هەشتەم، هەشتەمین.

**ثانی(Sanî):** دویەم.

**ثانیە شمار(Sanîyê şumar):** چركەژمێر(میلێ دەمژمێرێ كو بەس چركا دیار دكەت).

**ثبت(Sebet):** هێجەت، مهانە ـ جهێ باوەریێ، زەلامێ جهێ باوەریێ.

**ثبور(Subûr):** پویچ بوون، هیلاک

بوون، نەمان.

**ثـــروتمـــنـــد(Servetmend):** سەرمایەدار، دەولەمەند، زەنگین، هەیی.

**ثری(Seryî):** زەنگین، دەولەمەند، زەلامێ ماڵدار.

**ثفل دان(Sufldan):** ئامانێ کو بلغەم و ئاڤا دەڤی بکەنێ.

**ثقافت(Seqafet):** زیرەک و چست و چالاک بوون، ماهر و شارەزابوون.

**ثناخوان(Senaxan):** مەدحکەر، کەسێ کو پەسن و سالوخێن تشتەکی یان کەسەکی بدەت.

**ثوابکار(Sevabkar):** قەنجیکار، کەسێ کو کارێن باش و ب خێر دکەت.

**ثیران(Sîran):** گا یێن نێر.

# ج

**ج(Cîm):** هنده جارا دبیته (ز)، وەکی: (ارج = ارز: بها، قەدر و قیمەت)، هنده جارا دبیته (ژ)، وەکی: (کج = کژ: خوەهر)، هنده جارا ژی دبیته (گ)، وەکی (آخشیج = آخشیگ: عنصر یانژی هەر ئێک ژ چوار عنصرێن(ئاف، ئاگر، با، ئاخ)).

**جا(Ca):** جه ـ مەقام، پایە، پلە.

**جابجا(Cabêca):** جێبەجێ ـ د دەم دا، دەملدەست، ئێکسەر ـ هنده جها، وەکی: (جابجا باران آمده بود: هنده جها باران هاتبوو و هنده جها نەء).

**جاجیم(Cacîm):** جۆرەکێ پەرۆکی یە ـ بەڕک.

**جاخسوک(Caxsûk):** شالۆک.

**جادنگو(Cadengû):** بەڕەڤان ـ خزمەتکارێ پەرستگەهێ.

**جادو(Cadû):** سێحر، جادوو.

**جادوزن(Cadû zen):** ژنا سێحرەبەند ـ ئەو کەسێ کو سێحرێ بەتال کەت.

**جادوگر(Cadûger):** جادووگەر، سێحرەبەند.

**جارختی(Carextî):** رستا جلکا، یان هەر جهێ جلکا لێ هلگرن.

**جارو(Carû):** کورتکریا پەیڤا لێکدایا (جا روب = جا روبنده) ئانکو: جه پاقژکەر، گێسک، جەریفک.

**جاروجنجال(Caro cencal):** هەوار و قیڕین، هۆسە و قەرەبالغ، دەنگ و دۆر.

**جاری(Carî):** ژن تی(ژن برایا مێری).

**جاست(Cast):** ئیسل(جهێ کو تری بکەنێ و ب پیاڤە بچنە سەر دا

ئاڤێ ژێ بگرن).

**جاشدان(Caşdan)**: کوار.

**جاف(Caf)**: قەحبە، جفت (ژنا خرابکار، ژنا کو ب زەلامەکی ب تنێ تێر نەبیت).

**جاکار(Cakar)**: زەڤی یا کو هەرسال بێتە چاندن(زاراوەکێ جوتیاری یە).

**جال(Cal)**: تەلە، تەلی.

**جالیز(Calîz)**: وەرزێ گوندۆر و زەبەش و خیارا.

**جام(Cam)**: جاما شەرابێ ـ خودیک و شیشە.

**جام جم(Camê Cem)**: د داستانێن ئیرانی یێن کەڤن دا جاما (جەمشید)ێ شاهێ پیشدادی یانە کو نەخشەیێ جیهانێ لسەر بوو و هەمی جیهان تێڕا ددیت.

**جامە(Camê)**: پەرۆکێ دروی یان نەدروی، جل و بەرگ ـ پەیالە ـ گوزکێ مەیێ.

**جامەدران(Camêderan)**: ئێک ژ ئاوازێن کەڤنێن موزیکا ئیرانی یە؛ دبێژن ئەڤ ئاوازە ژ دانانا (نەکیسا)ی بوو کو دەمێ ئەڤ موزیکە دهاتە لێدان، ئامادەبوویا جلک د بەرخوەدا ددڕاندن.

**جامەء غوک(Camêyê xûk)**: کەڤز.

**جامەکن(Camêken)**: جهەکە د حەمامێ ڤە کو تێڤە جلکا ژ بەرخوە دکەن ـ رێگر.

**جان(Can)**: جان، گیان، ئەو تشتێ کو لەش پێ زیندی.

**جانا(Cana)**: گیانە، ئەی جان.

**جانان(Canan)**: دلبەر ـ خوەشتڤی.

**جانباز(Canbaz)**: کەسێ کو گیانێ خوە دئێختە د مەترسییێ دا ل پێناڤ ئارمانجەکێ، گیان فیدا ـ ئازا، دلێر، نەترس.

**جانبدار(Canêbdar)**: لایەنگیر ـ هاریکار.

**جان بوز(Canbûz)**: ڤەشارگەهـ، پەناهگەهـ، هەشار.

**جانخانی(Canxanî)**: جۆرەکێ جهالێ مەزن و زڤرە.

**جانشین(Canêşîn)**: جێگر ـ خەلیفە ـ قایمقام، ولیعهد.

**جانور(Canêver)**: گیاندارێ زیندی کو بشێت بێت و بچیت(پتر بۆ گیانەوەری دهێتە بکارئینان).

**جانه(Canê)**: گیان، جان ـ چەکێ شەڕی و زری و کومزری ـ هەر گیاندارەکێ جحێل ـ کاتە(یێن دارا).

**جاور(Caver)**: خودانێ جهی ـ حال، حالەت، چەواتی.

**جاورد(Caverd)**: ستری، دڕک.

**جاوید(Cavîd)**: نەمر، هەردەمی، هەروهەر، هەمیشەیی(دائمی، ابدی).

**جای(Cay)**: جه، در.

**جای مند(Caymend)**: تەنبەل، کەدوەر.

**جایی(Cayî)**: ئەدەب، دەستاڤخانە، تەوالێت(wc).

**جدا(Cuda)**: جودا، ژ هەڤدو دویر.

**جدر(Cedr)**: حێشترا مێ یا چوارسالی.

**جر(Cer)**: شکەن، دەرز، کەلشتا کو دکەڤیتە ئەردی ـ جۆ، جۆک.

**جر(Cêr)**: دەنگێ دڕاندنا کاغەزێ یان پەڕۆکی و تشتێن ژ ڤی رەنگی.

**جر(Cur)**: زینا هەسپی.

**جرب(Curb)**: فڕندەکێ وەکی کەوی یە.

**جربزه(Curbuzê)**: زیرەکی ـ ژ هەژیاتی ـ فەند و فێل.

**جرد(Cered)**: بریندار.

**جرد(Cerd)**: کورسیک یان تەختێ شاهینیێ.

**جرده(Curde)**: هەسپێ خەساندی ـ هەسپێ دوقۆرێ کو بابێ وی ژ نەژادێ هەسپێن عەرەبی بت و دەیکا وی ژ نەژادەک دی بت.

**(Cerde)**: هەسپێ رەنگ زەر.

**جرز(Cêrz)**: دیوار ـ شەنگستێ خانی.

**جرس(Ceres)**: قەید و زیندان ـ ئازار و ئەشکەنجە.

**جرشفت(Cerşeft)**: راهاڤێتن، ب داهولکێ دادان، هەلبەستا کو تێدا هۆزانڤان پاڤێتە ئێکی.

**جرقه(Cêrêqqê-e)**: چریسکێن ئاگری.

**جرگ(Curg)**: دەشت، بیابان.

**جرگ(Cerg)**: جڤات ـ دەستەکەکا مرۆڤا.

**جرنده(Cerende)**: کرکروک(عضروف).

**جرنگی(Cerengî)**: کاش(وەکی مرۆڤ دبێژیت من نهو پارێ خوە

کاش«نقد» دڤێت).

**جـــــــرواسـک(Cervasek):** چیرچیرۆک، چرچرک.

**جره(Currê-e):** گیانەوەرێ نێر(چ بفریت، چ بچەریت)ـ دلێر و چست و چەلەک.

**جـریب(Cerîb):** بۆ پیـڤـانا ئەردی بکاردهێت کو بەرامبـەر دەهـ هزار مـیـترێن چوارگـوشـەیە. هەروەسا پەیڤـــێن (گـــریب و گـــری) ژی لکارن.

**جز(Cuz):** ژ بلی، بژلی.

**جـــــزانـدن(Cezanden):** دل شەوتاندن، قەهراندن.

**جزغال(Cêzxal):** کسکێت قەلیێ.

**جست(Cest):** خوەهلاڤێت(قفز).

**جـسـتـجـو(Custcû):** ڤـەکـۆلین، لێگەریان.

**جـــستن(Custen):** ڤـــەدیـتن ـ پەیداکرن ـ ڤەکۆلین.

**جـستن(Cesten):** خـوەهلاڤـێتن ـ رهابـوون، ڤـــەرەستن، ئـازادبـوون، رزگـــاربـوون ـ رەڤین ـ رابـوونە سەرخوە.

**جسک(Cesk):** ئازار، نەخـوەشی ـ بەلا، مسیبەت ـ ئاتاف، زیان.

**جش(Ceş):** مـــوهرکـــا شین یا کـــو دئێخنە جلک یان ستوبێ بچویکا دا چاڤین نەبن.

**جشـان(Ceşan):** گەز(بۆ پیـڤـانێ بـکـار دهێت کـــو هەر گـــەزەک بەرامبەری ١٠٤ سانتیمترایە).

**جـشن(Ceşn):** شـادی، خـوەشی ـ عەید، جێژن.

**جشن(Ceşen):** تا(حرارة).

**جشنواره(Ceşnvarê):** فێستیڤال.

**جشه(Cuşşe):** هچکێ جلکی.

**جغ(Cux):** نیره(نیرێ هەڤجاری).

**جـغـجـغـه(Cêxcêxê):** هاویشـک، خـــشـــخـــشـــۆک(پێ یاریکا بچویکایە).

**جغد(Cuxd):** بوم، کوند.

**چغرات(Çuxrat):** دەو(ماستێ کو ئاڤا وی ژێ هاتبیتە گرتن).

**جـــغـــه(Cêxxê):** تانج یان هەر تشتەکێ وەکی تانجێ کو ل پێشیا کولاڤی بدەن.

**جفت(Cuft):** جۆت(بەروڤاژی کت) ـ ژن و مێر(زوج) ـ هەڤالبچویک.

**جفتک(Cuftek):** جوتک(پێـهنێن دەوارا کو ب هەر دو پێیا دادنن).

**جفت گیری(Cuftgîrî):** پێرابوونا

ب کارێ گوهنێلیێ.

**جفته(Cefte):** چەمیای ـ خوەهر.

**جـفنگ(Cefeng):** بێ مـەعنە، بێهودە، چوننە، پوبچ، بێ کەڵک، بێ مفا.

**جگر(Cêger):** مـێـلاک ـ خـەم و کوڤان.

**جگرگوشە(Cêger gûşê):** دڕکەیە بۆ بچـویکێن زێدە عەزیز لبەر دلێ دەبیابا، ئەم ب کـوردی بەس پەیڤا (جەگەر) بکار دئینین.

**جلب(Celeb):** دەنگ و دۆر ـ فـتنە و هۆسە ـ مرۆڤێ فێلباز و پویچەلۆ ـ ژنا خرابکار.

**جلق(Celq):** ڤـەرەسـاندن، ب عەرەبی دبێژنێ (زلق).

**جلنبـر(Culenber):** کـەسێ کـو جلکێن دڕیای و پیس و قـرێژی ل بەر بن.

**جلنبـە(Culenbuh):** شـینکێ کـو جلکا پێ دشۆن.

**جلو(Cêlo):** پێش، بەرامـبـەر ـ لغاڤ و هەڤسارێ هەسپی.

**جلە(Culle):** گـرێ(گـرێ یا وەریـسـی) ـ گـلـولـک(گـلـولـکا بەنکی).

**جلیتخە(Cêlîtxê):** ل پرانی یا جها تیـپـا(ت) نابێـژن و ئانکوا ڤێ پەیڤێ: ئێلەک(یێ کـو ل بن چاکیتی ڤە دکەنە بەرخوە).

**جم(Cem):** کـورتکریا پەیڤـا (جمشید)ە، کو لدویڤ داستانێن شـەهنامـا فـیـردەوسی چارەمین شاهێ «پێشدادی»یانە.

**جـماش(Cemmaş):** تڕانەکـەر ـ فێلباز ـ غەزەلخوان ـ سەرخوەش ـ مویکار، سەرتراش، حەللاق.

**جـمـری(Cemrî):** بێ ئەسل ـ زەلامێ گەدا و پویچ و شویشتی.

**جمزیور(Cemzîver):** هەسپێ کو ناڤ چاڤ و زک و دەست و پێن وی سپی بن.

**جمشاک(Cemşak):** پێلاڤ.

**جـمند(Cemend):** تەنبـەل، کەدوەر.

**جن(Cen):** رەخ، کنار، ئالی.

**جناب(Cenab):** یاری یا مـەرجانێ یا کـو دو کـەس هەسـتـیکێ دو چەڤێ سینگێ مریشکێ دشکینن و پاش هەر ئێک ژ وان ب هەر کارەکی رابیت دڤێت بێژیت «من ل بیرە» هەگەر وە نەگوت ئەڤە وی

دۆڕاند.

**جنابه(Cunabe):** جێمک(توأم).

**جنباندن(Cunbanden):** لڤاندن، هەژاندن.

**جنبش(Cunbêş):** لڤین ـ بزاڤ.

**جنج(Cenc):** ئاواز و قیژین.

**جنجال(Cencal):** قیژین و قاڕقاڕ ـ دەنگ و دۆر و قەرەبالغ.

**جنجر(Cencer):** جەنجەر.

**جندر(Cender):** جلک، هەر تشتێ کو بکەنە بەرخوە.

**جندره(Cendere):** نەتراشی، هەر تشتێ نە حولیکری.

**جندک(Cêndek):** پارەکێ کەڤن بوو کو ژ سفری دهاتەچێکرن و هەتا سەردەمێ قەجەرا ژی دهاتە بکارئینان.

**جنده(Cêndê):** ژنکا خرابکار، قەحبە.

**جنگ(Ceng):** شەڕ، جەنگ. هەروەسا پەیڤێن(نبرد، پیکار، رزم، کارزار، آورد، زد وخورد) ژی لکارن.

**جنگاور(Cengaver):** شەڕهینەر، بەلاکڕ ـ شەڕڤان، شەڕکەر، دلێر.

**جنگل(Cengel):** دارستان.

**جنگلبان(Cengelban):** زێرەڤانێ دارستانێ.

**جنم(Cenem):** جۆر ـ روی ـ بەژن و بال ـ خود(ذات).

**جو(Co):** جەھ.

**جو(Cû):** جۆوا ئاڤێ، جۆکا ئاڤێ.

**جواری(Cevarî):** گەنم شام، گەنمۆک.

**جواز(Cuvaz):** هاونێ کو ژ داری یان بەری هاتبیتە چێکرن.

**جوال(Cuval):** جهال.

**جوان(Cevan):** جحێل، مرۆڤ یان گیانەوەر یان ژی دارا کو گەهشتبیتە ژیێ خوە یێ ناڤینێ سروشتی کو لجەم مرۆڤا ئەڤ ژیە ل ناڤبەرا (١٨ـ٣٥)سالیێ دایە.

**جوان بخت(Cevan bext):** خوەشبەخت، ب شەنس.

**جوانک(Cevanek):** لاو، تۆلاز، کوڕێ گەنج.

**جوانمرد(Cevanmerd):** لاو، زەلامێ گەنج.

**جوانمرگ(Cevanmerg):** جانەمەرگ، کەسێ کو ل گەنجاتیا ژیێ خوە بمریت.

**جوانه(Cevanê):** گەنج ـ گەنجاتی

ـ زەلامێ جحێل ـ کاتێت دارا.

**جوبه(Cûbê):** مەیدانک(جهەک ژ باژێری کو تشتا ژ دەرڤە بیننە وێرێ و ل وێرێ بفروشن).

**جوجگک(Cûcgek):** چیچەلۆک، چیچکا بچویک.

**جوجه(Cûcê):** چیچەلوکێت مریشکێ یان هەر فرندەکێ دیتر.

**جوجه تیغی(Cûcê tîxî):** ژویژوی.

**جوخه(Cûxê):** دەستەکەک یان کۆمەلەکا مرۆڤا یان ژی گیانەوەرا.

**جودر(Coder):** گیایەکێ دندک هویر و زراڤە کو ل ناڤ زەڤیێن جەهی شوین دبت ـ گۆلک.

**جودرو(Dodêro):** وەرزێ دروینا جەهی.

**جور(Cûr):** جۆر، رەنگ، شێوە.

**جور(Cevr- Cor):** یەکەکا پیڤانێ بوو د ڤەخوارنا مەیێ دا، کو ئەو ژی ئێک ژ هەر هەفت هێلان بوو کو دکەڤتنە سەر لێڤا جامێن مەیێ؛ و دەمێ کو دگۆتن: «پیالە ء جور» ، ئانکوا «جاما لێڤولێڤ ژ مەیێ» ددا.

**جوراب(Cûrab):** گۆرە.

**جوزاک(Cevzak- Cozak):** خەم و کوڤان ـ خەمگین.

**جوزینه(Cozînê):** حەلاوا ب گویز و باهیڤ.

**جوسک(Cosek):** مەهیک، قولپک، قومچە.

**جوش(Cûş):** پرسک ـ کەلین(کەلینا ئاڤێ یان هەر تشتەکێ وەکی ئاڤێ روهن) ـ گەرمی ـ شورەش ـ تێک هاتن و تێک چوون.

**جوشاندن(Cûşanden):** کەلاندن.

**جوش دادن(Cûş daden):** پێکڤەنان، لەحیم کرن.

**جوشک(Cuşek):** گوزکێ بچویکێ ب لویلیک.

**جوشکاری(Cûşkarî):** ئاسنگەری، لەحیمکاری.

**جوغن(Coxen):** هاونێ بەری.

**جو گندمی(Co gendumî):** درکەیە ژ پرچ یان ریهێن رەش و سپی دناڤێکدا.

**جولاه(Cûlah):** تەڤنکەر(مرۆڤێ کو کارێ وی تەڤن راچاندن بت) ـ تەڤنپیرک، داپیروشک.

**جوله(Cûlê):** تیردانک، کیسکێ کو تیرا دکەنە تێدا ـ سیخور.

**جوی(Cûy):** جۆوا ئاڤێ.

**جویا(Cûya)**: لێگەڕ.

**جویبار(Cûybar)**: جهێ کو گەلەک جۆوێن ئاڤێ لێ بن ـ جۆوەکا مەزن کو ژ چەند جۆوێن بچویکتر پێکهاتبیت ـ کنارێ جۆوا ئاڤێ.

**جویدن(Cevîden)**: جویتن.

**جوین(Coyîn)**: تشتێ کو ژ جەهی هاتبیته چێکرن، وەکی نانێ جەهی، ئاڤا جەهی(بیرە).

**جه(Cêh)**: ژنا خرابکار، قەحبە.

**جهان(Cehan)**: خوە هلاڤێتن(وەکی رێڤەچوونا کێچا) ـ دنیا، جیهان.

**جهانسوز(Cehansûz)**: شاهێ زالم و ستەمکار.

**جهانگرد(Cehangerd)**: گەریدە(سیاح).

**جهانگشا(Cehanguşa)**: شاهێ دلێر و دنیا ڤەگر.

**جهانیان(Cehanîyan)**: عالەم(مرۆڤێن کو د دنیایێ دا دژین).

**جهش(Cehêş)**: خوە بازدان ل سەر تشتەکی را.

**جهمرز(Cêhmerz)**: زناکەر، یێ کو نێزیکیا گوهنێلی دگەل ژنا پویچ(قەحبە) بکەت.

**جهن(Cehen)**: جیهان، دنیا، گویا زەمین.

**جهود(Cehûd- Cuhûd)**: جوهی(یهودی).

**جهودانه(Cuhûdanê)**: یێ جوهی یا، پتر بۆ وی پەرۆکێ زەر دهێته گوتن یێ کو جوهی یا دادنا سەر ملێن خوە دا مرۆڤ بزانن کا کیژ ئەون و کیژ خەلکێ دی(نە جوهی).

**جیبا(Cîba)**: پویش و پەلەخ.

**جیب بر(Cîb bur)**: دز، دزیکەر.

**جیر(Cîr)**: چەرمێ نەرم کو پێلاڤا ژێ چێدکەن ـ دەنگێ زراڤ و تیژ، قیژی.

**جیره(Cîrê)**: خوارنەکا دەستنیشانکری کو رۆژانە بدەنە ئێکی، وەکی خوارنا نەخوەشی ل نەخوەشخانێ.

**جیغ(Cîx)**: قیژی، قێری.

**جیک(Cîk)**: دەنگێ فرندێن بچویک وەکی چویچکا.

**جیوه(Cîvê)**: سیماب(زیبق).



**چ(Çê):** تیپا حەفتێ یە د ئەلفابێیا زمانێ فارسی دا. ئەڤ تیپە د زمانێ عەرەبی دا نینە لەورا ل گەلەک جها دبێژنێ «جیما فارسی».

**چابک(Çabuk):** زیرەک، چەلەنگ.

**چابک دست(Çabuk dest):** دەستهەل.

**چاپلوس(Çaplûs):** ئەزمان خوەش، مەللاق.

**چاپیدن(Çapîden):** تالان کرن.

**چاچله(Çaçele):** پێلاڤ.

**چاچول(Çaçûl):** فەند و فێل، حیلە.

**چاچی(Çaçî):** یێ خەلکێ باژێرێ «چاچ» بیت[ناڤێ بەرێ یێ باژێرێ «تاشکەند»ە] یان ژی هەر تشتەکێ کو ل «چاچ» هاتبیتە چێکرن، بۆ نموونە «کڤان»ێن «چاچ»ێ د ناڤدار بوون و دگوتنێ «کڤانێن چاچی».

**چاخان(Çaxan):** ئەزمان خوەش، مەللاق ـ بافرۆ، بەیتەشە.

**چاخچور(Çaxçûr):** شەلوالەکێ درێژ و دەلنگ فرەهێ ژنکایە. هەروەسا پەیڤێن (چاقچور، چاقشور، چقشور، چاخشور چخجیر و دولاغ) ژی لکارن.

چادر(Çadur): عەبایێ ژنکا ـ خیڤەت.

**چار(Çar):** کورتکری یا«چهار» ئانکو هژمار(٤) ـ کورتکری یا پەیڤا «چارە» ئانکو چارەسەری ـ دەرمان ـ را(تدبیر) ـ فەند و فێل ـ کویرهە.

**چار ابرو(Çar ebrû):** سنێلێ کو ژ نوی سمبێلێن وی دئێن.

**چارپهلو(Çar pehlû)**: دڕکەیە ژ زکێن مەزن و تژی.

**چارچار(Çarçar)**: یەکسانی ـ روی ب روی ـ دیدار ـ بگر و ڤەکێش، شەرەنیخ ـ چوارچوارە ـ چوار رۆژێن دویماهیێ ژ چلێ مەزن و چوار رۆژێن بەراهیێ ژ چلێ بچویک کو سارترین رۆژێن زڤستانێ نە.

**چارک(Çarek)**: چارێک، ئێک ژ چارێ ـ کەسێ کو ل بەری کاروانی یان لەشکەری دچیت.

**چارگاه(Çargah)**: ئێک ژ ئاهەنگێن موزیکا ئیرانی یە ـ هندەک ل شوینا (چراگاه) بکار دئینن ئانکو جهێ چەرێ.

**چاروا(Çarva)**: دەوار، گیانەوەرێن بارکێش، وەکی هەسپ و هێستر و کەر و حێشتر.

**چارناچار(Çaro naçar)**: بڤێت نەڤێت، نەعیلاجی.

**چارە(Çarê)**: چارە، عیلاج، دەرمان ـ فەند و فێل.

**چاش(Çaş)**: جۆخین، بێدەر، بێدەرا قۆتای ـ دەخلێ پاقژکری.

**چاشت(Çaşt)**: دەسپێکا رۆژێ، دەمێ سپێدێ ـ تێشت.

**چاشنی(Çaşnî)**: طام ـ شرینی ـ ئەو پیچا کێم ژ هەر خوارنەکێ کو مرۆڤ بۆ طامکرنێ سەحدەکەتێ.

**چاق(Çaq)**: قەلەو، بخوەڤە ـ ساخلەم.

**چاقو(Çaqû)**: چەقۆ، کێر.

**چاک(Çak)**: شکەن ـ دەرز ـ تیک.

**چاک چاک(Çak çak)**: دەنگێ ڤێککەفتنا شیر و گورزا د شەرا دا ـ پرت پرت، قەد قەد.

**چاکر(Çakêr)**: نوکەر، خولام، بەنی، خزمەتچی.

**چاکوچ(Çakûç)**: چەکوبچ.

**چال(Çal)**: چاڵ، بۆ ڤێ مەبەستێ پەیڤێن (چالو، چالە، گود و گودال)ژی لکارن ـ هەسپێ کو مویێن وی یێن سور و سپی دناڤێکدا بن.

**چالاک(Çalak)**: چەلەنگ، چست ـ جهێن بلند.

**چالش(Çalêş)**: ب ناز و مەزناهی برێڤەچوون ـ بۆ شەرەنیخ و شەر و هێرشێ ژی دهێت.

**چالیک(Çalîk)**: دار و ترانێ(ناڤێ یاربەکا بچویکایە). هەروەسا

پەیڤــێن (چلک چلیک و الک دولک) ژی لکارن.

**چام(Çam):** ناز و نازداری.

**چامـه(Çame-ê):** شـعـر، هوزان ـ سروود ـ ئاواز.

**چامەزن(Çamêzen):** موزیک ژەن ـ سترانبێژ.

**چامەسرا(Çamêsera):** هوزانڤان، شاعر ـ سترانبێژ.

**چامــیــدن(Çamîden):** ب ناز و مـەزناهی برێڤـەچوون ـ بخـوەڤـە میزتن.

**چامین(Çamîn):** میز، میزتن.

**چانچـو(Çançû):** دارەکێ درێژ کـو دو ســتــلا ب هەردو ســەرێن وی ڤەدکەن و دادننە سەر ملێن خوە و ئاڤێ پێ ژ جـهـەکی دبەنە جـهـەک دیتر.

**چانە(Çanê):** ئەرزنک ـ گـرگـێت هەڤــیــری ـ لێ هەگـــەر (پر: Pur)لســەرێ وێ هـات: پرچانە: پربێژ، کەسێ کو زێدە دئاخڤت.

**چاو(Çav):** زێمار.

**چاولە(Çavelê):** جورەکێ گولێ یە.

**چاولە(Çavlê):** خوەهر.

**چاولی(Çavulî):** بێژینکا گـەنمی ـ تەبەکـا کـو ژ لەڤـەنا هاتبــیــتــە چێکرن.

**چاه(Çah):** بیرا ئاڤێ.

**چاه بابل(Çahê Babêl):** بیـرەکـە ل بابل کو دبێژن هەردو فریشـتێن هاروت و مــاروت تێــدا حــەبس کرینە.

**چاه بن(Çah bun):** بنێ بیرێ.

**چاه بیــــژن(Çahê Bîjen):** د داستانێن ئیرانیان دا ناڤێ بیرەکێ یە ل توران کـــو ب فـــەرمـــانا ئەفـراسـیـابی، بیـژەن(پەهلەوانێ ئیــرانی) د وێ بیــرێ دا هاتبــوو زیندانکرن و پاشان روستەمی ئەو قورتال کر. هەروەسا ئەڤ بیرە یا ناڤـــدارە ب (چاه بیــــجن و چاه ارژنگ).

**چاهجو(Çahcû):** یێ کو کارێ وی کولانا بیرا بیت.

**چاه رستم(Çahê Rustem):** ئەو بیرە یا کو شغاد(برایێ روستەمی) بۆ روستەمی کۆلای و ل بنێ بیرێ شـــیـــر و رم چکلاندین، دەمێ روســـتـــەم د وێرێ را دبۆری ب هەسپێ خوەڤە کەتە د وێ بیرێ دا و گیانێ خوە ژ دەست دا.

**چاه زنخ(Çahê zenex)**: چالا ئەرزنکێ کو پتر ل ئەرزنکێت ژنکا دیار دکەن و جوانیەکا تایبەت ددەتە ژنکێ.

**چاهی(Çahî)**: هەر تشتەک کو یێ بیرێ بیت، وەکی کبوتر چاهی: کوترکا شین یا کو پتر د بیرێن دویر ژ گوندا هێلینێن خوە چێدکەت، ئەڤ رەنگێ کوترکا نهو ل گەلەک مزگەفتا هەنە ـ زبندانی، زبندانییێ د بیرێ دا.

**چای(Çay)**: چا.

**چایدان(Çaydan)**: چایدانک، چاپەز، قوریێ چایێ.

**چاییدن(Çayîden)**: ئێشا زکام.

**چپ(Çep)**: دژی راست ـ سەرابن ـ چەپان.

**چپات(Çepat)**: شەق، زللەه.

**چپاتی(Çepatî)**: نانێ تەنک.

**چپار(Çepar)**: هەر تشتێ دورەنگ، وەکی هەسپێ کو ژ بلی رەنگێ خوە یێ سەرەکی هندەک پنیێن دی ژی ژ رەنگەکێ دیتر لێ بن.

**چپان(Çepan)**: جلکێ کەڤن.

**چپ انداز(Çep endaz)**: کەسێ کو لسەر پشتا هەسپی تیرا پاڤێت پشت سەرێ خوە ـ کەسێ کو ب دەستێ چەپێ تیرا بهاڤێت ـ فێلباز و حیلەکەر.

**چپاندن(Çepanden)**: پرکرن ـ ب تەعدایی جهێ تشتەکی د ناڤ تشتەکێ دی ڕا کرن.

**چپچاپ(Çepçap)**: دەنگێ ماچیکرنێن لدویڤ ئێک ـ دەنگێ دەڤی لدەمێ خوارن و ڤەخوارنێ.

**چپچل(Çepçêl)**: پێلاڤ.

**چپچله(Çepçêlê)**: تەحیسانک(ئەردێ تەڕ و حولی کو پێ لسەر بحولسیت).

**چپر(Çeper)**: پێژان ـ کەپر ـ کولکێ کو ژ دار و گیایێن هشک هاتبیتە چێکرن ـ کۆمەکا مرۆڤا یان گیانەوەرا کو وەک بازنەکێ لدۆر هەڤ خڕڤە بن ـ ئالاڤەکێ ڤەهاندنا پەڕۆکی یە.

**چپش(Çepêş)**: گیسک.

**چپق(Çupuq)**: قەلین.

**چپکن(Çepken)**: دشداشێ زەلاما.

**چپل(Çepel)**: پیس، ئەداڤگرتی ـ قرێژی.

**چپله(Çeple):** شەق، زللەه.

**چپه(Çepê):** داریَ وەکی بەفری یا کو قایکا پیَ دهاژۆن.

**چپه(Çeppê):** چەپ ـ سەرنوخین ـ چەپان(کەسێ کو ب دەستێ چەپێ کار دکەت).

**چپیره(Çepîrê):** کۆم، کۆمەکا مرۆڤا کو ل جهەکی کۆم بن.

**چپین(Çeppîn):** سەلک.

**چتر(Çetr):** سیهوانە(شمسي).

**چتـــر آبگون(Çetrê abgûn):** دڕکەیە ژ ئەسمانی.

**چتـــر آبنوس(Çetrê abnûs):** دڕکەیە ژ شەڤێ.

**چترباز(Çetrbaz):** پەڕاشوتڤان.

**چتردار(Çetrdar):** کەسێ کو سیهوانێ لسەر سەرێ شاهی رادگریت.

**چترنگ(Çetreng):** شەترنج.

**چتو(Çetû):** پەردا کو بسەر نڤینکا داددەن.

**چته(Çete):** سەربازێ کو خوە بهەلبژێریت بو جەنگێ(مطوع).

**چچ(Çeç):** ملهێب.

**چچو(Çuçû):** چچک، مەمک(یێن ژنکا یان هەر گیانەوەرەکێ مێ).

**چچول(Çuçûl):** تیتلک(یا ژنێ) کو د مەزهەبێ سوننی یا دا سونەتە هەگەر بێتە برین و ل گەلەک جها سوننی کچێن خوە سونەت دکەن ـ هەروەسا بۆ کیرێ بچویکی ژی دهێتە گوتن، هەروەکی ئەم ب کوردی دبێژینێ: (پد، پدۆک).

**چخ(Çex):** کاڤلان ـ شەر و دبن چەنگێن هەڤڕاچوون ـ پێکۆل و خوە وەستاندن ـ کێم و عەداڤ، قرێژ و قیڤار.

**چخت(Çuxt):** بان(سقف).

**چخماخ(Çexmax):** کیسکێ کو بەنک و دەرزیکا بکەنە تێدا ـ ستاوبەر.

**چدار(Çêdar):** وەریسێ کو دەست و پیێن هەسپ و هێسترا پێ دگرێددەن.

**چدر(Çeder):** چارە، چارەسەری.

**چر(Çur):** نێر ـ ئالاڤێ گوهنێلیێ زەلامی(کیر).

**چرا(Çera):** چەرین(بۆ گیانەوەرا لکارە).

**چرا(Çêra):** چرا، چما، بۆچی (ئالاڤێ پرسیارێ یە) ـ هەروەسا

هندەک جارا ئانکوا «بەلیّ» (نعم)ا عەرەبی ددەت.

**چرابە(Çerabê):** سـەرتیک ـ قەیاغ.

**چراخور(Çeraxor):** جهێ کو چەرە لێ هەبیت بۆ گیانەوەرا.

**چراغ(Çêrax):** چراک ـ لەمپە.

**چراغپا(Çêrax pa):** هەر تشتێ کو چراکی یان لەمپێ داننە سەر ـ راوەستیانا هەسپی لسەر هەردو پیان، دەمێ کو هەر دو دەستێن خوە بلند دکەت.

**چراغ پـرە(Çêrax perê):** پەلاتینک.

**چراغک(Çêraxek):** چراکێ بچویک ـ ستێرستێروک.

**چراغلە(Çêraxle):** ستێرستێروک.

**چراندن(Çeranden):** چەراندن.

**چرانی(Çeranî):** پارێ خـوارنا کەسەکی کو رۆژانە یان هەیڤانە بدەنێ.

**چرایی(Çerayî):** گیانەوەرێ کو بچەرت.

**چرایی(Çêrayî):** ئەگەر، سەبەب، سەمەد، دەلیل.

**چرب(Çerb):** سالۆخێ دوهنی یان هەر تشتێ وەکی دوهنی یان ژی تێر دوهن بت ـ زێدە، فـراوان، گەلەک، مشە.

**چرباندن(Çerbanden):** زێدەکرن.

**چرب زبان(Çerb zeban):** ئاخفتن خوەش ـ مەللاق.

**چربک(Çerbek):** نانێ کو دناڤ دوهنی دا بهێتە چێکرن، هەڤریشک ـ سەرتیک و قەیاغ ـ نەوەیی، درەو، بوهتان ـ مامک.

**چربوز(Çerbûz):** مشکێ بیابانی.

**چربی(Çerbî):** بەز ـ سەرتیک ـ قەیاغ ـ تێر دوهن ـ دڕکەیە ژ هێدی و ب نەرماتی(بەروڤاژی زڤری و ب تۆرەیی).

**چرت(Çurt):** هینشکێن خەوێ، نوقرسکێن خەوێ.

**چرت(Çert):** ئاخفتنێن بێهودە. پەیڤێن (چرت و پرت ـ چرند) ژی لکارن.

**چرخ(Çerx):** هەر تشتەکێ بازنەیی کو ل دور تەوەر(محور)ی بزڤریت، وەکی تایرێن پایسکل و ترومبێلا ـ مەکینا درووینێ(خیاطە)ـ ئەسمان ـ فەلەک، گەردون، رۆژگار، سەردەم ـ کڤان ـ بەریک

و یاخە و دورماندوری دەهمەنێ(بۆ جلکا)ـ دەور، زڤرین(لدورخوە زڤرین یان لدور تشتەکی زڤرین)ـ دەف(ئالاڤەکێ موزیکێ یە).

**چرد(Çerd):** دەرازینک.

**چردە(Çerdê):** روی، رەنگێ روی.

**چرس(Çeres):** قەید و زیندان، ئازار و ئەشکەنجە ـ ئەو تشتێ کو دەروێش و گەدا بۆ خوە ب رێکا گەداییێ خرڤە دکەن.

**چرک(Çêrk):** کێم، عەداف ـ قرێژ و قیڤار.

**چرم(Çerm):** چەرم، پویست، کەڤل.

**چرمە(Çerme-ê):** هەسپ(ب تایبەت هەسپێ سپی).

**چرند(Çerend):** ئاخفتنێن بێهودە. (چرند و پرند) پێکڤە پتر ل کارن.

**چرندو(Çerendû):** کرکرک(غضروف).

**چرنە(Çurne):** لویلکا مەسینی یان گوزکی یان قوریکی.

**چروک(Çurûk):** کوریشک(چ ل سەر و چاڤان بت یان ژی لسەر جل و بەرگان بت).

**چریدن(Çerîden):** چەرین.

**چزد(Çezd):** چرچرک(وەکی کولیێ یە، رەنگێ وێ کەسکە و گەلەک دەنگی دکەت ب تایبەت ل گەرمە رۆژێن هاڤینی).

**چزک(Çêzk):** ژویژی، سیخور. هەروەسا پەیڤێن(خارپشت، جوجە تیغی، خارانو، چزغ، چژک) ژی لکارن.

**چسان(Çêsan):** ژ ئالاڤێن پرسیارێ یە و ئانکوا (چەوا، کوسا، چ جۆر، ب چ شێوە) ددەت.

**چسپ(Çesp):** ستورک(صمغ، لصقة).

**چسپانیدن(Çespanîden):** چەسپاندن، پێکڤەنویساندن.

**چسپندگی(Çespendêgî):** نویسەکی.

**چسپندە(Çespendê):** نویسەک.

**چسپیدن(Çespîden):** پێکڤەنویسیان.

**چسپیدە(Çespîdê):** پێڤەنویسیای.

**چست(Çust):** چست و چەلەنگ ـ موکوم ـ توند و سرت ـ رند و بالابەرز.

**چستک(Çustek):** جورەکێ

پێلاڤێن چەرمی یێن سڤکە.

**چسنگ(Çeseng):** کەچەل، حوت، حوچ، کەسێ کو موی ل سەری نەبن.

**چش(Çeş):** کورتکریا پەیڤا (چشم)ە، ئانکو: چاڤ ـ هەروەسا کارێ فرمانە ژ (چشیدن)، ئانکو: تام بکێ.

**چشاندن(Çeşanden):** تامکرن.

**چشایی(Çeşayî):** ئێک ژ هەستێن پێنجینەیە کو ب کارێ تامکرنێ رادبیت.

**چشک(Çêşek):** زێدە، گەلەک، فراوان، مشە ـ زێدەهی، گەلەکی، فراوانی، مشەیی.

**چشم(Çeşm):** چاڤ.

**چشم بلبلی(Çeşm bulbulî):** جورەکێ لوبیکایە ب رەنگێ سپی کو خالەکا رەش تەمەت چاڤێ بلبلێ یا لێ، لەورا ژی ئەڤ ناڤە لسەر دانینە.

**چشم بندی(Çeşm bendî):** جادووگەری، سێحربەندی.

**چشم پیش(Çeşm pîş):** درکەیە ژ مرۆڤێ شەرمکری یان شەرمین.

**چشم تنگ(Çeşm teng):** درکەیە ژ مرۆڤێ حەسوید و بەخیل.

**چشم چران(Çeşm çeran):** چاڤ حیز، چاڤ چەرین.

**چشم سفید(Çeşm sêfîd):** بێ شەرم، بێ حەیا، بێ ئەدەب.

**چشمک(Çeşmek):** کورتکریا پەیڤا (چشم)ە، ئانکو: چاڤ ـ چاڤێ بچویک ـ چاڤ نقاندن ب کوژیێ چاڤەکی ـ بەرچاڤک(منظرة).

**چشم گشته(Çeşm geştê):** چاڤ ویر.

**چشمه(Çeşme):** کانیا ئاڤێ ـ سەروکانیا هەر تشتەکی(منبع) ـ کون(هەر کونەکا بچویک وەکی کونکا دەرزیکێ، کونکێت هویرێ لسەر جل وبەرگا و......هتد).

**چشیدن(Çeşîden):** تامکرن.

**چغ(Çêx):** جورەکێ پەردایە کو ژ لەڤەنا یان شڤکێن دارا چێدکەن ـ هەروەسا خانیکێن کو ژ لەڤەنا یان چقێن دارا بێنەچێکرن ـ هێلینێن فرندا.

**چغاز(Çexaz):** ژنکا بێ شەرم و ئەزمان رەش، ژنکا بێ دەلنگ و شەرۆکە.

**چغـــاله(Çexalê)**: فـــێـــقـــیێ نەگەهشتی.

**چغته(Çuxte)**: لیان.

**چغز(Çexz)**: بەق ـ دەنگێ بەقێ ـ قونێر.

**چـغـک(Çuxuk)**: چـوبـچـک، سڤیانک.

**چغل(Çexel)**: هەر تشـتێ کـو ب ددانا نەهێـــتـــە جـویتن، وەکی: گـوشـتێ نەکـەلاندی ـ کـوریشک، قورمچک.

**چغل(Çuxel)**: زری وکومزری، جل و بەرگێن شەری.

**چغل(Çuxul)**: ئاخـفتن ڤـەگوهێـز، جەهسویس.

**چغند(Çuxund)**: مەزن، مەتوت.

**چغندر(Çuxender)**: سلک.

**چـغـنـدرکـــار(Çuxenderkar)**: جـوتیـارێ کـو کـارێ وی چاندنا سلکا بیت.

**چغو(Çuxû)**: چوبچک، سڤیانک ـ بوم، کوند.

**چفت(Çeft)**: سیـخـمـە کـو چەقێن دارمـێـوێ و شـاکـێن کـولـندا و تشتێن ژ ڤی رەنگی دهاڤێژنە سەر ــ بـان، پـتـــــــر بـۆ بـانـێـت قوبەهی(گونبەدی) دهێتە گوتن.

**چفت(Çêft)**: زنجیر یان خەلەکا کو دەرێ خانی پێ دهێتە دائێخستن.

**چفـتـه(Çefte)**: خـوەهر، چەمـیـای ـ نەوەیی، درەو، بوهتان.

**چک(Çek)**: ملهــێب ــ ئەرزنک ـ زللەه، شەق.

**چک(Çêk)**: دلـوپ. هـەروەســـــا پەیڤـێـن(چکره، چکاله، چکانـه، چکه، چکله) ژی لکارن.

**چک(Çuk)**: چۆک. پەیڤا(زانو) پتر ل کارە.

**چکاچک(Çukaçuk)**: چک چک، پست پست(ئاخفتنەک کو کەتبیتە دەڤێ خەلکی). هەروەسا د زمانێ فارسی دا پەیڤێن (چک چک، پچ پچ) ژی بکار دهێن.

**چکاد(Çekad)**: راستکا سەری ـ ژ ئەنیێ و ئەڤـراز ـ سـەرێ چیـای، کێلیا چیای.

**چکامه(Çekamê)**: شعـر، هوزان، چامە.

**چکامــه ســرا(Çekamê sera)**: شاعر، هوزانڤان.

**چکاوک(Çekavek)**: فـــرندەکێ وەکـی چـوبـچـکـێ یـە، لـێ ژ وێ

مەزنترە و خوەش ئاوازە. هەروەسا ڤی فرندەی ناڤێن(چکاوە، چکاو، چاوک، چکوک، چرز، مـــانوک، مانورک، جل، جلک، ژولە، هوژە، خجو، خاک خسپە) ژی هەنە و ب عـەرەبی دبێـژنێ(قـبـرة) ـ ناڤێ ئاوازەکا موزیکا ئیرانی یە.

**چکری(Çukrî):** رێڤاس.

**چکس(Çekes):** هێلینا فـــرندێن نێـچـیـرێ، وەکی: (بازی، شـاهین و......هتد).

**چکسە(Çekse):** پرتەکا کاغەزێ یە کـو وەکی گـوبعـا(مـخـروط)ێ هاتبـیـتـە پێـچـان و توڤک و دەرمـــانک و بهـــارات و...هتـــد، بکەنە دناڤ دا.

**چکش(Çekuş):** چەکویچ، چاکوچ.

**چکە(Çekê):** بچـــویک، هویر ـ لێـبـۆک، کـەسێ کـو ب چڤێلی و ئامسارێێن خوە خەلکی بکەنینت.

**چکیـدن(Çêkîden):** دلوپ کــرن، چپک ژ جهەکی کەفتن.

**چگـونە(Çêgûnê):** ئالاڤـــــەکێ پرسیارێ یە، ئانکو: کوسا، چەوا، چ رەنگ، چ جور، چ تەرز.

**چل(Çêl):** کــــورتکریا هژمـــــارا چهل(٤٠) ـ هەســـپێ کـــو هەردو دەست یانژی دەستێ وی یێ راستێ و پێ وی یێ چەپێ ســـپی بیت ـ کێم عاقل، نەزان، هەبلە، دەبەنگ.

**چل(Çel):** سکر.

**چلاس(Çêlas):** چل(مـرۆڤێ کـو ژ بەر بێ نەفسی یا خوە یێ ئامادە بیت خـوە رەزیل و بێ بهـا بکەت بەس داکـو پاریەکێ نانی ژ کـەسێ هەمبەری خوە وەربگریت).

**چلب(Çeleb):** ئامـیـرەکێ مـوزیکێ یە وەکی دو قـەپاخێن قازانانە کو لێک ددەن. پەیڤا (سنج) پتر لکارە ـ دەنگ و دور، هوسە و هەرا.

**چـلـبـلـە(Çulbule-ê):** بـلـەز ـــ نیگەرانی، بێ قەراری.

**چلپاسە(Çelpasê):** مـارگـیـسـە. پەیڤـێن (کلپـــاســە، کلبـــاســە، سـوسـمـار، مـارمـولک، کـرباسـە، کرباشە، کرباشو، کربش، کـربشـە، باشو، ماتورنگ) ژی لکارن.

**چلچلە(Çêlçêlê):** حـاجی رەشک ـ هەروەسا (کویسەلە)یە ژی.

**چلچلی(Çêlçêlî):** یێ کـو بدویڤ پویچاتیا بکەڤیت و چو د دلێ خوە دا نەهێلیت، ب تایبـــەت ژ چل

ساليێ و وێڤه.

**چلک(Çulek):** کنفێ ئارمویشی ـ گلولکا ئارمویشی یان بەنکی.

**چلک(Çêlk):** هسکیف، مفسک.

**چلملە(Çelmelê):** ب هەروە، بەلاش، بێ بەرامبەر. هەروەسا پەیڤێن(رایگان، مفت) ژی لکارن.

**چلنگر(Çêlênger):** کلیل ساز، قفل چێکەر.

**چلو(Çêlo):** برنجا کەلاندی و ئامادە بۆ خوارنێ.

**چلە(Çêllê):** چللە(بەنکەکێ قاییمە ژ بەرکو یێ ژ گەلەک داڤێن زراڤ هاتیە چێکرن) ـ چللە(چل رۆژی، رۆژا چلێ پشتی مرنێ یان پشتی بوونێ)، هەر تشتێ کو پەیوەندی ب هژمارا(٤٠)چل ڤە هەبیت.

**چلیپا(Çêlîpa):** خاچ ـ درکەیە ژ بسکێن یارێ.

**چم(Çem):** خوە نازدارکرن ـ رێڤەچوونا ب نازداری ـ رێکخستی ـ شەنگستە ـ دبەرخوەراچوون، خوە کەشخەکرن ـ شرۆڤە(روحا ئاخفتن و گوتنێ).

**چمانە(Çemanê-e):** پەیالە، جاما مەیێ، کولندێ کو مەیێ بکەنێ.

**چمانە(Çumane):** گیانەوەر، حەیوان.

**چمانی(Çemanî):** مەیگێر(ساقی).

**چمپا(Çempa):** برنجێ گردە(برنجێ رویتک).

**چمچاچ(Çemçaç):** چەمیای، خوەهر ـ پشت چەمیای، پشت قلوز.

**چمچم(Çumçum):** کلاش، جۆرەکێ پێلاڤانە کو ژ بەنکا دهێتە چێکرن ـ سمێن گیانەوەرێن چارپێ.

**چمچمە(Çumçumê):** دەنگێ پیێن مرۆڤا و گیانەوەرا.

**چمخال(Çemxal):** جۆرەکێ چەکی بوو کو د کەڤن دا بکار دهات.

**چمدان(Çemedan):** یا ژ پەیڤا(جامەدان) هاتی، ئانکو: چانتێ جلکا کو مرۆڤ بو سەفەرا دگەل خوە دگێرینیت.

**چمن(Çemen):** جهێ کەسکاتی لێ، چیمەن ـ فریز.

**چموش(Çemûş):** شەمبوز، شەهموز(دەوارێ شەمبوز).

**چمین(Çemîn):** میز، میزتن، بخوەڤە میزتن.

**چناچن(Çenaçen)**: دەنگێ کـو ژ کڤانی دهێت دەمێ کو تیرا لدویڤ ئێک پێ دهاڤێژن.

**چنان(Çunan)**: کـورتکریا (چون آن): وەسا، وەتوڤ، ولو.

**چنانچون(Çunançon)**: هەروەسا، هەروەتوڤ.

**چنانچـه(Çunançê)**: ژ پەیڤـێن (مـەرج ـ شـرط)ی یە: هەگـەر، هەرگاڤا.

**چنبـــر(Çenber)**: دۆرمـــاندۆری بازنەی(محیط دائرة) ـ خەلەک ـ هەر تشتێ بازنەیی.

**چنبـک(Çunbek)**: جـــــورەکێ رونشتنێ یە(وەکە ئەم دبێژن: فلان کەس یێ ب کوندلیسک چووی یان یا خـوە کـریە قـورمک) بۆ زانین هندەک گورێن کەڤن هاتینە ڤەدیتن کـو بڤی رەنگێ رونشـتنێ، مـری تێدا هاتبوون بن ئاخکرن.

**چنبــه(Çunbê)**: دارێ مـــەزن و ستویر، یان هەر تشتەکێ مەزن و ستویر و ژ وان مرۆڤێ قەلەو.

**چنته(Çente)**: چنته، جانته.

**چند(Çend)**: پەیڤـا پرسـیـارێ یە: چەند(بو هژمـارێ و بۆ بهـای) ـ چەند(هەتا کەنگی) ـ ب پەیڤـێن بەری و پشـتـی خـوەڤـە واتایێن نویتـر ددەت، وەکی: (چندانکە: هند، هەتا کـو؛ یان، دوچندان: دوبەرابەر، دو جار هند).

**چنـدش(Çendêş)**: نیـگـەرانـی و قـەهرا کـو بۆ مـرۆڤی چێدبیت ژ ئەگـەرێ دیتنا تشـتـەک یان دیمەنەکێ دلئێش.

**چنگ(Çeng)**: پەنج(پێنج تبلێن دەسـتێ مـرۆڤی، یان پەنجـێن گـیـانەوەرا) ـ هەر تشـتـەکێ چەمـیـای یان سـەر خـوەهر بیت ـ ئامیرەکێ موزیکێ یە.

**چنگ(Çêng)**: نیکلێ فرندا.

**چنگار(Çengar)**: کـێـڤـژاله ـ ناڤێ ئێـشـەکێ یە کـو برین یان جـهێ وەرمتی وەکی پیێن کێڤژالەیە.

**چنگال(Çengal)**: پەنج(چنگ) ـ چەتال(ئالاڤەکێ خوارنێ یە).

**چنه(Çêne)**: چنیـک، دندکـێت تومکی کـو مـریشـک ژ ئەردی رادکەت و دخوت.

**چنه(Çenê)**: ئەرزنک.

**چنین(Çunîn)**: هوسا.

**چو(Ço)**: وەکی، مینا.

**چوب(Çûb):** دار(داریٚ سوتنیٚ یان داریٚ کو بکێر نەجاریێ بهێت).

**چوبدار(Çûbdar):** خودان تەرش و کەوال.

**چوپان(Çûpan):** شڤان. هەروەسا پەیڤێن(شبان، رمەبان، رمەیار، رمیار و رامیار)ژی لکارن.

**چوچونچە(Çûçûnçe):** جۆرەکیٚ پەرۆکیٚ تەنک و رەنگ سپی یە کو لدەمیٚ هاڤینیٚ جل و بەرگا ژیٚ چێدکەن.

**چوخا(Çoxa):** چوخک.

**چوشک(Çûşek):** گوزکیٚ بچویکیٚ ب لوبلوبک.

**چوشیدن(Çûşîden):** مێهتن، مێژتن.

**چوگان(Çogan):** کاشۆ(دارەکە کو بۆ یاریا گویانیٚ یان کاشۆوانیٚ بکار دئینن).

**چون(Çon):** وەکی، مینا ـ دەمیٚ کو، وەختیٚ کو ـ چونکی، ژ بەر کو ـ چەوا، کوسا، کوتوڤ.

**چونە(Çûnê):** گرکێت هەڤیری.

**چە(Çê):** ژ بەرکو ـ چ(چ ئەڤە، چ ئەویٚ هە) ـ چ(بۆ پرسیاریٚ، وەکی: چ دبێژی؟) ـ چەند ـ چەوا ـ چ(بۆ سەرسورمانیٚ، وەکی: چ خرابە!، چ دەلالە!).

**چە(Çe-ê):** هێمایێ بچویککرنیٚ یە، وەکی: (آلوچە: حولیچەک ـ دریاچە: دەریا بچویک، گۆل).

**چە(Çeh):** کورتکریا پەیڤا(چاە)ە، ئانکو: بیر، بیرا ئاڤیٚ.

**چهار(Çehar):** هژمارا (٤)چوار.

**چهاردە(Çeharde):** هژمارا (١٤)چواردە.

**چهارزانو(Çeharzanû):** چوارمێرکی، مێهڤانیک (جورەکیٚ روینشتنیٚ).

**چهارشاخ(Çeharşax):** ملهێب.

**چهارشنبە(Çeharşenbê):** چوارشەمبی(ناڤیٚ روژا پێنجیٚ یە ژ هەر هەفتیەکیٚ).

**چهارشنبە سوری(Çeharşenbê sûrî):** جەژن و کەیفکرنەکا ئیرانیانە کو هەر سال ل شەڤا چوارشەمبی یا دویماهییٚ ژ هەیڤا (اسفند = کو هەیڤا دویماهییٚ یە ژ سالا هەتاڤی، یان وەرزیٚ زڤستانیٚ) ئاگری هلدکەن و خوە ل سەر را دهاڤێژن و دبێژن: «سرخی تو از من، زردی من از تو».

**چهـارصـد(Çehar sed)**: هژمـارا (٤٠٠)چوارسەد.

**چهـچهـه(Çehçehê)**: ئاوازا بلبلی یان هەر فرندەکێ خوەشخوان.

**چهره(Çêhrê)**: روی، روخسار.

**چهل(Çêhêl)**: هژمارا (٤٠)چل.

**چی(Çî)**: کـورتکریا پەیڤـا «چیـز: تشت» ـ ئالاڤێ پرسـیـاریێ یە ئانکو (چ؟). هەروەسا پاشگرەکێ زمـانێ توکی یە کـو د زمـانێ فـارسی دا ژی لـکارە، وەکـی: (چایچی، تماشاچی).

**چیدن(Çîden)**: چنین(چنینا سێڤا، چنینا گـولا، دروینا گـیـای ژ ئەردی) ـ برین یان کـورتکرن یان قـوسـاندنا نینوک و مـوی یا ـ هلـگرتن(دەمێ مـریشـک یان چوبچک دندکێت تومکی ژ ئەردی هەلدگـریت) ـ هەلبـژارتن و ڤاڤێرکرن ـ رێزکرن(لدویڤ ئێک یان لسەرئێک ب رێکوپێکی).

**چیره(Çîrê)**: سەرکەفتی، کەسێ کو ب تمامی نەیارێ خوە بێخته بن دەستێ خوە و غەلابەتێ لسەر بکەت.

**چیره‌دست(Çîrêdest)**: هونەرمەند، شارەزا.

**چیز(Çîz)**: تشت(هەر تشتەکێ بێ گیان).

**چیـزک(Çîzek)**: کـورتکریا پەیڤـا (چیز)ە، ئانکو: تشتوک ـ ژویژی.

**چیست(Çîst)**: پەیڤا پرسیاریێ یە، ئانکو: چی یە؟

**چیـسـتـان(Çîstan)**: مـامک(ئەو چ تشـتـه؟). هەروەسـا پەیڤـێـن (بردک، پردک) ژی لکارن.

**چیـلان(Çîlan)**: ئالاڤ و ئـامـیـرێن کو ژ ئاسنی هاتبنه چێکرن، وەکی: (خەلەک، زنجیـر، قـفل و کلیل و کێر و ساتور و......هتد).

**چین(Çîn)**: طا(وەکی بێژی کاغەزێ یان پەرۆکی بکه دو طا)ـ کوریشک و قـورمـچک(لسـەر روی و سەروچاڤا یان پەرۆکی و......هتد).

**چینه(Çînê)**: چنیـک یان دندکـێن کو مریشک ژ ئەردی هەلدگریت دا بخـوت ـ دیواریێ کـو بەس ژ لبن و تەقنێ هاتبیته چێکرن(بەر و بلوک و کـەرپیـچ تێـدا نەهاتبنه بکار ئینان) ـ د زاراوێ جـیـولـوجی دا، هەر تەبەقـەک ژ ئەردی کـو ژ لایێ شـوینوار و پاشـمـایێن خـوەڤـه گرێدایینه ب سەردەمەکی ڤه.

# ح

**ح(Ha')**: تیــــپــــا هەشــــتێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی. ئەڤ تیپە د زمـــانێ فـــارسی دا نینە و هەر پەیڤەکا کو د زمانێ فارسی دا ب بەرچاڤ بکەڤــیت کـو بڤێ پەیڤێ دەست پێکربیت هینگێ ئەو پەیڤ یان یا عــەرەبی یە یانژی بنیـــاتێ پەیڤێ عەرەبی یە و یا ئێخستیە د قالبێن فارسی دا، هەروەسا مشەنە پەیڤـــێن دارشـــتی و لێکدایێن عەرەبی و فارسی کـو ئەڤ تیپە د ناڤدا بت، وەکی نموونێن ژێری.

**حـــــاجت روا(Hacet reva)**: ئەو کەسێ کو مـحـتـاجیـا وی هاتبـتـە قەتاندن.

**حاجتمند(Hacetmend)**: پێدڤی، محتاج.

**حــاجــتــومند(Hacetûmend)**: پێدڤی، محتاج.

**حــاجی فــیــروزه(Hacî fîrûzê)**: زەلامێ کو ل رۆژێن جەژنا نەڤروزێ رویێ خـوە رەش دکـەت و جلکێن سۆر دکەتە بەر خوە و د ناڤ جادا دا دگەریێت و ب ئاخفتن و ترانە و یارییێن خـوە خـەلکی دکـەنینت و پارەی ژ وان وەردگرت.

**حــاجی لک لک(Hacî leklek)**: لەگلەگـە ـ دڕکـەیە ژ زەلامێ بەژن زراڤ و بالابەرز.

**حادثەجو(Hadêsêcû)**: کەسێ کو بەردەوام چاڤـــەرێی قـــەومـــتنا رویدانێت نوی بت ـ کـەسێ کـو ژ رویدانا نەترست.

**حـــــادثەزای(Hadêsêzay)**: هەر تشت یان کەسێ کـو ببـتـە سەبەبێ قەومتنا رویدانەکێ.

**حــاشــیــەبندی(Haşîyê bendî)**: دروستکرنا کنارێن هەر تشتەکی،

وەکی خەملاندنا رەخێت بیستانی ب چاندنا گولا.

**حاشیەدار(Haşîyêdar):** هەر تشتێ کو کنار هەبن.

**حاشیەدوزی(Haşîyêdûzî):** دروینا رەخێن پەرۆک و جلکا و هەر تشتەکێ ژ ڤی رەنگی.

**حاشیەنشین(Haşîyê nêşîn):** کەسێ کو ل رەخێن جڤاتێ روینتەخوارێ.

**حاشیەنویس(Haşîyê nêvîs):** پەراوێزنڤیس.

**حاصلخیز(Hasêlxîz):** ئەردێ کو بەرەکێ زێدە بدەت، ئەردێ تێر دەرامەت.

**حاکی(Hakî):** کەسێ کو سوحبەتەکێ یان ئاخفتنەکێ بکەت یانژی سەرهاتیەکێ و چیرۆکەکێ بێژت.

**حالا(Hala):** نۆکە، نهۆ، ڤێ گاڤێ.

**حال کردن(Hal kerden):** کەیف کرن، زەوق چێکرن.

**حالی شدن(Halî şuden):** تێگەهشتن.

**حالی کردن(Halî kerden):** تێگەهاندن.

**حباب(Hubab):** پەقیشکێت کو بسەر ئاڤێ دکەڤن.

**حباب وار(Hubabvar):** وەکی پەقیشکا.

**حبسخانه(Hebsxane):** حەبس، زیندان.

**حبسگاه(Hebsgah):** حەبس، زیندان.

**حبسی(Hebsî):** حەبسی، زیندانی.

**حراج(Herrac):** فرۆتنا تشتەکی ب رەنگێ لسەرێک زێدەکرنێ.

**حرامخوار(Heramxwar):** حەرامخۆر.

**حرامزاده(Heramzadê):** بیژی - درکەیە ژ مرۆڤێ حیلەکەر و فتنەچی.

**حرام نمک(Heram nemek):** بێ نان و خوێ، کەسێ کو قەنجیێت خەلکی لبەر چاڤێن وی نەمینن.

**حرف راندن(Herf randen):** ئاخفتن، سوحبەت کردن.

**حرف زدن(Herf zeden):** ئاخفتن، سوحبەت کرن.

**حرفگیر(Herfgîr):** رەخنەگر.

**حرمخانه(Heremxane):** جهێن تایبەت بۆ ژن و حورمەتا د خانیێن

مەزنان ڤە.

**حرمسرا (Heremsera)**: بنێرە: (حرمخانە).

**حروفچین (Hurûfçîn)**: تیپلێدەر.

**حسابدار (Hêsabdar)**: ژمێریار.

**حسابداری (Hêsabdarî)**: ژمێرباری.

**حسدناک (Hesednak)**: حەسوید.

**حسرت خوردن (Hesret xur-den)**: خەم خوارن، کول داکرن.

**حس کردن (Hêskerden)**: هەست کرن، پێ حەسیان.

**حشرەشناس (Heşerê şênas)**: موورنیاس.

**حشرەکش (Heşerê kuş)**: مووركوژ، هەر دەرمانەکێ ژەهردار کو موورا بکوژت.

**حق پرست (Heq perest)**: خودێ پەرێس ـ کەسێ کو حەژ راستی و دروستییێ دکت.

**حق شناس (Heq şênas)**: خودێناس ـ کەسێ کو باوەری ب راستییێ هەی ـ ب نان و خوێ.

**حق گو (Heq gû)**: راستی بێژ.

**حقەباز (Huqqêbaz)**: جادووگەر، سێحربەند ـ حیلەکەر، فێلباز.

**حکم انداز (Hukm endaz)**: تیرهاڤێژێ زیرەک کو تیرا وی خەلەت نەچت، سەگڤان.

**حکیمانە (Hekîmanê)**: وەکی حەکیما، کارێن کو ب عەقل و زانین دهێنە ئەنجامدان.

**حلاجی (Hellacî)**: کارێ کو کوبرنج پێ رادبت.

**حلال خور (Helal xor)**: حەلالخۆر، کەسێ کو خوە ژ مالێ حەرام بدەتە پاش.

**حلبی ساز (Helebî saz)**: تەنەکچی.

**حلقە بگوش (Helqê bêguş)**: کەسێ کو خەلەک یان گوهارک د گوهی بن ـ درکەیە ژ بەنی یان مرۆڤێ گوهدار و فەرمان بجی هینەر.

**حمایتگر (Hêmayetger)**: زێرەڤان، حەرەس ـ پشتەڤان.

**حمدان (Hemdan)**: ئالاڤێ گوهنێلییێ زەلامی(کیر). هەروەسا (حمدون) ژێ لکارە.

**حمدونە (Hemdûne)**: مەیمونک.

**حوردیس (Hûrdîs)**: جوان وەکی حورییا.

**حــورو‌ش(Hûrveş)**: جــوان وه‌كی حورییا.

**حـیـرت انگیـز(Hêyret engîz)**: هه‌ر تشــتێ كــو ببــتــه ســه‌به‌بێ حه‌یبیرین و سه‌رسورمانێ.

**حــیـــــرت زده(Hêyret zedê)**: سه‌رسورمای، حه‌یبیری.

**حـیله‌باز(Hîlêbaz)**: حــیـله‌كــه‌ر، فێلباز.

**حــیـله‌كـــار(Hîlêkar)**: بنێـــره: (حیله‌باز).

**حــیـله‌گـــر(Hîlêger)**: بنێـــره: (حیله‌باز).



**خ(Xa')**: تیپا نەهێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی. د هندەک پەیڤان دا دهێتە گوهارتن ب(ه)ێ، وەکی: (خستە = هستە: بەرک) و هندەک جارا ژی دبیتە (غ)، وەکی: (تاخ = تاغ: جورەکێ دارێ یە).

**خا(Xa)**: مل، شان ـ چالا کو ئاڤێن حەمام و لێنانگەهێ تێدا خرڤە دبیت.

**خاتوله(Xatûlê)**: فند و فێل، حیلە.

**خاچ(Xac)**: خاچ(صلیب)ـ نەرمەیێ گوهی کو گوهارکا دکەنێ.

**خاخام(Xaxam)**: زانا و پێشەوایێن دینی یێن جوهیا.

**خاد(Xad)**: فڕندەکێ وەکی قەل(قڕ)ێ یە.

**خاده(Xade-ê)**: دارێ راست و بلند، سپیندارا (٣ـ٦)سالی کو هاتبیتە برین و سپیکرن.

**خار(Xar)**: ستریێ دارێ یان گولێ، دڕک.

**خارا(Xara)**: جورەکێ بەرێ رەقە(گرانیت) ـ جورەکێ پەروکێ ئارموبشی یە.

**خاراندن(Xaranden)**: خوراندن.

**خاریشت(Xarpuşt)**: سیخور، ژویژی.

**خارخار(Xarxar)**: خوریانا لەشی ـ دل نیگەرانی، پەریشانی.

**خاره(Xarê)**: چاکوچێ ئاسنگەرا.

**خاز(Xaz)**: کێم، عەداڤ ـ قرێژ و قیڤار ـ جورەکێ پەڕوکێ کتانی یە.

**خازنه(Xazenê)**: دش(خویشکا ژنێ).

**خازه(Xazê)**: جەبل(تەقنا

ئامادەکری بو پێڕادانێ).

**خاستن(Xasten):** رابوونە سەرخوە، هەستان ـ راوەستیان.

**خاش(Xaş):** خەسوی (دەیکا مێری یان ژنێ) ــ ئەڤـــیندار(ا ـ ێ) پەریشان.

**خـاشـاک(Xaşak):** هویرکێ داری یان گیای یان کای.

**خاک(Xak):** ئاخ(تەخا بسەرڤە یا ئەردی) ـ ئاخ(وەلات ـ وار).

**خاکستر(Xakêster):** خوەلی.

**خاگینە(Xagînê):** هێکا مریشکێ یا لبـەر دوهنی پشـتی زەرک و سپیک دهێنە تێکەلکرن.

**خـالم(Xalum):** مـار، مـارێ گەزندە.

**خالو(Xalû):** خال(برایێ دەیکێ) ـ زڕنا(ئامیرەکێ موزیکێ یە).

**خام(Xam):** خاف، نەکەلاندی.

**خـام درایی(Xam derayî):** ژ بەر ئاخفتن، ئاخفتنێن بێهودەکرن.

**خـامـوش(Xamûş):** بێ دەنگ بوون، نەئاخـفتن، ئارام ــ تەمراندی، ڤەمریای(بو چراک و ئاگـری یان هەر تشـتـەکێ کارەبایی).

**خامە(Xame-ê):** ئارمویشێ خاف، ئارمـویشێ نەبادای ـ لەڤـەن یان هەر تشـتـەکێ کـو پێ بنڤـیسـن ـ دوهن یان نیـڤـشکێ کـو بسـەر شـیـری دکـەڤـیت ـ کـومـتـێن خشبەرکا.

**خـان(Xan):** خـانی ــ شـانا زرکێتکێ.

**خـاندان(Xandan-Xanedan):** خێزان ـ بنەمال.

**خانوادە(Xanevade):** خێزان، ژن و عـەیال ــ بنەمـال، کـەس و کـار، خزم.

**خـان و مـان(Xano man):** ژ دو پەیڤـێن (خان) و(مان) کـو هەردو هەڤـواتایێن هەڤن و ئانکویا (مال یان کەسێن کـو د مـالێ دا دژین) ددەت و (و ــ ئـالاڤێ پـەیـوەنـدی یێ) پێک دهێت؛ هندەک جـارا (خانمان) ژی دهێت.

**خانە(Xanê):** خانی.

**خـانـەدامـاد(Xanêdamad):** زاڤایێ کـو لجەم خەزویر و خەسویا خوە دژیت.

**خـانـەزاد(Xanêzad):** زاروکێ خولام و خوداما کـو ل مـالا ئاغـای

هاتبیته سەر دونیایێ.

**خانی(Xanî)**: برکا ئاڤێ.

**خـــاو(Xav)**: خـــەو ـ پویرتکێ مەحفویر یان پەروکێن مەخمەلی.

**خـاور(Xaver)**: رۆژهلات(د کـەڤن دا بۆ رۆژئاڤـا ژی بکار دئینان) ـ ستری، درک.

**خاور(Xavur)**: مێری.

**خـاورمـیـانە(Xavermîyanê)**: رۆژهلاتا ناڤەراست.

**خـاوش(Xavuş)**: خـیـارێ کـو بۆ توڤی بهێلن.

**خاول(Xavul)**: مێری.

**خـــایسـک(Xayêsk)**: چاکـــوچێ ئاسنگەران.

**خایە(Xayê)**: هێک ـ رطل، گون.

**خـــاییــدن(Xayîden)**: جـــویتن، تشـــــتـــــەک ل نـاف ددانـان را هویرهویرکرن و نەرم کرن.

**خبارە(Xebare)**: چست و چەلەک، زیرەک.

**خبـاک(Xebak)**: چاردیواریێ سـەر ڤـــەکـری کـــو چێل و پەزا بکەنە تێڤە.

**خبوک(Xebûk)**: موکوم، بنەجە.

**خـپـچـە(Xepçê)**: چقـێن زراڤ و راستێن دارێ.

**خـپـک(Xepek)**: خـەندقێن ـ نانێ مەزن و ستویر.

**خپلە(Xepele-Xêpêlê)**: مرۆڤێ قـەلەو و کـورتـک، مـرۆڤێ قـوت و خڕ.

**ختـار(Xetar)**: ئادە(ئادەکرنا برنجی و نوکا و......هتد).

**ختن(Xuten)**: ناڤێ کەڤنێ پارچەک ژ (ترکـستانا چینێ) کـو (مسـک)ا وێ یا کـو ژ نافکا خەزالا دکەڤیت یا ناڤدارە.

**خـتنبـر(Xetenber)**: هەژارێ کـو ناڤی لخوە بدت کو یێ زەنگینە یان ژی زەنگـینێ کـو خـوە ب هەژار و دەستکورت بینتەدەر.

**خـــجــــارە(Xucare)**: پـچــــەک، کێمەک، دەمەکی کورت.

**خـجـالت(Xecalet-Xêcalet)**: شـــــەرم. هەرچەندە یا ژ پەیڤـــــا (خجل)ا عـەرەبی هاتیـە وەرگـرتن لێ ئەڤ پەیڤە بخوە د عـەرەبی دا نینە.

**خـجـســتـە(Xucestê)**: پیــروز، مبارەک.

**خــــجک(Xecek)**: لەککە، داغ،

خال، نیشان.

**خجیدن(Xucîden):** خرڤەبوون.

**خجیر(Xucîr):** جوان، دەلال.

**خدا(Xuda):** خودا، یەزدان ـ خودان.

**خداوند(Xudavend):** خودا، یەزدان.

**خدرک(Xedrek):** بزوتێ گەش ـ گەشاتی یا پەلا.

**خدره(Xudre):** چریسکێن ئاگری.

**خدنگ(Xedeng):** خەدەنگ، دارێ موکومێ کو تیر و رما ژێ چێدکەن.

**خدو(Xudû):** تف، گلیز، ئاڤا دەڤی.

**خدوک(Xedûk):** پەریشان، پێکداچووی، خەمگین.

**خدیش(Xedîş):** مەزنێ مالێ ـ ژنکا مەزنا مالێ.

**خر(Xer):** کەر(بۆ ناڤێ نێری «خر» دهێتە گۆتن، لێ بۆ ناڤێ مێ یێ ڤی گیانەوەری(ماکەر)ێ، پەیڤا «ماچە» دهێتە گۆتن)ـ هەر تشتەکێ گر و مەزن ـ ل پێشیا هندەک پەیڤا دهێت و مایێ خوە د ئانکوا وان دکت، وەکی: خرچنگ، خرپا.

**خر(Xerr):** کوڕ(تەقنا رەش و لیچ و بێن نەخوەش).

**خر(Xêr):** حەفک، گەوری.

**خرابات(Xerabat):** مەیخانە، مەیکەدە.

**خراره(Xerarê):** ئاوازا گری دەمێ کو ژ حەفکێ دەردکەڤیت.

**خراش(Xeraş):** سەلخین ـ فەرمانە ب سەلخاندنێ، ئانکو: بسەلخینە.

**خراشیدن(Xeraşîden):** سەلخین، کەلداچۆن.

**خراشیده(Xeraşîdê):** سەلختی، کەلداچۆی.

**خرام(Xeram):** رەفتارا هێدی و ب نازداری ـ موژدە، مزگینی ـ شادی، خوەشی.

**خرامین(Xeramîn):** چەروان، جهێ چەرا گیانەوەرا.

**خربار(Xerbar):** خرار، بارێ کەرەکی.

**خربزه(Xerbuzê):** گوندۆر.

**خربزەزار(Xerbuzêzar):** وەرزێ گوندۆرا، زەڤیا گوندۆرا.

**خربوز(Xerbûz):** شەڤرەڤینک، چەکچەکویلە، شەمشەمەکوێرە.

هەروەسا ناڤێن(خربواز، خرببیواز، خربوز، پیواز، خرپیواز، شپ پرە) ژی هەنە.

**خرپا(Xerpa):** ستوینێ داری یان ئاسنی کو داننە بن پرا یان بانێ خانی دا موکوم راوەستیت.

**خرتال(Xertal):** کەڤلێ چێلێ کو پری پارە و زێر و زیڤ بکەن.

**خرجستە(Xercestê):** شەر و شور ـ دەنگ و دۆر، هوسە و هەرا ـ کەسێ کو نە ژ عەشیرەکێ بیت و خوە ژ وێ عەشیرێ بژمێریت.

**خرچنگ(Xerçeng):** کێڤژالە، قرژال ـ هەروەسا ناڤێ بورجا (کێڤژالە = سرطان)ە.

**خورخجیون(Xorxucîven):** کابویس.

**خرخرە(Xêrxêrê):** گەوری.

**خرخسە(Xerxesê):** فرندێ کو نێچیرڤان ب رەخ تەلهێ ڤە گرێددەت دا هندەک فرندێن دی ژ بەر وی بکەڤن وێ تەلهێ.

**خرد(Xêred):** هوش، عەقل.

**خرد(Xurd):** هویر، بچویک.

**خرداد(Xurdad):** ناڤێ هەیڤا سێ یێ یە ژ سالا هەتاڤی، ئانکو هەیڤا دویاهیێ ژ وەرزێ بهارێ، و ناڤێ رۆژا شەشێ یە ژ هەمی هەیڤێن سالا هەتاڤی و ناڤێ فریشتەکێ یە د ئۆلێ زەردەشتی دا.

**خردادگان(Xurdadgan):** جەژنەکا کەڤنا پارسی یان بوو کو ل رۆژا شەشێ ژ هەیڤا خرداد ئەڤ جەژنە دهاتەکرن و ژ بەر هندێ دکرنە جەژن کو ناڤێ روژێ و مەهێ هەردو دبوو (خرداد).

**خردسال(Xurdsal):** کوڕ یان کچێن کو ژیێ وان ژ پێنج سالیێ کێمتر بیت.

**خردل(Xerdêl):** ترسنوک، کولافە.

**خردمند(Xêredmend):** ب ژیر، ب عاقل، زانا، هشیار.

**خردە(Xurdê):** هویر، بچویک ـ کێم، پچەک ـ چریسکێن ئاگری.

**خرزە(Xerzêh):** نێر ـ ئامیرێ گوهنێلیێ زەلامی هەگەر درێژ و ستویر بیت.

**خرس(Xêrs):** هرچ.

**خرست(Xerest):** گەلەک سەرخوەش، زێدە مەست.

**خرستە(Xêrêstê):** زێری.

**خرسک(Xêrsek):** کورتکریا پەیڤا

(خرس = هرچ) ـ هرچێ بچویک ـ کـــودیکا هرچێ ـ جـــۆرەکێ مەحفویرایە کو پویرتکێ وێ درێژە.

**خرسند(Xursend)**: خـوەشـحـال، شاد، کەیف خوەش.

**خرفستر(Xerfester)**: گیانەوەرێ ب زیان، وەکی: مـار، دوپـشـک، زرکێتک، کولی و......هتد.

**خـرک(Xerek)**: کـەرێ بچـویک ـ چارپێکا کـو کـارگـەر ل دەمێ ئاڤاکرنا خانی لسەر کار دکەن ـ ئالاڤـەکێ بچـویکە کـو تێلێن ئامیرێن موزیکێ وەکی (سنتور و بزقێ) لسـەر را دبورن ـ جـۆرەکێ خورما هشک کریە.

**خرکمان(Xerkeman)**: تەلها کو بـۆ طوری و رویـڤی و گـــــورگ و......هتد دهێتە ڤەدان.

**خرکوف(Xerkûf)**: بوم یان کـوندا مەزن.

**خرگاە(Xergah)**: خیڤەتا مەزن.

**خرگوش(Xergûş)**: کێڤـرویشـک ـ هەروەسا ناڤێ بورجەکێ یە ژێ.

**خـرم(Xurrem)**: شـاد، خـوەش ـ جهەکێ تازە و خوش.

**خرما(Xurma)**: خورمە.

**خـرمـا بن(Xurma bun)**: دارا خورمێ.

**خرمک(Xermek)**: موهرکێن رەش و سپی کو دئێخنە ستویێ بچویکا دا نەئێتە چاڤێن کرن.

**خرمگس(Xermeges)**: کـەرمـوز. هەروەسا (خرمنج) ژی لکارە.

**خرمن(Xermen)**: گەنم یان جەهێ ئامـادە کـو پشـتی گـێـرەکـرنێ و دانەبای ل بێـــدەرێ هاتبـــتـــە کۆمکرن.

**خـــرمنکوب(Xermenkûb)**: جەنجەر.

**خرمنگاە(Xermengah)**: بێدەر.

**خرناس(Xurnas)**: دەنگێ خرخرێ دەمێ ژ گـەوریا کـەسێ نڤـسـتی دهێت.

**خـــروار(Xervar)**: خـــرار، بارێ کـەرەکی کـو نێـزیکی سێ سـەد کیلوگرامایە ـ وەکی کەری، مـینا کەری.

**خروس(Xurûs)**: دیکل. هەروەسا پەیڤێن(خرو، خروچ، خروە وخرە) ژی لکارن.

**خـــروس خـــوان(Xurûsxwan)**: دەمێ سپـێدێ وەکی دیکل بانگ

ددەت.

**خروسە(Xurûsê)**: تیتلکا قوزی.

**خروش(Xurûş)**: هەوار و قیری ل دەمێ قەهرینێ ـ هۆسە و هەرا، دەنگ و دۆر.

**خروشیدن(Xurûşîden)**: هەوار راهێلان، قیژی ڤەدان.

**خرە(Xurre-ê)**: نویرە، گوری، تیروژک، روناهی.

**خریدار(Xerîdar)**: بکڕ.

**خریدن(Xerîden)**: کڕین(کاریێ کڕینا تشتەکی و بەرامبەر وی تشتی پارە دان).

**خریش(Xerîş)**: سەلخ(جهێ سەلختی) ـ ترانە و پێ ترانک.

**خز(Xez)**: کویژک(گیانەوەرەکێ بچویکێ ب چچکە، وەکی سڤورەیە و کوریا وی درێژە و تێر موی یە، کەڤلێ وی قەهوائی یان ب رەنگێ خوەلیێ یە و بن حەفکا وی سپی یە. پرانیا جاران ب شەڤ دەردکەڤیت و فرندێن بچویک دگریت و خوینا وان دمێژیت، هەروەسا مار و مشکا ژی نێچیر دکەت و کەڤلێ وی گرانبهایە).

**خزان(Xezan)**: پاییز، وەرزێ پاییزێ ـ خشۆک(هەر کەسێ یان هەر تشتێ وەکی ماری ب رێڤە بچیت).

**خزرک(Xezrek)**: ترس.

**خزندگان(Xezendêgan)**: ئەو دەستەیە ژ گیانەوەرا کو وەکی ماری برێڤە دچن(ئانکو خوە دخوشینن)، مەرج نینە کو ب پێ بن یان د بێ پێ بن، هندەک ژ وان وەک نموونە: (تمساح، مارگویسە، مار، کویسەلە)نە.

**خزیر(Xezîr)**: خولی یا هێشتا گەرم، یان ژی هێشتا ئاگر دناڤدا هەبیت.

**خس(Xes)**: پویش و پەلەخ ـ مرۆڤێن شویشتی و چوننە.

**خسانیدن(Xesanîden)**: جوبتن ـ لەق دانان.

**خسبانیدن(Xesbanîden)**: نڤاندن.

**خسبیدن(Xesbîden)**: نڤستن، د خەو چوون.

**خستر(Xester)**: بنێرە: (خرفستر).

**خستن(Xesten)**: ئێشاندن،

بریندارکرن. پەیڤا (خستە: Xes-tê) هەر ژ ڤی ژێدەری یە، ئانکو: ئێشـاندی، بریندار، نەخـوەش، خـودان ئێش، وەسـتیـای و رێنج دیتی ژ بەر کـارێ زێدە یان برینا رێکێن ب ڤـەکـێش. هەروەسـا پەیڤا (خستگی: Xestêgî) ژی ژ ڤـی ژێـدەری یـە، ئـانـکـو: ماندیبوون، وەستیان.

**خستو(Xestû):** کەسێ کو دان پێـدانێ ب تشـتـەکی بکەت ـ بەرک، وەکی: (بەرکێن مـژمـژا و خوخا و خورمێ و......هتد)، بۆ ڤێ ئانکویێ (خسـتـە و هسـتـە) ژی لکارە.

**خستوانە(Xestevane):** جلکێن کو دەروێشا دکرنە بەر خوە و ئەڤ جلکە ژ هریێ دهاتنە چێکرن.

**خسر(Xusur):** خەزویر و خەسوی.

**خسر(Xeser):** ئاڤـا کـو ژ بەر زێدەبوونا سـەرمـایێ د قـەرسـیت(جـمـد)، هەروەسـا پەیڤـێن: (یخ، هسـر، هسـیـر، هتشە، کاشە) ژی لکارن.

**خسرو(Xusro):** شـاه ـ نازناڤێ چەندین شاهێن ساسانی یانە.

**خسودن(Xusûden):** دروین(دروینا گیای ژ ئەردی).

**خش(Xuş):** خەسوی. هەروەسـا پەیڤێن(خوش، خشـو، خشـور، خشـامن، خشـتـامن، خشـدامن، خوشدامن، خاش) ژی لکارن.

**خش(Xeş):** سەلخینەکـا بچویک ل سەر هەر تشتەکی.

**خشاب(Xeşab):** سـاجـۆرێ فیشەکا.

**خشار(Xêşar):** گیایێ ب زیان یان چقێن بێ مفا کو پێتڤی ئادەکرنێ و کەزاختنێ بن.

**خشت(Xêşt):** لبنە، کەرپیچێ نە قەلاندی ـ خشت، رما بچویک(کو جۆرەکێ چەکی بوویە و د کەڤن دا دهاتە بکارئینان).

**خشتە(Xeşte):** هەژار، دەستکورت، مفلس.

**خشک(Xuşk):** بێ ئاڤ ـ هشک ـ چرمسی.

**خشکانج(Xuşkanec):** لاواز، لەغەر.

**خشکاندن(Xuşkanden):** هشک کرن، چرمساندن.

**خشکیدن(Xuşkîden):** هشک

بوون ـ چرميسن.

**خشم(Xeşm)**: قەهر، تورە.

**خشمگين(Xeşmgîn)**: قەهرى، تورەبووى.

**خشن(Xeşên)**: گر(بەروڤاژى پەيڤا هوير) ـ زڤر.

**خشنگ(Xeşeng)**: سەر كەچەل ـ حوچ، حوت، كەسێ كو سەرێ وى موى لێ نەبت.

**خشنود(Xuşnûd)**: شاد، خوەشحال، كەيفخوەش.

**خشنى(Xuşnêy)**: ژنا خرابكار، قەحبە.

**خشودن(Xuşûden)**: كەزاختن (يا دارا).

**خشوك(Xeşûk)**: بيژى.

**خفت(Xêft)**: گرێ(گرێ يا كنفى يان وەريسى).

**خفت(Xuft)**: نقست.

**خفتان(Xeftan)**: جل و بەرگێن شەرى.

**خفتانيدن(Xuftanîden)**: نڤاندن ـ گەڤزاندن ـ گرێلكرن.

**خفتك(Xuftek)**: كابويس.

**خفتن(Xuften)**: نقستن، د خەو چوون.

**خفتى(Xêftî)**: رستكا زێرى كو دمينيتە ب حەفكێ ڤە و شورِ نابيتە سەر سينگى، گەردەنى.

**خفده(Xefde)**: چەمياى، خوەهر.

**خفرگ(Xefreg)**: بێ غيرەت، بێ ناموس ـ پويچ، بێ سنج ـ ئەحمەق.

**خفگى(Xefêgî)**: تەنگە نەفەس ـ خەندقين ب كنفى يان هەر تشتەكێ دى.

**خفه(Xefê)**: خەندقى.

**خفيدن(Xefîden)**: بێهن هلكێشان ـ بێهنشتن ـ پەسەندكرن ـ سەرنياس ـ ناڤدار، ب ناڤ و دەنگ.

**خكشك(Xekuşk)**: گوزكێ نەخشاندى و رەنگين يێ كو ژ تەقنا تايبەت ب جێركاڤە هاتبيتە چێكرن.

**خل(Xul)**: كێم عاقل ـ ئەحمەق ـ هەبلە ـ خوەلى.

**خل(Xêl)**: ئاڤا كو ژ دفنا مرۆڤى يان گيانەوەرا دهێتەخوار.

**خلاش(Xelaş)**: هوسە و هەرا، دەنگ و دۆر ـ ئەردێ ربسى.

**خلاندن(Xelanden)**:

تێـڕاكـرن(وەكی شـویژن یان سـتـری و......هتد كو بكەنە د لەشی را).

**خـلاوه(Xelave):** سـەرگـەردان، حەیران، ب دنیایێ كەفتی.

**خلبـان(Xeleban):** فـرۆكـڤـان، شوفێرێ فرۆكێ.

**خلپله(Xelpele):** چەوتی ـ فەند و فێل ـ كارێ نە رێک و پێک.

**خلخ(Xellux- Xullex):** ناڤـێ كێمەنەتەوەكا توركا بوو ل نێزیكی (سیحون) كو لـجەم شاعرێن كەڤن د ناڤدار بوون ب جوانی و دەلالیێ و مـشـە د هۆزانێن خـوەدا بكار ئانینە. هەروەسـا (خـرلخ، خـرلق، قرلق) ژی لكارن.

**خلر(Xuller):** كەلیک، كەلینوک ـ ناڤێ باژێركـەكی یە ل نێـزیک باژێرێ شـێـراز كـو تریێ وێ یێ ناڤـداره، ب تایبـەتی بۆ چێكرنا مەیێ.

**خلن(Xulên):** كلمیشوک.

**خلولیـا(Xulûlêya):** نەخـوەشی یەكـا دەمـاغی یە(دهێت وەكی دیناتییێ) ـ زرشـەرمی ـ زرشـەرم ـ نەترسی.

**خله(Xele):** بەفـری یا كـو قـایكێ پێ دهاژون ـ هەر تشتەكێ سەرتیژ كـو بـچـیـتـه د تشـتـەكێ دیرا، وەكی(شـویژن، سـتـری، سـیـخ و......هتـد) ـ پویچ و بێ مـفـا ـ دەنگ و دۆر، هوسە و هەرا.

**خم(Xem):** خـەمـوەهـر، خـەمـوار، وەربادای.

**خم(Xum):** گـوزكێ مـەیێ یان سیهكێ یان ئاڤێ ـ داهۆل.

**خماخسرو(Xumaxusro):** ناڤێ ئێک ژ ئاهەنگێن كەڤنێن موزیكا ئیرانی یە.

**خماش(Xemaş):** گلێش.

**خمـان(Xeman):** كـڤـان(كـڤـانا تیرهاڤێژیێ).

**خماندن(Xemanden):** چەماندن، خوەهركرن.

**خمـانیدن(Xemanîden):** ب زار تشتەكی یان كەسەكی ڤەكرن.

**خمپاره(Xumparê):** گوللا تۆپێ.

**خمـخانه(Xumxanê):** مەیخانە، مـەیكەدە ـ دل(صـوفی ل شـوینا پەیڤـا دل، زاراوێ خـمـخانە بكار دئینن).

**خمـیـازه(Xemyazê):** باوشكێن خەوێ.

**خن(Xen)**: عنبارا د بنێ بەلەما (باخیرا)دا ـ کون.

**خنبە(Xunbê)**: گوزکێ مەزن ـ کوار.

**خنبیدن(Xunbîden)**: دەست قوتان، چەپلەقوتان، دەڤ قوتان ـ سەماکرن.

**خنج(Xenc)**: ناز ـ شادی ـ سوود، قازانج.

**خنجیر(Xêncîr)**: بێهنا زویراندنا موی و هریێ یان سوتاندنا هەستی، هەروەسا موی و هری و هەستیێ سوتی.

**خندان(Xendan)**: دەڤ ل کەنی.

**خنداندن(Xendanden)**: کەناندن.

**خندستان(Xendêstan)**: جهێ ترانە و یاری و پێکەنینێ ـ دڕکەیە ژ لیڤێن یارێ.

**خندە(Xendê)**: کەنی.

**خندیدن(Xendîden)**: کەنین.

**خنشان(Xunşan)**: پیروز، مبارەک.

**خنک(Xunuk)**: هین، فێنک، سار ـ باش و خوەش ـ پیروز و مبارەک.

**خنگ(Xêng)**: سپی، هەر تشتێ سپی ب تایبەتی هەسپێ سپی ـ هەبلە، دەبەنگ.

**خنگال(Xengal)**: کون.

**خنگل(Xengel)**: زری و کومزری.

**خنوز(Xenûz)**: ئامانێن کو ژ تەقنێ هاتبنە چێکرن.

**خنیا(Xunya)**: سروود ـ ئاواز.

**خنیاگر(Xunyager)**: سروودبێژ ـ ئاوازخوان ـ موزیکژەن.

**خنیدن(Xunîden)**: دەنگڤەدانا دەنگی ل چیای و حەمامێ و........هتد ـ ناڤداربوون ـ هەلبژارتن و پەسەندکرن.

**خو(Xû)**: خولق، سروشت، طبعەت.

**خواب(Xab)**: خەو.

**خواباندن(Xabanden)**: نڤاندن.

**خواب دیدن(Xabdîden)**: خەون دیتن.

**خوابیدن(Xabîden)**: نڤستن.

**خواجە(Xacê)**: خودان، مەزن، سەروەر، شێخ ـ مالدار، زەنگین، دەولەمەند ـ خساندی (زەلامێ خەساندی ـ پەیڤا ب ڤێ ئانکویێ ژ پەیڤا «خواجە سرا» هاتیە وەرگرتن و هێدی هێدی پەیڤا

«سرا» ژێڤە بوویە و خواجە ب تنێ مایە.. پەیڤا «خواجە سرا» بو وان زەلاما دهاتە گوتن یێن کو دبوونە خولام د مالا مەزنی یان ئاغای یان سەروکی......دا، و ئەڤ کەسێ کو دبوو خولام، ل دەستپێکێ دهاتە خەساندن پاشی دهاتە دامەزراندن وەک خولام ل مالا وی مەزنی.

**خوار(Xar):** حەقیر، زەلیل ـ تاڤ ـ هەروەسا هەیڤ.

**خواربار(Xarbar):** خواردەمەنی، ئەرزاق، ئازوقە.

**خوازە(Xaze):** داخواز.

**خواست(Xast):** داخواز ـ حەز.

**خواستگار(Xastgar):** خوازگینی.

**خواستن(Xasten):** هیڤی کرن ـ داخوازکرن ـ خواستن ـ ئارەزوو هەبوون ـ حەزژێکرن ـ گازیکرن(دەمێ گازی ئێکێ بکەن کو بنک ڤە بهێت).

**خواستە(Xastê):** زێر و مال و دارایی.

**خوالیگر(Xalîger):** زاد چێکەر، خوارن لێنەر(طباخ).

**خوان(Xan):** سفرە ، خوان ـ ئادە.

**خواندن(Xanden):** خواندن.

**خواهر(Xaher):** خوبشک، خوه.

**خواهر اندر(Xaher ender):** خویشک و برایێن کو نە ژ دەیکەکێ یان نە ژ بابەکێ بن.

**خواهر خوانده(Xaher xandê):** کچەک یان ژنکەک کو کەسەکێ ب خوبشکینی وەرگریت و ناڤێ خوبشکێ لێ بنێت.

**خواهش(Xahêş):** ئارەزوو.

**خواه ناخواه(Xah naxah):** بڤێت نەڤێت، چ بڤێت یان نەڤێت.

**خوب(Xûb):** باش، قەنج ـ جوان، دەلال، خشکوک.

**خوچ(Xûç):** کوفیکا دیکلی.

**خود(Xod):** کومزری(کولاڤێ ئاسنی ئەوێ کو شەرڤانا د شەرا دا دکرنە سەرێ خوە) ـ خوە(ئەز بخوە، ئەو ب خوە) ـ خوەیی(بەروڤاژی بیانی، وەکی: یێ مە بخوەیە، خوەیی یە).

**خور(Xor):** تاڤ، رۆژ ـ رۆژا یازدێ ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی ـ خوارن، خواردەمەنی.

**خورا(Xora):** ژ هەژی، ب سەرڤە، لایق ـ خواردەمەنی.

**خوراک(Xûrak):** تشتێ کو بێته خوارن، زاد، خواردەمەنی.

**خوردن(Xorden):** خوارن.

**خورشید(Xorşîd):** تاڤ، هەتاڤ، خۆر.

**خورند(Xorend):** ژ هەژی، ب سەرڤە، لایق.

**خوره(Xorre):** نویرە، گوری، تیرۆژک ـ مەزناهی ـ دەڤەر(ناحیة).

**خوزی(Xûzî):** ڤەقوتای(گوشتێ ڤەقوتای).

**خوست(Xust):** دورگە، گزیرتە(جزیرە) ـ ڤەقوتای، هەرشاندی.

**خوش(Xoş):** باش، قەنج ـ شاد ـ خوەش.

**خوشە(Xûşê):** ئویشی(ئویشێ تری).

**خوک(Xûk):** بەراز.

**خولە(Xûlê):** خالی، ڤالا.

**خون(Xûn):** خوین.

**خوندگار(Xûndgar):** خودان، سەروەر.

**خونی(Xûnî):** خوینەلۆ، خویناوی ـ کوژەک، ئەو کەسێ کو ئێک کوشتبیت(قاتل).

**خونین(Xûnîn):** خوینەلۆ، خویناوی.

**خوهل(Xûhl):** خوەهر، خوار، چەمیای.

**خوی(Xûy):** سروشت، طبعەت ـ خوه(عەرەقا کو ژ لەشی دەردکەڤیت).

**خوید(Xevîd):** گەنم یان جەهێ کو هێشتا گولی نەدابیت. ب عەرەبی دبێژنێ(قصیل).

**خویش(Xîş):** کەس و کار، خزم، نیاس.

**خە(Xeh):** وەی، وەه؛ پەیڤا قەنجی پێ یە، وەکی دبێژن(وەه/وەی پا یا باشە!).

**خیابان(Xîyaban):** جاددە(شارع).

**خیار(Xiyar):** خیار(جورەکێ فێقی یە).

**خیتال(Xîtal):** ترانە، یاری ـ نەوەیی، درەو.

**خیدن(Xîden):** چەمیان، خوبل بوون.

**خیرە(Xîrê):** بی ترس، بێ شەرم ـ حەیبیری، سەرسورمای ـ بێهودە.

**خـــیــزاندن(Xîzanden):** ژ ئەردی بلندکرن.

**خـیـزیدن(Xîzîden):** خـوشین(وەک مـاری ب رێڤـەچوون) ـ حـولسین، تەحـسـین ـ خـوە هاڤـێتن، خـوە هلاڤێتن.

**خیس(Xîs):** تەڕ، شل.

**خیش(Xîş):** هەڤجار(ئامیرەک بوو د کەڤن دا دئێخستنە ستۆیێ گاجۆتا و ئەرد پێ دکێلان.).

**خیک(Xîk):** مەشک.

**خیم(Xêym):** برین(برینا بریندارى) ـ تف، گلیـز ـ ئاڤـا کـو ژ دفنێ دهێتە خوار ـ کنیشتێ چاڤی.

**خـیـو(Xeyû):** تف، گلیـز، ئاڤـا دەڤی.

# د

**د(Dal):** تیپا دەهێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی. د گەلەک پەیڤان دا دبیتە (ت)، وەکی: (زردشت = زرتشت، دشک = تشک)، و د کەڤن دا هندەک جارا ل شوینا (د)ێ (ذ) دادنان ئەو ژی هەگەر تیپا بەری (د)ێ ساکن یان تیپێن علله(و، ا، ی) بان، وەکی: (گنبد = گنبذ، گشود = گشوذ)، لێ نهو چو پویتە ب ڤی قاعیدەی نائێتەکرن و (د) ل جهێ خوە و (ذ) ژی ل جهێ خوە بکار دهێن.

**دائی(Da'î):** خال، برایێ دەیکێ.

**داپرزە(Daperze):** حاجی رەشک.

**داچک(Daçek):** گوهارک.

**داخل(Daxul):** داهۆل.

**داخم(Daxêm):** رزقێ رۆژێ.

**داخیدن(Daxîden):** ژ هەڤ جوداکرن، پەلاتەکرن، بژالەکرن.

**داد(Dad):** قانون، یاسا ـ داد(عدل) ـ وژدان ـ بەخشیش، دان ـ باهر ـ نەسیب، قسمەت ـ هەوار و دەنگێ بلند.

**دادا(Dada):** خزمەتکارێ پیر ـ باپیر. هەروەسا (دادک، دادو، دادا، ددە) ژی لکارن.

**دادار(Dadar):** دادگەر، عادل، حاکم ـ ئافرندە(خالق).

**داداش(Dadaş):** برا.

**دادر(Dader):** برا ـ دەستەبرا، هەڤالێ کو مرۆڤ وەکی برایێ خوە حەژێ بکەت ـ دادگەر(عادل، حاکم).

**دادرک(Dadrek):** برایێ بچویک.

**دادرند(Dadrend):** برایێ مەزن.

**دادن(Daden):** دان(تشتەک دانەڤ دەستێ ئێکی).

**دادوند(Dadvend):** بەرابەر،

یەکسان، تەمەت هەڤ.

**دار(Dar):** دار، ب ڤێ ئانکوبێ پەیڤا (درخت) ژی لکارە ـ کاریتە ـ سێپێکا خەندقاندنێ، سێدارە.

**دارا(Dara):** هەیی، دەولەمەند، زەنگین، مالدار.

**دارائی(Dara'î):** سامان ـ جورەکێ پەرۆکێ ئارمویشی یە ـ دارایی(رێڤەبەری یان وەزارەتا دارایی).

**داركوب(Darkûb):** دارکوکە. هەروەسا ناڤێن (دارکو، دارتوک، داربر، دارشکنک، دارسنب، درخت سنبە) ژی لکارن.

**دارو(Darû):** دەرمان(دواء) ـ دەرمانک، بهاراتێن زادی.

**داریک(Darîk):** ناڤێ وی پارێ زێری یە یێ کو ل سەردەمێ «داریوش کبیر» و ب فەرمانا وی هاتیە بکارئانین.

**داس(Das):** شالوک.

**داستان(Dastan):** چیروک، چیڤانوک، سەرهاتی.

**داش(Daş):** کوبرهە(کو جێرکا و تابۆکا تێدا دقەلینن) ـ برا.

**داشاد(Daşad):** بەخشیش، دان، پاداش.

**داشتن(Daşten):** هەبوون ـ ماتی ژێکرن، چاڤدان، بخودانکرن.

**داشخار(Daşxar):** ژەنگار(ژەنگارا ئاسنی).

**داغ(Dax):** گەلەک گەرم، گورە ـ داخ، نیشان، جهەک ژ لەشی کو هاتبیتە سوتن یان داخ کرن ـ خەم و کوڤان.

**داغان(Daxan):** بژالە، پەلاتە.

**داغمە(Daxme):** قەشاڤی بوونا لێڤا ـ تامێسک، شەڤ ترسک.

**داغول(Daxûl):** فێلباز، حیلەکەر.

**داغینە(Daxînê):** کەڤن و ژ کارکەفتی ـ ئاسنێ شاراندی کو لەشێ مرۆڤی یان گیانەوەرا پێ داخ دکەن.

**دال(Dal):** شاهین، بازی.

**دالان(Dalan):** کولانا سەرگرتی.

**دالبوز(Dalbûz):** حاجی رەشک.

**دالمن(Dalmen):** بنێرە: (دال).

**دالیز(Dalîz):** بنێرە: (دالان).

**دام(Dam):** تەلهە، هەر تشتەکێ کو بۆ نێچیرکرنێ بهێتە بکارئینان ـ گیانەوەرێ کویڤی لێ بێ ئازار، وەکی: (خەزال، شڤر)، هەروەسا

گیانەوەرێن کەهی، کو مرۆڤ ل مال بخودان دکەت، وەکی: (چێل، پەز، هەسپ و حێشتر و......هتد).

**داماد(Damad):** زاڤا.

**دامان(Daman):** دانگ، دەهمەن(دەهمەنا چیای، یان دەهمەنا جلکا). هەروەسا (دامن، دامنە) ژی لکارن.

**داموز(Damvez):** سەلک، سەڤی ـ بەفری یا بەفرێ.

**دان(Dan):** پاشگرێ(دان، دانک) کو ئانکویا جهی ددەت، وەکی: (آتشدان = ئاگردانک، چایدان = چایدان) ــ دندک، بەرک، تۆڤ(دندکێت گەنمی، بەرکێت حولیکا، تۆڤێ گولا) ــ تۆمک(خوارنا کو دکەنە بەر فرندا) ـ هەروەسا ب کارێ بدویڤ خوەڤە ئانکویەکا دی ددەت، وەکی: (دان کردن = لب لب کرن، مینا لب لب کرنا هنارێ) ـ کارێ فرمانە ژ پەیڤا (زانستن) ئانکو: بزانە ـ هەروەسا هەڤواتایا (زان و ناس)ا کوردی یە دەمێ دگەل هندەک پەیڤێن مینا (تاریخ دان: مێژووزان، مێژووناس) دهێت.

**دانا(Dana):** زانا، پێ ئاگەهـ، هشیار، زیرەک.

**دانستن(Danêsten):** زانین.

**دانش(Danêş):** زانست، علم.

**دانگ(Dang):** باهر، بەش، پشک ـ ئێک ژ شەشێ ژ هەر تشتەکی.

**دانندگی(Danendêgî):** زاناتی، زانابوون.

**داننده(Danendê):** زانا.

**دانە(Danê):** دندک(دندکا هنارێ)، بەرک(بەرکێ خورمێ، خوخێ و......هتد)، لب(لبا نیسکێ، لبا نوکێ و......هتد).

**داو(Dav):** دۆر، نورە، گەر(نوبت) ـ هەروەسا (ادعا، دعوی)یا عەرەبی.

**داور(Daver):** دادڤان، حەکەم.

**داویدن(Davîden):** ادعاکرن.

**داه(Dah):** هژمارا دەه(١٠) ــ خودام.

**داها(Daha):** شکەفت ــ شکەن ـ چیا ـ دۆل.

**دای(Day):** دیوارێ ژ تەقنێ و لبنا هاتبیتە چێکرن.

**دایە(Dayê):** دادۆک، دایین، ژنا کو ب شیرێ خوە بچویکەکی بخودان

کەت. کۆما وان دبیتە «دایگان».
کـــاریَ کـــو «دایە» پیَ رادبیت
دبیَژنیَ «دایگی، دایگانی».

**دبستان(Debêstan):** خواندنگەها سەرەتایی.

**دبنگ(Debeng):** دەبەنگ، گیَژ، ئەحمەق.

**دبیت(Debît):** جـۆرەکیَ پەڕۆکی یە.

**دبیـــر(Debîr):** نقـــیـــســـەر ـ مامۆستاییَ قوناغا دواناڤنجی.

**دبیـــرســـتـــان(Debîrêstan):** خواندنگەها دواناوەندی.

**دچار(Duçar):** گـــرفـــتـــار، تووش(دچار شدن: گرفتار بوون، تووش بوون) ـ ڤـــیَککەفـــتنا ژ نشکەکیَ ڤە.

**دخ(Dex):** خوری(خالص) ـ باش، قەنج ـ دەستەک، فەوج.

**دخ(Dux):** کورتکریا پەیڤا (دختر = کچ، دوت) ـ ناڤیَ دارەکیَ یە.

**دخـالت(Dexalet):** مـایتـیَکرن. هەرچەندە ئەڤ پەیڤـە ژ زمـانیَ عـــەرەبی هاتیـــە وەرگـــرتن لیَ د عەرەبی دا نینە، بەلکو ب عەرەبی دبیَژنیَ(مداخلە).

**دختـــر(Duxter):** کچ . هەروەسا (دخ، دخت، دوشیزە) ژی لکارن.

**دخش(Dexş):** دەستـپیَک، سەرەتا ـ رەش و تاری.

**دخم(Dexm):** گۆڕ، قەبر. هەروەسا (دخمـە، سرداب، سردابە، گـور) ژی لکارن.

**دخـو(Dêxev):** خـودانیَ گـوندی، مەزنیَ گوندی ـ زەلامیَ دەبەنگ و ئاقل سـڤـک ـ ناڤیَ زەلامـەکیَ هەبلەیە کـــو خـــەلکیَ دەڤـــەرا «قـــەزوین» بوویە و گـــەلەک چیـروکـیَن ب کـەنی ژیَ هاتینە ڤەگوهاستن.

**دد(Ded):** دڕندە. هەروەســا (ددە) ژی لکارە.

**ددر(Deder):** کـــۆلان و بـاژیَر، ژ دەرڤەی مال.

**در(Der):** د، د ناڤــــدا، هوندر ـ هندەک جارا دگەل هندەک ژیَدەران دهیَت و ئانکویا وان دگـوهۆرت، وەکی: (افــتــادن = کـەفتن، در افتـادن = دگەل کەسەکی ب شەڕ چوون؛ یـان: آمــــدن = هاتـن، درآمـدن = چوونەژۆر، یان هاتنە ژ دەرڤـــە) ـ رەخ، ســـەمت، ئال ـ

دەر(دەرێ خانی) ـ دۆل، یان رێکا کو د دۆلا را دبۆرت.

**درا(Dera):** زەنگل، زەنگ(جرس) ـ فرمانە ب دەرکەفتنێ(دەرکەڤە).

**دراز(Dêraz):** بلند ـ درێژ.

**درازا(Dêraza):** بلندی، درێژی.

**درازکشیدن(Dêraz kêşîden):** خوە درێژ کرن، ل سەر ئەردی نڤستن، بێهنڤەدانا سەر پشتێ، رازان.

**درامد(Deramed):** مفا، سوود، داهات.

**درایدن(Derayîden):** گۆتن، ئاخفتن، ستران گۆتن، قێری راهێلان.

**دربا(Derba):** پێدڤیاتی.

**درباختن(Derbaxten):** یاری کرن ـ دۆڕاندن، ژ دەست دان.

**دربار(Derbar):** بارەگا، کوچکا پاشاتیێ.

**دربدر(Derbêder):** دەربەدەر، ئاوارە ـ ژ دەرەکی بۆ دەرەک دی، ژ خانیەکی بۆ خانیەک دی(دەمێ مرۆڤ ل کەسەکی یان ل تشتەکی دگەرییێت).

**دربر(Derber):** ل هەمبێز.

**دربند(Derbend):** رێکا تەنگ و زراڤ ل چیای، رێکا ل ناڤبەرا دو چیایان ـ دۆل ـ کەلە ـ قەیدکری، گرفتار، ئێخسیر.

**درپی(Derpêy):** پنیکێن کو دئێخنە سەر جلکێن دڕیای ـ لدویف را، ل پەی.

**درجا(Derca):** د جهێ خوەدا.

**درچه(Derçê):** کورتکریا پەیڤا (در = دەروک).

**درخت(Dêrext):** دار.

**درختستان(Dêrextêstan):** دارستان.

**درخش(Dêrexş):** رۆناهی، رۆشنایی.

**درخشان(Dêrexşan):** روناهی دەه، تەبیسۆک.

**درخشیدن(Dêrexşîden):** رۆناهی دان، تیروژک ڤەدان، تەبیسین.

**درخف(Durxuf):** زرکێتکا رەش.

**درخواست(Derxast):** داخواز، هیڤی(رجاء).

**درخور(Derxor):** ژ هەژی، ب سەرڤە، لایق.

**درد(Derd):** دەرد، نەخوەشی،

نەساخی.

**دردا(Derda):** پەیڤا مخابنییێ یە ئانکو: ئاخ!، ئوف! و......هتد.

**درز(Derz):** دەرز، شکەن، کەلشت.

**درزمان(Derzman):** بەنکێ کو دئێخنە شویژنێ یان دەرزیکێ بۆ کارێ دروینێ.

**درزن(Derzen):** شویژن.

**درزە(Derzê):** گرزێ گیای، پشتییێ دارا.

**درست(Durust):** دروست، بێ عێب ـ جهێ باوەرییێ ـ موکوم.

**درش(Derş):** گۆڤ، گۆڤا دەوارا.

**درشت(Duruşt):** زڤر، بەروڤاژی نەرم ـ گر، تشتێ کو قەبارێ وی ژ جۆرێ وی یێ سەرەکی مەزنتر بت.

**درغالە(Derxale):** رێکا کو د ناڤبەرا دو چیایان را ببۆرت.

**درغم(Derxem):** ناڤێ ئێک ژ ئاهەنگێن کەڤنێن موزیکا ئیرانی یە ـ ناڤێ گوندەکێ یە ل سەمەرقەند.

**درغمی(Derxemî):** خەلکێ دەرغەم، یان هەر تشتەکێ کو یێ گوندێ دەرغەم بت، پتر بۆ مەیێ لکارە چونکی مەیا دەرغەم یا ناڤدارە.

**درغیش(Derxîş):** گەلەک، فراوان، گەلەک کەتبیتە سەرێک(وەکی بەفرێ).

**درفش(Dêrefş):** شویژنەکا ستویر و سەرتیژە کو دەستکەکێ داری یێ پێڤە و بۆ پێلاڤ دروینێ دهێتە بکار ئینان و کارێ وی ژی کونکرنا چەرمی یە ـ ئالا، وەکی: (درفش کاویان).

**درفشان(Dêrefşan):** بنێرە: (درخشان) ـ هەژهەژۆک.

**درکشیدن(Derkêşîden):** ڤەخوارن، فرکرن. هەروەسا ب پەیڤا بەری خوەڤە ئانکوا وێ دهێتە گوهارتن، وەکی: (دامن درکشیدن = خوە پاشڤەکێشان. دم درکشیدن = بێ دەنگ بوون، خوە مت کرن.).

**درگاه(Dergah):** دەرگەهـ، دەرازینک، جهێ دەر دکەڤتێ(مەلبەن).

**درگذراندن(Derguzeranden):** زێدەکرن، ژ حەدی دەرێخستن.

**درگذشت(Derguzeşt):** مەرگ، مرن ـ مر(بۆ سێیەم کەسێ تاکێ).

**درگــــــذشتن(Derguzeşten):** بــۆريــن، چــۆن، دەربــازبــوون، ڤ بەركــەتن ـ لێــبــۆرين، عــەفــوكـرن، مرن.

**درگر(Durger):** دارتراش(نجّار).

**درگرفتن(Dergêrêften):** ئاگر تێ بەربوون، سۆتن ـ كارتێكرن.

**درگيـر(Dergîr):** گـرفـتـار، تووش بووی.

**درلک(Dêrlêk):** جلكێ كـورتێ بێ هچک.

**درما(Derma):** كێڤرويشک.

**درمان(Derman):** دەرمان(دواء) ـ چاره، چارەسەری(علاج).

**درمــــــاندن(Dermanden):** بێچارەبوون، وەستيان.

**درنا(Durna):** فـرندەكێ كـوبڤی يه و گوشتێ وی حەلاله، پێيێن وی و گـەردەنا وی ددرێژن و كـوريكا وی كـورته و پتـر ل بەر لێـڤـێن ئاڤـا دژيت. ل ئەسـمـانا كـۆم كـۆم و ب رەنگێ سـێگوشێ(مـثلث) دفـرن. هەروەسـا ناڤـێن (كلنـگ، باتر)ژێ هەنە. ب عەرەبی دبێژنێ(كركی).

**درنگ(Dêreng):** دەنگـێ زەنگـێ، دەنگێ كو ژ ڤێككەتنا دو تشتێن ئاسنی دهێت ـ خـوه ڤـەهێـلان، هێدی(بەروڤاژی «لەز»).

**درو(Dêro):** دروين(دروينا گـەنمی و جەهـ و نۆكا و......هتد).

**دروا(Derva):** پێــــدڤـــيـــاتی، پێـــويســـتی ـ هەلاويســـتی ـ سەرنوخين ـ سەرگەردان.

**درواخ(Dervax):** مـــــوكــــوم ـ ساخلەم، لەش ساخ، تەندروست.

**دروازه(Dervazê):** دەرێ مـــــەزن (دەرێ باژێری، دەرێ كەلهێ).

**درواژ(Dervaj):** بنێره: (دروا).

**دروانه(Dervane):** نەقـەب(كــونا كـو ل بانی دهاته ڤـەكـرن و د وێرێ را دچوونه سەربانی).

**درواه(Dervah):** بنێره: (دروا).

**درود(Durûd):** دوعـــا ـ ســلاڤ ـ مــەدح و ســەنا ـ دار، دارێ بری، دەپ(لوحة).

**درودگــــــــــــر(Durudger):** دارتراش(نجّار).

**دروش(Dêrevş):** بنێره (درفش).

**دروغ(Durûx):** درەو، نەوەبی.

**دروغگو(Durûxgû):** درەوكـــەر، درەوين. هەروەسـا پەيڤـێن (دروغ بـاف، دروغ پـرداز، دروغـــــزن،

دروغسار) ژی لکارن.

**دروک(Durûk)**: هـویـرکـێ داری، گەرگا داری.

**درون(Derûn)**: هوندر، ژ ناڤـدا ـ ناڤێ نـانەکی بـوو کـــو ل دەمێ زەردەشـتی یا و د رێ و رەسـمەکا تایبـەت دا پشـتی دوعـایا (درون) ژ ئاڤێـسـتـایێ دهاتە خـواندن ئەو نـان دکــرنە پـاری پـاری و لســـەر ئامادەبوویان بەلاڤ دکرن.

**دروند(Dervend)**: شۆک، چنگال.

**درونـد(Durvend)**: د ئـایـیـنـێ زەردەشتی دا دبێژنە وی کەسی یێ کـو هزرا وی و گۆتنا وی و کریارا وی خـراب بت، ئەو کـەسێ کـو ژ هەمی سالوخێن قەنج بێ بار بیت، خرابکار، بێ دین.

**درونە(Derûnê-e)**: زک، هونـدرێ زکی ـ کــڤــان، چەمــیـــای ـ کەسکوسۆر، کەسکوئالا.

**دروێــدن(Dêrevîden)**: درویـــن (کــارێ دروینا گــەنمی و جــەهی و......هتد).

**درویش(Dervîş)**: دەســـتکورت، هەژار، قەلەندەر، دەروێش، کەسێ کـو ب پچـەکـا مـالێ دنیـایێ قـانع بیت.

**درە(Derrê)**: دۆل، رێـکا کـــــو ل ناڤبەرا دو چیایان را دەرباز بیت.

**درهشـــــتـــــە(Derhêşte)**: دان، بەخشیش.

**درهــم(Derhem)**: تــێــکـــەل، د ناڤـێکدا ـ پەریشـان، تێکچـووی، ئەنی گرێ.

**دری(Derî)**: هەر تشـــتێ کـــو یێ دۆلێ بت، وەکی: کەوێ کو د ناڤ دۆل و نهـالا دا دژیت ـ هەر تشـتێ کـو یێ کـۆچکا شـاهی بت، پتـر (درباری) ل کارە ـ زمـانێ فـارسی یێ کـو پشــتی زمــانێ پەهلەڤی هاتیە بکارئینان.

**دریا(Derya)**: دەریا، ئاڤا گـەلەک کـو ئەردەکێ مـشـە ڤـەگـرتبـیت و برژیتە سەر ئوقیانوسا.

**دریــاچــە(Deryaçê)**: دەریـــایـــا بچــویـک ـ دەریایا کــو هەرچەند رەخێن وێ هشکی بن، گۆل.

**دریافتن(Deryaften)**: ڤـەدیتن، ب ســـەر تشــــتـــەکی هەلبـــوون، تێگەهشتن.

**دریچـــە(Derîçê)**: دەرگـــــەهێ بچویک، کولەک.

**دریدن(Derîden)**: دڕاندن.

**دریغ(Derîx)**: مخابن ـ کوڤان، خەم ـ پەشێمانی.

**دریواس(Derîvas)**: چار رەخێن خانی ـ چارچۆڤێ کو دەروک دکەڤتێ (مەلبەن).

**دریوزە(Deryûzê)**: گەدایی، خواستن.

**دزد(Duzd)**: دز، دزیکەر، کەسێ کو تشتێن خەلکی ببەت بێ ی ئاگەهی یا وان.

**دزدانە(Duzdanê)**: ب دزیڤە.

**دزدکی(Duzdekî)**: بنێرە: (دزدانە).

**دزدیدن(Duzdîden)**: دزین.

**دزغالە(Duzxalê)**: دیوارێ دۆرماندۆری کەلهێ یان باژێری، شویرهە ـ چەپەر.

**دزندیس(Dêzendîs)**: بەرابەر و ئێکسان، تەمەت هەڤ ـ وەکی، مینا، شتی ـ ئەشکەرا، خویا ـ دەملدەست، د گاڤێدا.

**دژ(Dêj)**: کەلە.

**دژ(Duj)**: پێشگرە کو لبەری هەر پەیڤەکێ بێت ئانکوا پیساتیێ و قەهرێ و دژاتیێ ددەتە پەیڤێ، وەکی: (دژآباد = قەهرگرتی، ئەنی گرێ ـ دژبراز = نەجوان، خاڤ).

**دژک(Dujek)**: خوریک ـ پەڤیشک.

**دژکاک(Dêjkak)**: تەیرێ کەلەخا.

**دژکام(Dujkam)**: تام تەحل ـ خەمگین ـ تۆرەبووی.

**دژم(Dujem- Dêjem)**: دامای، دلتەنگ، خەمگین، پەریشان.

**دژمان(Dujman)**: خەمگین، دلتەنگ ـ کوڤان و مخابنی.

**دژن(Dêjen- Dujen)**: تام نەخوەش ـ بەدرەفتار و تورەبووی.

**دس(Dês- Des)**: وەکی، مینا ـ هەڤتا (نظیر).

**دست(Dest)**: دەست (ئەندامەکێ لەشی یە) ـ یەکا هژمارێ، وەکی دبێژن (دەستەکێ فنجانا) ـ دۆر، جار، کەرەت، دەمێ دبێژن (دەستەکێ قومارێ).

**دستار(Destar)**: دەرسوک، شاشک.

**دستاس(Destas)**: دستار.

**دستان(Destan)**: کۆما پەیڤا (دست) ـ فێل، حیلە ـ سەختە، قەلپ ـ سروود، ئاواز ـ چیرۆک،

چیــــڤــــانوک ـ هەروەســـا د «شەهنامە»ا فردەوسی دا ئەو ناڤە یێ کو سیـــمـــەرخێ دانایە ســەر (زال)ێ بابێ روستەمی.

**دستکش(Destkeş)**: دەستگۆرک.

**دستە(Destê)**: دەستک(دەستکێ بڤری، دەستکێ شیری، دەستکێ گولا)ـ گرز(گرزێ گیای) ـ تیم، تیپ(وەک تیـمـا وەرزشکارا یان تیپا موزیکێ).

**دش(Duş)**: پێـشگرێ کـو لبـەری هندەک پەیڤـان دهێت و ئانکویا (پیس، کرێت، دژ) دگەهینت.

**دشت(Deşt)**: دەشت، بیـــابـان ـ ئێکەمین معاملا کو سپێدێ بکرِ و فروشەر دکەن.

**دشـتـــان(Deştan)**: ژنا کـو د بێ نڤێژاهییێ(عادێ) دا بیت.

**دشـتی(Deştî)**: یێ دەشـتێ ـ ناڤێ ئاهەنگەکا موزیکا ئیرانی یە.

**دشتی(Duştî)**: زێری.

**دشـــخـــوار(Duşxwar)**: دژوار، زەحمەت.

**دشک(Deşk)**: دەزی، بەنک.

**دشمن(Duşmen)**: دژمن، نەیار.

**دشنـام(Duşnam)**: خـــــەبـەر، ئاخفتنێن کرێت، جڤین.

**دشنگی(Deşengî)**: رۆژگار، دنیا، فەلەک.

**دشنە(Dêşne)**: خەنجەر.

**دشوار(Duşvar)**: دژوار، زەحمەت.

**دغ(Dex)**: ئـەردێ هـشـک و رەق، ئەردێ کـو گـیـا لێ شین نەبیت ـ هەروەسـا بۆ سـەرێ بێ مـوی ژی دهێتە گوتن.

**دغـا(Dexa)**: نەراست، نە دروست، سەختە، قەلپ.

**دغـدویە(Duxdûyê)**: کچ ـ ناڤێ دەیکا زەردەشت پێغەمبەری یە.

**دغسر(Dexser)**: کەچەل، شامی، سەرێ بێ موی.

**دغل(Dexel)**: نەراست، نەدروست، سەختە، قەلپ ـ فێل، حیلە.

**دف(Def)**: دەف(ئامیرەکێ موزیکێ یە).

**دفـــتـــر(Defter)**: دەفـــتـــەر ـ نڤـێـسـینگەهـ، مـەکـتـەب(جـهێ کاری).

**دفـزک(Defzek)**: مـەزن، قـەلەو، بخوەڤە.

**دفک(Defek)**: ئارمانج.

**دک(Dek)**: باهر، پشک ـ گـــەدا،

گەدایی.

**دکلان(Duklan):** تەشی.

**دگدگ(Degdeg):** دەنگێ شەق شەقا کو ژ ددانا دهێت لدەمێ سەرمایێ.

**دل(Dêl):** دل(قلب).

**دلام(Dêlam):** رما کورت ـ هەروەسا فێل و حیلە.

**دلخور(Dêlxor):** پەریشان، مەلویل.

**دلق(Delq):** جلکێ دەروێشا (خرقە).

**دلقک(Delqek):** لێبۆک(کەسێ کو کارێن ب کەنی بکەت و خەلکێ بکەنینت).

**دلم(Dulum):** خوریک.

**دلمل(Dulmul):** فەریک، کەلی نۆک.

**دلە(Dulme):** ئیپراخ، دۆلمە.

**دلەنگ(Dêleng):** هەلاویستی(وەکی ئویشێن خورمێ).

**دلواپس(Dêlvapes):** پەریشان.

**دلوار(Dêlvar):** دلێر، نەترس، دلاوەر، مێرخاس، نەترس.

**دلە(Dele):** ناڤێ گیانەوەرەکێ گوشتخوارە ـ کۆلانی، فەلیتە.

**دلهرە(Dêlhurê):** دلقوتک(ژ بەر ترسا ژ نشکەکی ڤە).

**دلیر(Dêlîr):** دلێر، ئازا، دلاوەر، نەترس، مێرخاس.

**دم(Dem):** هەوا، بێهن(نفس)ـ ئاخینک ـ هەوار ـ دەم، وەخت، گاڤ ـ دەڤ(دەڤێ کێرێ یان خەنجەرێ) ـ ئالاڤەکێ پفکرنێ یە کو زێرنگر و ئاسنگەر بکاردئینن بۆ گەشکرنا ئاگری.

**دم(Dum):** کوری، دویڤ.

**دما(Dema):** بێهن(نفس) ـ تێهن، پلا گەرمهێ یان سەرمایێ.

**دماسنج(Demasenc):** ئالاڤێ کو بۆ پیڤانا پلا گەرمهێ یان سەرمایێ بکار دهێت(میزان الحرارة، محرار).

**دماغ(Demax):** دفن، کەپو، پۆز.

**دمامە(Demame):** بلوول ـ زرنا.

**دمان(Deman):** مەست و غەزەبگرتی ـ کەسێ کو حرحرا وی بت و ب قەهر ڤە ل کەسەکێ دی بخورت.

**دمبک(Dumbek):** تمبلک(ئامیرەکێ موزیکی یە).

**دمبل(Dembêl)**: ئالاڤەکێ وەرزشی یە، ئەو ژی پێک دهێت ژ ئاسنەکێ کورت کو هەردو رەخێن وی ئاسن پێڤەنە و یاریکەرێن لەشجوانی یێ بکاردئینن.

**دمدمە(Demdeme-ê)**: حیلە، فێل ـ ناڤداری ـ داهۆل و دەنگێ داهۆلێ.

**دمدمی(Demdemî)**: دەمدەمی، کەسێ کو هەر گاڤ بۆ گاڤ ئاخفتنێن خوە یان بیر و باوەرێن خوە دگوهۆرت.

**دمر(Demer)**: بەراپشت، ڤاژی ـ نوخین، کەسێ یان تشتێ کو کەتبیتە سەر دەڤێ خوە.

**دمغ(Demex)**: شەرمکری.

**دم گرگ(Dumê gurg)**: سە و گورگ(مەبەست ژێ ئەو سپێدەیا درەوینە کو مرۆڤ سەی و گورگی ژێک نەنیاسیت، کو ئەو دەمە ژ پشتی نیڤە شەڤێ دەمێ دبیتە روناهی و مرۆڤ وە هزر دکەت کو ئەڤە بوو سپێدە و دێ هند بینیت کو دیسان دنیا تاری بووڤە).

**دم گرم(Demê germ)**: ئاخفتنا کو کارتێکرنێ ل گوهداری بکەت.

**دم لابە(Dum labê)**: کوری هەژاندنا سەی ژ بۆ خوە شرین کرن و مەللاقیێ.

**دمندان(Demendan)**: دوزەخ، جەهنەم، ئاگر.

**دمنە(Demne- Dêmênê)**: ناڤێ طۆری یەکا حیلەکەرە کو چیڤانۆکا وێ دگەل (کلیلە)ی د پەرتوکا (کلیلە و دمنە)دا هاتیە ـ هەروەسا بۆ رێڤی یان مرۆڤێ حیلەکەر و فێلباز ژی دهێتە گۆتن.

**دمور(Demûr)**: ئاوازا نەرم و هێدی.

**دمە(Deme)**: باکوزیرک، با و بەفر و سەرما دگەلێک ـ هەروەسا ئالاڤێ پفکرنێ کو زێرنگر و ئاسنگەر بکار دئینن بۆ گەشکرنا ئاگری ـ دەڤ(دەڤێ کێرێ و خەنجەرێ).

**دمیدن(Demîden)**: پفکرن ـ هاتنا بای ـ شین بوون و سەرهلدانا گیای ژ بن ئاخێ ـ رۆژهلاتن.

**دنان(Denan)**: چوونا ب کەیف و خوەشحالی.

**دنبال(Dunbal)**: کوری، دویڤ ـ لدویڤ، ل پەی، ل پشت.

**دنبلان(Dunbelan)**: گونێت پەزێ سپی ـ جۆرەکێ کڤارکایە.

**دنبە(Dunbê)**: دینگێ پەزی.

**دنج(Dênc)**: جهێ ئێمن و دویر ژ دەستدرێژی یا بیانیان.

**دند(Dend)**: دەبەنگ، هەبلە، ئەحمەق.

**دندان(Dendan)**: ددان.

**دندە(Dendê)**: پەراسی ـ گێر(وەکی گێرێ ترومبێلێ).

**دندیدن(Dendîden)**: هێدی و لبن لێڤاڤە دگەل خوە ئاخفتن.

**دنگ(Deng- Dêng)**: ئاشێ برنجی، ئامیرێ پویش قوتیێ(ئەو ئامیرێ کو پویشێ برنجی پێ بقوتن دا دندکا سپی ژ قەلپیشکی جودا ببت).

**دنگ(Deng)**: بنێرە: (دند) ـ دەنگێ ڤێککەفتنا دو تشتێن ئاسنی.

**دنگالە(Dengale)**: شیشلتوکێن بەستی، لوبلاق، گلیلە.

**دنە(Dene)**: ئاواز ـ دەنگێ خوەشی و شادی یێ.

**دنیدن(Denîden)**: ب شادی و خوەشحالی برێڤەچوون.

**دو(Du)**: هژمارا (٢)دو.

**دو(Duw-Duv)**: غاردان، بەزین.

**دوازدە(De-Duvazde)**: هژمارا (١٢)دوازدە.

**دوازدەهە(Devazdehe)**: دوازدە گرێ(اثناعشر).

**دوال(Deval)**: کەمەربەند.

**دواندن(Devanden)**: بەزاندن.

**دوبارە(Dubarê)**: دوبارە، دوجارکی.

**دو برادران(Du beraderan)**: ناڤێ دو ستێرایە کو دکەڤنە د جەرگێ «تەرمێ نحێ»دا کو ب عەرەبی دبێژنێ(فرقدان ـ فرقدین).

**دوبین(Dubîn)**: چاڤ ور، چاڤ ویر.

**دوپیکر(du pêyker)**: ناڤێ بورجا سێیێ یە ژ هەر دوازدە بورجێن فەلەکی کو وەکی دو بچیکێن رویسن، ب عەرەبی دبێژنێ (جوزاء).

**دوتا(Du ta)**: دو طا، خوەهر، چەمیای، ڤەچەماندی.

**دوچەرخە(Duçerxê)**: پایسکل.

**دوختن(Dûxten)**: دورین(کارێ

دریارێ) ـ دوهتن(دوهتنا گوهانێن گیانەوەرێن شیردەھ).

**دوخ چکاد(Dûx çekad):** شامی، ئەصلەع، کەسێ کو پێشی یا سەرێ وی موی پێڤە نەبن.

**دود(Dûd):** دوی، دویکێل.

**دودافکن(Dûd efken):** جادووگەر، سێحربەند.

**دودخانە(Dûdxane-ê):** مال، بنەمال.

**دودمان(Dûdman):** مال، بنەمال، خانەدان.

**دودە(Dûdê):** بنێرە «دودمان» ـ کەرەستەکێ نەرم و دوهنکیێ رەنگ رەشە کو ژ دویکێلێ گازێ دگرن و بکار دئینن بۆ چێکرنا رەنگا و حوبری.

**دور(Dûr):** دویر(بۆ دەم و جها ل کارە).

**دوراغ(Dûrax):** تەرەماست، دەو(دەو یان ماستێ کو ئاڤا وی هاتبیتە گرتن و سپیاتی ب تنێ مابیت).

**دوربێل(Dûrbêl):** بێ وەفا و نەراست.

**دوربین(Dûrbîn):** کەسێ کو چاڤێ وی تشتێن دویر چێتر ژ تشتێن نێزیک ببینت ـ دویربین(دڕکەیە بۆ کەسێن هزر ل پاشەرۆژێ دکەن و دویر دنێرن) ـ دێربینە(ئالاڤەکە کو تشتێن دویر بۆ دیتنا چاڤا نێزیک دکەت).

**دورو(Du rû):** دو روی(کەسێ کو ئاخفتن و کریارێن وی نە وەک هەڤ بن«منافق») ـــ دو روی(پەڕوک یان هەر تشتەکێ دی کو بەر و پشتێن وی ژ لایێ نەخش و نیگار و......هتد ڤە، دگەلێک د جیاواز بن) ـ جورەکێ گولێ یە کو رەخەکێ وێ سورە و رەخێ دیتر زەرە(گولا رەعنا).

**دوزخ(Dûzex):** جەهنەم، سەقەر، دوزەخ، دوژەھ.

**دوزمان(Dûzman):** بەنک، دەزی.

**دوزنە(Du zenê):** زەلامێ کو دو ژن هەبن.

**دوزنە(Dûzenê):** شویژن، دەرزیک ـ زیلکێ زرکێتک و ستێنک و پێشی و......هتد.

**دوزە(Dûze-ê):** قورینجوک.

**دوزیدن(Dûzîden):** دورین(بۆ دریارێ).

**دوزیستان(Duzîstan)**: زاراوەکێ گیانەوەرناسیێ یە؛ ئانکو ئەو گیانەوەرێن کو ل دەستپێکا ژیێ خوە د ئاڤێ دا دبۆرینن و پشتی مەزن دبن دهێنە سەر هشکیێ ژی دژین، وەکی: (بەقی).

**دوسانیدن(Dusanîden)**: چەسپاندن(تشتەک ب تشتەکێ دی ڤەنان ب رێکا ستورکێ)ـ خوە ژ کەسەکی حسێب کرن(وەکی ئێک خوە دگەهینتە بنەمالا مەزنەکی یان ئاغایەکی یان شێخەکی و......هتد).

**دوست(Dûst)**: دۆست، هەڤال، یار، بەروڤاژی پەیڤێن(دوژمن و نەیار)ـ ئانکوا حەژێکرنێ ددەت دەمێ دگەل پەیڤەکا دی بهێت، وەکی: (خدادوست = کەسێ کو حەژ خودێ دکەت، خودێپەرێس؛ وطن دوست = کەسێ کو حەژ وەلاتێ خوە بکەت، نشتیمان پەروەر).

**دوسیدن(Dûsîden)**: پێڤە نویسیان، پێڤەمان، پێکڤەمانا دوو تشتان ب پێکڤە.

**دوش(Dûş)**: مل، کۆل، پشت ـ شڤێدی(شەڤا بۆری).

**دوشا(Dûşa)**: کەسێ یان کەسا کو گیانەوەرێ شیردەه د دوشیت(لدەڤ مە کوردا ئەم بۆ ژنکا کو پەزی ددۆشت پەیڤا «بێری» بکار دئینین)، هەروەسا هەر گیانەوەرەکێ بهێتە دوهتن.

**دوشاب(Doşab)**: دوشاڤ(دوشاڤا تری، دوشاڤا خورمێ).

**دوشادوش(Dûşadûş)**: مل بمل.

**دوشانیدن(Dûşanîden)**: دوهتن.

**دوشمال(Dûşmal)**: کەفیک ـ خاولی.

**دوشنبه(Dûşenbê)**: سێیەمین رۆژا هەفتیێ، دوشەمبی.

**دوشه(Dûşe)**: زەرکا شیری، ئامانێ کو لدەمێ دوهتنێ شیری دکەنێ.

**دوشیدن(Dûşîden)**: دوهتن.

**دوشیزه(Dûşîzê)**: کچ، کچا جەحێل یا نەشویکری.

**دوغ(Dûx)**: ئاڤەماست، دەو.

**دوغاب(Dûxab)**: هەر تشتێ کو دەمێ ئاڤێ بکەنە دناڤ دا وەکی ئاڤەماستێ سپی ببیت، مینا (کلسێ).

**دوغلو(Duxulû)**: جێمک.

**دوک(Dûk):** تەشی.

**دوکارد(Dukard):** جەو، مقەسا کو هریا پەزی پێ دبڕن.

**دوگـــان(Dugan):** دو، دودانە، دودووە، دوبەرامبەر.

**دوگانە(Duganê):** هەر تشتێ کو ژ دو تشـتـا یان دو کـەرەسـتـا پێکهاتبیت ـ نقێژا دو رکعەتی، وەکی نقێژێن سپێدێ و سونەتا.

**دوگـاه(Dugah):** ئێک ژ ئاوازێن موزیکا ئیرانی یە.

**دول(Dol):** دولک، ئامـانێ کـو پێ ئاڤێ ژ بیـــرێ بـکێـــشنە دەر، بعەرەبی دبێژنێ (دلو).

**دولاچـنـگ(Dulaçeng):** نـاڤێ جـــۆرەکێ یە ژ جـــۆرێن نۆتێن موزیکێ.

**دولە(Dule):** توز و عـــەجـــاج ـ کومت، گرک، ئەردێ سەرئەڤراز و سەرنشیڤ ـ چال ـ نالنال، لوبرێنا سە و طوری یا ـ دولک.

**دومان(Dûman):** تۆفان.

**دویدن(Devîden):** غــــاردان، بەزین.

**دویـسـت(Duvîst):** هـژمــــــارا (۲۰۰)دوسەد.

**دە(Deh):** هژمارا (۱۰)دەه.

**دە(Dêh):** گوند.

**دهار(Dêhar):** شکەفت، نهـــال، شکەنا چیای.

**دهاز(Dehaz):** هەوار، فـــــریاد، دەنـگێ نـرڕینـێ(وەکـی دەنـگێ شێری).

**دهان(Dehan):** دەڤ.

**دهـــان درە(Dehan derrê):** باووشکێن خەوێ.

**دهانـە(Dehanê):** وەکـی دەڤـی ـ دەرقـــەدامک، دەر، وەکی: (دەرێ بورکانێ)ـ لغاڤ.

**دە پنج(Dehpenc):** زێرێ کو نیڤە ژێ زێر بیت و نیڤا دیتر سفر یان تشتەکێ دیتر یێ بێ بها بیتن.

**دهخـــدا(Dêhxuda):** خـــودان و مەزنێ گوندی، کەدخودا.

**دەدهی(Dehdehî):** زێرێ تەمـــام عەیار، زێرێ بێ غش.

**دهستان(Dêhêstan):** کۆما چەند گوندا کو سەر ب ناحیەکێ ڤە بن.

**دهکدە(Dêhkedê):** گـــــوندێ بچویک.

**دە کـیـا(Dêhkiya):** کـەدخـودا، مەزنێ گوندی.

**دهل(Duhul):** داهۆل.

**دهله(Dehle):** پر(جسر).

**دهن(Dehen):** کورتکریا پەیڤا (دهان)، ئانکو دەڤ.

**دهناد(Dêhnad):** رێکئێخستن و رێزکرن(نظم و ترتیب).

**دهیو(Dêhyû):** دەڤەر(ناحیە).

**دهیوپد(Dêhyûpud):** دەڤەردار، رێڤەبەرێ دەڤەرێ.

**دی(Dî):** دوهی، رۆژا بوری.

**دی(Dey):** هەیڤا دەهێ یە ژ سالا هەتاڤی و هەیڤا ئێکێ یە ژ وەرزێ زڤستانێ و ناڤێ رۆژا هەشتێ و پازدێ و بیست و سێ یێ ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی یە و ژ بەرکو ناڤێ سێ رۆژان د مەهەکی دا وەک هەڤ بوون و لبەر خەلکی بەرزە دبوو کا بەحسێ کیژان رۆژێ دهێتە کرن ، ئینان ژ بۆ ژێک جیاوازکرنا هەر سێ رۆژا، ناڤێ رۆژا هەشتێ کرن «دیباذر ـ دی بە آذر» و ناڤێ رۆژا پازدێ کرن «دی بمهر» و ناڤێ رۆژا بیست و سێ یێ ژی کرن «دیبادین ـ دی بدین».

**دیبا(Dîba):** جورەکێ پەرۆکێ ئارمویشی یە.

**دیباچە(Dîbaçe-ê):** پێشگۆتن ـ دێم و روی.

**دیبادین(Deybadîn):** بنێڕە: (دی: Dey).

**دیباذر(Deybazer):** بنێڕە: (دی: Dey).

**دی بدین(Dey bêdîn):** بنێڕە: (دی: Dey).

**دی بمهر(Dey bêmêhr):** بنێڕە: (دی: Dey).

**دیبەء خسروی(Dîbeyê Xus-revî):** ناڤێ ئێک ژ گەنج یان خزینەیێن هەشتکانە یێن خسرو پەرویزی یە.

**دید(Dîd):** بەرێخوەدان، لێ نێرین، سەح کرن.

**دیدار(Dîdar):** دیدار، چاڤ پێکەفتن، هەڤدیتن.

**دیدن(Dîden):** دیتن، بینین.

**دیدە(Dîde-ê):** چاڤ، بیبیکا چاڤی. کۆما ڤێ پەیڤێ دبیت(دیدگان: Dîdêgan).

**دیر(Dîr):** دویر، درەنگ، هێدی، دەمێ دویر، (بەروڤاژی پەیڤا «لەز» و پەیڤا «زوی»).

**دیرانە(Dîranê)**: دێرین.

**دیرسال(Dîrsal)**: کەڤن، کەڤنار.

**دیرک(Dîrek)**: ستوینا خیڤەتێ.

**دیرند(Dîrend)**: رۆژگار، دەمێ کو بەراهی و دوییاهی نەهەی(دهر).

**دیروز(Dîrûz)**: دوهی، رۆژا بوری. هەروەسا پەیڤا (دینە) ژی لکارە.

**دیرین(Dîrîn)**: دێرین، کەڤن.

**دیز(Dîz)**: رەنگ، رەنگێ هەسپ و هێسترا، رەنگێ گەور. بۆ ڤێ ئانکوێ پەیڤێن (دیزە، دیزج، دیزک) ژی لکارن. ـ کەلە(قلعە).

**دیزندان(Dîzendan)**: سێپێکا ئاسنی یا کو مەنجەلێ دادننە سەر.

**دیزی(Dîzî)**: ئامانێ کو ژ ئاخا جێرکا یان بەری هاتبیتە چێکرن.

**دیس(Dîs)**: وەکی، مینا ـ هەڤتا.

**دیشب(Dîşeb)**: شڤێدی، شەڤا بۆری.

**دیگ(Dîg)**: مەنجەل.

**دیگر(Dîger)**: دی، دن، وەکی: (رۆژەک دن، سالا دی، جارا دی).

**دیلم(Deylem)**: ئاسنەکێ قاییمە و ژ بۆ کونکرنا ئەردی یان دیواری یان لڤاندنا تشتێن گران بکار دئینن ـ ناڤێ دەڤەرەکێ یە ل گەیلان ـ خولام، بەنی ـ دەرگەهڤان ـ هەروەسا دڕکەیە ژ سوپاییێ دلێر و شەڕکەر.

**دیم(Dîm- Dêym)**: دێم و روی. هەروەسا پەیڤێن (دیمە، دیمر) ژی لکارن.

**دین(Dêyn)**: ناڤێ رۆژا بیست و چوارێ یە ژ هەمی هەیڤێن سالا هەتاڤی ـ ناڤێ فریشتەکێ یە.

**دیو(Dîv)**: دێو.

**دیوار(Dîvar)**: دیوار.

**دیوانە(Dîvanê)**: وەکی دێوا ـ بێ ئاقل، دین، شێت.

**دیوە(Dîvê)**: کرمێ ئارمویشی.

**دیویسنا(Dîvyesna)**: د ئایینێ زەردەشتی دا ئانکو: کەسێ کو دێوی دپەرێست.

**دیە(Dîh)**: گوند.

**دیهیم(Deyhîm)**: تانج، کولاڤێ پاشاتیێ.

**دیهیم جو(Deyhîm cû)**: کەسێ کو بزاڤێ بکەت ژ بۆ بدەستڤەئینانا تانج و تەختێن پاشاتیێ.

# ذ

**ذ(Zal):** ژ بلی پەیڤا «ذرخش»، چو پەیڤێن دی د زمانێ فارسی دا نینن کو ب ڤێ تیپێ دەست پێ بکەن، و هەر پەیڤا کو ب بەرچاڤ دکەڤت کو ب ڤێ تیپێ دەستپێکربت یان یا عەرەبی یە، یان ژی یا لێکدایە یان دارشتی یە ژ هەردو زمانێن عەرەبی و فارسی. هەرچەوا بت بلێڤکربا ڤێ تیپێ د زمانێ فارسی دا مینا تیپا (ز: Z)ە.

**ذبالەدان(Zubalêdan):** سەلکا گلێشی.

**ذبل(Zebl):** کۆدێ کوبسەلەی ـ دەسپێکا گەنجاتی یێ.

**ذخیرە نهادن(Zexîre ne-haden):** پاش قولاچک دانان، تشتەک بۆ رۆژا تەنگاڤیێ هلگرتن.

**ذرت(Zurret):** گەنمۆک، گەنم شام.

**ذرخش(Zurexş):** رۆناهی، رۆناکی، رۆشنایی.

**ذرەبین(Zerrebîn):** هویربین، مەزنکەر(ئالاڤەکێ شویشەیی یە کو تشتێن هویر و بچویک، مەزنتر پێ دهێنە دیتن).

**ذرەپرور(Zerre perver):** ئەو کەسێ کو مرۆڤێن بێ دەستهەلات پەروەردە بکەت و بگەهینتە پایە و پلەیێن بەرز.

**ذکاء(Zuka'):** هەتاڤ، خۆر.

**ذکر(Zêkr):** بیرئینانەڤە ـ سوپاسی ـ دوعا ـ نڤێژ ـ ئاخفتن یان دوعایێن د بن لێڤان ڤە.

**ذلت(Zêllet):** زەلیل بوون.

**ذمارت(Zemaret):** دلێری، ئازایی.

**ذنابت(Zênabet):** نێزیکاتی،

خزماييني، مرۆڤاهيني.

**ذوب كـــــــــردن(Zobkerden):** حەلاندن.

**ذوق كـردن(Zoqkerden):** كـەيف كـــرن، زەوق ژ خـــوە رە چێكرن، گـێـولێ خـوە خـوەشكرن، تام ژ تشتەكی ديتن.

**ذوقـنـاک(Zoqnak):** ب لـەززەت، ب تام، خوەش، گێول خوەشكەر.

**ذيل(Zeyl):** دەهمـــــەن، دانـگ ـ خوارێ، بن، ژێر ـ دويلک، دويڤ، كوری و دوياهيا هەر تشتەكی.



**ر(Ra- Rê)**: تیپا دوازدێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی. هندەک جارا دهێتە گوهارتن ب تیپا (ش)، وەکی: (انگاردن = انگاشتن: گومان کرن)، و ل هندەک جهێن دی دبیتە (غ)، وەکی: (کنار = کناغ: رەخ، کێلەک، کنار)، هەروەسا دبیتە (ل)، وەکی: (سوراخ = سولاخ: کون).

**را(Ra)**: نیشانا بەرکار«مفعول»ی یە و پڕانیا جاران دگەل بەرکاری دهێت، وەکی: (فرزین آزاد را زد = فەرزینی ئازاد قوتا) ـ یێ(وەکی دبێژن: یێ فلان کەسی، بۆ نموونە: تورا = یێ تە، مالێ تە. این خانە تو را است = ئەڤ خانیە یێ تەیە.).

**راخ(Rax)**: خەم، کوڤان، قەهر ـ گومان، هزر.

**راد(Rad)**: سەخی، جوامێر ـ دلێر، ئازا ـ زانا. ئەڤ پەیڤە دگەل گەلەک پەیڤێن دی دهێت، وەکی: (رادکار ـ رادمرد ـ رادمنش و......هتد).

**راز(Raz)**: نهێنی، سڕ، ئاخفتنا ڤەشارتی د دلی دا ـ معمار، بەننا، کەسێ کو کارێ وی ئاڤاکرنا خانیا بیت.

**رازی(Razî)**: خەلکێ باژێرێ «ری».

**رازیانە(Razyanê)**: رزیانک(گیایەکێ بێهن خوەشە) کو دەرمانسازێن کەڤن گەلەک ئەڤ گیایە بکار دئینان بۆ بەرێن گولچیسکا و هناڤچوونێ و ئێشا زەرکێ.

**رازینە(Razînê)**: دەرەجک،

پێسترک.

**راژ(Raj):** کۆما دەخل و دانێ پاقژکری.

**راست(Rast):** راست(بەروڤاژی پەیڤا «چەپ»)ــ دروست(بەروڤاژی پەیڤا «چەوت»)ــ راست(بەروڤاژی پەیڤا «خوەهر»)ــ راست(بەروڤاژی پەیڤا «درەو»).

**راستاد(Rastad):** موچە، هەیڤانە، دەرماله(راتب، مخصصات).

**راسو(Rasû):** گیانەوەرەکێ وەکی مشکی یە لێ ژ وی مەزنترە و مارا دخوت و لجەم مصری یێن کەڤن پیروزە، ب عەرەبی دبێژنێ(ابن عرس).

**راش(Raş):** بنێرە: (راژ)ــ ناڤێ جورەکێ دارێ یە.

**راغ(Rax):** بیابان، دەهمەنا چیای کو ب شینکاتی بیت و هێدی هێدی بەرەف بیابانێ ڤە بچیت.

**راک(Rak):** پەزێ کوبڤی ـ کوڤ، ترارکێ کو ژ داری هاتبیتە چێکرن ـ بەنک، دەزی ـ ئێک ژ ئاوازێن موزیکا ئیرانی یە.

**راکارە(Rakarê):** ژنا دەهمەن پیس، قەحبە.

**رام(Ram):** ئارام، فێر، هەڤوت: (بۆ نموونە؛ رام کردن: ئارام کرن، فێرکرن، هەڤوت کرن)ـ ناڤێ فریشتەکێ یە د ئایینێ زەردەشتی دا ـ ناڤێ روژا بیست و ئێکێ یە ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی.

**رامش(Ramêş):** ئارامی، ئاسودەگی، متی و بێ دەنگی ـ سرود و ئاواز ـ شادی و خوەشگوزەرانی.

**رامیار(Ramyar):** شڤان.

**ران(Ran):** رەهن، ران، پشکا سلال ژ پیێ مرۆڤی یان گیانەوەری.

**راندن(Randen):** دەرئێخستن، ژ خوە دویرئێخستن ـ بەزاندن، دانەغار(بۆ هەسپا و...هتد) و هاژۆتن(بۆ ترومبێل و فروکا و......هتد).

**رانکی(Ranekî):** پالی، پالێڤ.

**رانین(Ranîn):** شەلوال.

**راوچە(Ravçê):** تریێ بێسیرە ـ تریێ بالەتە.

**راود(Raved):** چەروان، زەڤیەکا بلند کو تێر گیا و شینکاتی و ئاڤ بت، جهێ باش بۆ چەرا گیانەوەرا.

**راورا(Ravra):** سیخور ـ ژویژی.

**راوک(Ravek):** ئامانێ کو مەی تێدا دهێته پالاوتن.

**راه(Rah):** رێ، رێک ـ یاسا، قانون ـ شەنگسته ـ رێباز ـ رێ و رەسم ـ جار، کەرەت، گەڕ.

**راهبەر(Rahber):** رێبەر، رێ نیشاندەر.

**راه بند(Rahbend):** رێگر، دز و جەردەچی.

**راه پیما(Rah pêyma):** کەسێ کو رێکەکێ دپیڤت، رێڤنگ ـ هەسپ یان هێسترێ کو حێل بچیت و مرۆڤ لێ سوار بیت.

**راهتوشە(Rahtûşê):** خوارنا رێکێ، ئازوقێ کو رێڤنگ دگەل خوە دبەت دا برێڤە بخوت.

**راهدار(Rahdar):** زێرەڤانێ رێکێ ـ کەسێ کو باجا رێکێ وەربگرت.

**راەراه(Rahrah):** خیچ خیچ، گەخ گەخ(پتر بۆ پەرۆکی دهێته بکار ئینان).

**راهرو(Rahro):** رێڤنگ ـ زاهد ـ مرید ـ کولانکێت د ناڤ خانی یان شکەفتێ یان مزگەفتێن کەڤن دا کو پشکێن ژێک جیاواز پێکڤە گرێبدەت.

**راهزن(Rahzen):** رێگر، دز و جەردەچی.

**راهگان(Rahgan):** تشتێ کو مرۆڤ درێکا خوە دا ڤەبینت ـ تشتێ کو مرۆڤ بەلاش و بێ زەحمەت بدەست خوەڤە بێخت، مالێ پفێ.

**راهگذر(Rahguzer):** رێبار(کەسێ کو د رێکەکێ را ببۆرت)ـ رێڤنگ.

**راهگذر(Rahêguzer):** رێکا کو رێڤنگ تێرا دبوریت.

**راهنما(Rahnuma):** رێ نیشاندەر، رێبەر، پێشەوا ـ نەخشە یان هەر تشتەکێ دی کو مرۆڤ ب رێکا وێ بگەهتە مەخسەدا خوە.

**راهوار(Rahvar):** رەهوان، هەسپ یان هێسترێ کو حێل بچیت.

**راهواره(Rahvarê):** خەلات(هدیه).

**راهوی(Rahuvî):** ناڤێ ئێک ژ ئاهەنگێن موزیکا ئیرانی یە.

**رایکا(Rayka):** کورک ـ کورکێ جوان و دەلال ـ خوەشتڤی.

**رایگان(Raygan)**: بنێره: (راهگان).

**ربوخه(Rebûxe)**: خوەشی، ئەو تام و خوەشی یا کو بۆ مرۆڤی دەست ددەت لدەمێ گوهنێلیێ، کەسێ کو لدەمێ گوهنێلیێ هەست ب کەیف و خوەشیێ بکەت. د زمانێ عەرەبی دا پەیڤا (ربوخ) هەیە و بۆ وێ ژنێ دهێتە گۆتن یا کو لدەمێ گوهنێلیێ ژ هوش بچیت و های لخوە نەمینیت.

**رتبیل(Retbîl)**: ناڤێ کو د کەڤن دا دگوتنە شاهێن (سند ـ کابل).

**رجە(Rece-ê)**: رستا کو جلکا بسەر دادەن دا زوها ببن، هەروەسا ئەو کنفێ کو بەننا بکار دئینت لدەمێ دانانا دیوارێن ئاڤاهیا.

**رچک(Reçek)**: بایێ ب دەنگ یێ کو ژ حەفکێ دەردکەڤیت. پەیڤێن (رجک، رجغک، آروغ) ژی لکارن.

**رخ(Rux)**: روی، روخسار ـ رەخ، ئال، لا.

**رخ(Rex)**: شکەن، دەرز، کەلشت.

**رخبین(Rexbîn- Rêxbîn)**: لورک ـ کەشک ـ دەو.

**رخت(Rext)**: جل و بەرگ، هەر تشتێ کو بکەیە بەرخوە.

**رخسار(Ruxsar)**: روی، روخسار.

**رخش(Rexş)**: رۆناهی، تیشک، تیروژک ـ رەنگێ سۆر و سپی د ناڤێکدا ـ هەسپێ رەسەن ـ ناڤێ هەسپێ روستەمێ پەهلەوان بوو.

**رخشا(Rexşa)**: رۆناهی، رەوشەن.

**رخشان(Rexşan)**: بنێره: (رخشا).

**رخشیدن(Rexşîden)**: رۆناهی دان، تیروژک ڤەدان.

**رخنە(Rexnê)**: کون، شکەن، دەرز، کەلشت.

**رخنە(Ruxne)**: کاغەز، پەرک.

**رخنەجو(Rexnê cû)**: کەسێ کو چارەیەکێ بۆ کارەکێ دژوار و ب زەحمەت ڤەبینت.

**رخیدن(Rexîden)**: توند نەفەس کێشان، ڤەکیان(دەمێ مرۆڤ بکەتە غار یان تشتەکێ گران هەلگریت دێ ئەڤ حالەتە لدەڤ دەست دەت، هەروەسا مە د کوردیێ دا بۆ گیانەوەران ژی ئەڤ پەیڤە یا هەی، بۆ نموونە دەمێ کو سە ڤەدکێت).

**رد(Red):** نیـشـان و شـوین دەوس، شـوین پێ ـ دلاوەر، دلێـر، ئـازا ـ زانا، تێگەهشتی.

**رده(Rede-ê):** رێز(صف).

**رز(Rez):** رەز(باغێ تری)ـ تری ـ دارمێو.

**رزبان(Rezban):** رەزڤـان، کـەسێ کو چاڤدێری و سەرەگوهی یا رەزی دکەت.

**رزبر(Rezbur):** داسا بچویک کـو چەقێن زێدەبێن دارمێوێ پێ دبرن، ئالاڤێ کو بۆ کەزاختنا مێوێ بکار دئینن.

**رزبن(Rezbun):** دارمێو.

**رزد(Rezd):** پرخـور، ب خـوارە، هەڤـدەلۆش، یێ کـو گەلەک تشـتـا بخوت.

**رزم(Rezm):** شەر، جەنگ.

**رزمگاه(Rezmgah):** مـەیدانا شەڕی، جهێ شەری.

**رزوان(Rezvan):** بنێرە: (رزبان).

**رزیدن(Rezîden):** رەنگ کـرن، رەنگ کرنا پەروکا یان جلکا.

**رژد(Rejd):** بنێرە: (رزد).

**رژه(Rêjê):** بنێـرە: (رده)ـ بۆرینا رێزێن رێکخسـتی یێن سەربازا ل بەرامبەر شاهی یان ئێک ژ فەرماندێن مـەزنێن لەشکەری(مـسـیـرة عسکرية).

**رس(Rus):** ئاخا (رس)، ئاخ سۆرکا تایبـەت کـو جـێـرک و گـوزک و گـولدانکا و...... ژێ چێـدکـەن ـ پرخور، ب خوارە، هەڤدەلوش.

**رسا(Resa):** گـەهشـتی(بالغ)ـ گەلەک، مشە ـ ب ژیر، ب عاقل.

**رساندن(Resanden):** گەهاندن.

**رسانه(Resane-ê):** گەهینەر، هەر تشـتێ کـو ئاخـفـتنەکێ یان دەنگوباسا بگەهینتە مرۆڤی وەکی رادیو، تەلەڤزیون و رۆژنامە ـ کول و کوڤان، خەم.

**رست(Rust):** بنێـرە: (رس)ـ رەق، دژوار، موکوم، ئازا.

**رستاخیز(Restaxîz):** رابوونەڤە(قيامة).

**رستاد(Restad):** موچە، هەیڤانە، دەرمالە.

**رستار(Restar):** ئازاد، رەها.

**رستگار(Restgar):** بنێـرە: (رستار).

**رستم(Rustem):** کـەلەخ مـەزن، بالا بلند، ب هێـز ـ مـەزنتـرین

پەهلەوانێ داستانێن ئیرانی یە.

**رستن(Resten):** ئازاد بوون، رەهابوون، رزگار بوون، ژ تەنگاڤیا خلاس بوون.

**رستن(Rusten):** سەرهلینان، شین بوون(مەبەست ژێ شین بوونا گیایە، دەمێ کو ژ نوی سەر ژ ئاخێ دەردئینت).

**رستە(Reste):** بنێرە: (ردە).

**رستەهم(Rustehm):** بنێرە: (رستم).

**رستی(Rustî):** رەحەتی، ئاسودەگی - دلێری - باهر، پشک.

**رسد(Resed):** دەستە، کۆمەکا مرۆڤا کو پێکڤە ب کارەکی رابن - باهر، پشک(حصە).

**رسمان(Rêsman):** وەریس، کنف.

**رسوا(Rusva):** رسوا، کەسێ کو کارێ وی یێ کریت بەلی ببیت و ل نک خەلکی هەتکا وی بچیت.

**رسیدن(Resîden):** هاتن، گەهشتن(وەکی ئێک بگەهیتە بنەجهەکێ) - کامل بوون، گەهشتن(وەکی گەهشتنا فێقی).

**رش(Reş):** یەکا پیڤانێ یە کو ئەو ژی ژ سەرێ تلا ناڤیجە تا بنێ ئەنیشکێ - کومت، گر، مل - هەسپێ ناڤداری روستەمێ پەهلەوان - بنێرە (رشن).

**رشت(Reşt):** ئاخ یان گلێش و قرش و قالێن هاڤێتنێ، هەروەسا بۆ تشتێن قاف و قول و خەسپال ژی دهێتە گوتن.

**رشتن(Rêşten):** رێسان.

**رشتە(Rêştê):** بەنک، وەریس، کنف، هەر تشتێ کو هاتبیتە رێسان - رژدە - زاراوەکێ پەروەردێ یە، ئانکو؛ پشک، پشکێن خواندنێ، وەکی: (پشکا پیشەسازی، پشکا زانستی و پشکا......هتد).

**رەشک(Reşk):** حەسویداهی - غیرەت(مرۆڤەکێ ب غیرەت بیت بۆ ناموسا خوە).

**رشک(Rêşk):** هێکێت پێشکا.

**رشمە(Rêşmê):** کنفێ زراڤ.

**رشمیز(Reşmîz):** جورەکێ مێریانە.

**رشن(Reşn):** دادگەر، عادل - فریشتا دادگەریێ د ئاییینێ زەردەشتیان دا - ناڤێ رۆژا هەژدێ یە ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی -

گر، مل، کومت.

**رفتن(Reften):** چۆن، کـۆچ کـرن، بۆرین.

**رفتن(Ruften):** پاقژکرن، مالشتن، گێسک کرن.

**رفـوشـه(Refûşe):** یاری، ترانه ـ گونەهـ، سەرپێچی، بێ ئەمری.

**رفیده(Refîde):** خانکێ نانی.

**رک(Ruk):** دەق و دەق، راست و بێ پەردە و بێ ترس(صریح).

**رک(Rek):** ئاخفتنا د بن لێڤانڤە.

**رکاشه(Rukaşe):** سیخور.

**رکـو(Rekû- Rukû):** پەروک یان جلکێ کـەڤن بووی ـ ریتـالێن پەروکی.

**رکـیـدن(Rekîden):** دگـەل خـوە ئاخفتن یان ئاخفتنا د بن لێڤانڤە ژ بەر زێدەهیا قەهرێ و دلتەنگیێ.

**رگ(Reg):** رهێن خـوینێ د ناڤ لەشی دا. د زمـانێ فـارسی دا ئەو رهێن کـو خـوینێ ژ دلی دگەهیننە ئـەندامـێـن دی یـێـن لـەشـی دبێژنێ(سرخ رگ) و ئەو رهێن کو خوینێ ژ ئەنداما ڤەدگەریننەڤە دلی دبێـژنێ (سـیـاهرگ) و ئەو رهێن زێدە زراڤ ژی دبێژنێ (مویرگ).

**رگـبـار(Regbar):** تەڤـیـا بارانێ ـ صـەلی(د گـوللەبارانکرنێ دا بکار دهێت دەمێ دبێـژن: فـلان کـەسی صەلی یەکا گوللا لێ رەشاند).

**رگــو(Regû- Rugû):** بنێــره: (رکو).

**رگـه(Regê):** هەر تشـتـەکێ وەکی رهـێ(دنـاڤ بـەلـگـێ دارێ، یـان داری بخـوە یان ژی بەری دا)بت ـ رهـ و ریشال، کنێت، نەژاد.

**رم(Rem):** تـرس و رەڤ، رەڤـین ژ بەر ترسێ ـ کـۆمـا چارپێ یێن وەکی: (پەز، بزن، چێل و گـول و......هتـد، کو مە د زمانێ کوردی دا بـۆ هەر جـــۆرەکی ژ ڤـــان گیانەوەران ناڤەکێ تایبەت هەیە، وەکی: پەز؛ بۆ پەز و بەزنا دهێتـە گۆتن، گاران؛ بۆ چێل و گولا و ل هندەک جـهـا بۆ دەوارا ژ دهێـتـە گـۆتن، رەڤـدە: بۆ گـورگـا دهێـتـە گـۆتن و......هتـد)ـ دەسـتـەک، کۆمەڵە.

**رم(Rêm):** عەداڤ، کێم.

**رم(Rum-Rem):** دناڤ دەڤـی دا، دۆرماندۆری دەڤی، هوندرێ دەڤی.

**رم(Rum):** مـوبێ شـەرمگەهێ،

رێڤ(مویێ کو لدۆرماندۆری ئامیرێ گوهنێلیێ ژن و زەلاما دهێت). هەروەسا پەیڤێن(روم، رومە، رنب، رنبە، رمگان، رمکان، برمگان، زمگان، موی زهار) ژی لکارن.

**رمارم(Remarem)**: دەستە دەستە، کۆم کۆم ـ لدویڤ ئێک ـ جوراوجور ـ بەرامبەر، روی بروی.

**رمان(Reman)**: رەڤۆک، ترسنوک، کولافە.

**رماندن(Remanden)**: ترساندن، جنقاندن، بزداندن(مرۆڤ ژ نشکەکی ڤە ئێکی یان گیانەوەرەکی بترسینیت و ژ ئەگەرێ وێ ترسێ ئەو مرۆڤ یان ئەو گیانەوەر ژ بەر مرۆڤی برەڤیت).

**رمباندن(Rumbanden)**: خراب کرن، هەرفاندن.

**رمبیدن(Rumbîden)**: خراب بوون، هەرفتن.

**رمژک(Remjek)**: حولیسانک تەحیسانک(جهەک کو ژ سلال بەرەڤ خوارێ حولی بت و مرۆڤ بکارت خوە پێدا بخوشینت) ـ گونەهـ، ب سەرداچوون.

**رمکی(Remekî)**: گیانەوەرێ کو زوی بڤەجنقیت و برەڤیت.

**رمگا(Remga)**: ماهین.

**رمو(Remû)**: بنێرە: (رمکی).

**رموک(Remûk)**: بنێرە: (رمکی).

**رمە(Remê)**: کۆمەکا چارپێ یا وەکی: (پەز، بزن، چێل و گول و......هتد/بنێرە: رم) ـ دەستەک، کۆمەڵە.

**رمیار(Remyar)**: شڤان ـ گاڤان.

**رمیدن(Remîden)**: ترسین، ژێ رەڤین.

**رنج(Renc)**: رەنج، دەرد، ئازار، زەحمەت، وەستیان.

**رنجال(Rencal)**: خوارن، خواردەمەنی، خوراک.

**رنجاندن(Rencanden)**: ئازاردان ـ قەهراندن، تۆرەکرن ـ وەستاندن.

**رنج باریک(Rencê barîk)**: ئێشا(سل، سللە).

**رنجبر(Rencber)**: رێنجبەر، زەحمەتکێش، کارگەر.

**رنجور(Rencûr)**: ئازاردیتی، خەمگین، نەساخ، نەخوەش.

**رنجیدن(Rencîden)**: دلتەنگ

بوون، مەلویل بوون، قەهرین.

**رند(Rênd):** زیرەک، نەترس، حیلەکەر، کەسێ کو ب هشیاری و زیرەکیا خوە بسەر راز و ئەسرارێن خەلکی هل ببیت ـ د زاراوێ صوفی یاتییێ دا بۆ وی کەسی دهێتە گوتن یێ کو د(باطن)ێ خوە دا پاقژتر و خوەپاریزتر بت ژ (ظاهر)ێ خوە.

**رند(Rend):** هویرکێ داری(نشارة الخشب).

**رندە(Rende):** رەندەش(ئالاڤەکێ دارتاشییێ یە بو حولیکرنا داری بکار دهێت).

**رندیدن(Rendîden):** رەندەش کرن، تراشین و حولیکرنا داری ـ سەلخاندن.

**رنگ(Reng):** رەنگ(لون) ــ سوود، مفا ـ حیلە، فێل، فریو ـ جلکێ دەروێشا ـ حێشترێ توڤی ـ بزنا کوبڤی.

**رنگ(Rêng):** موزیک، ئاهەنگا خوەشی هلێخ، ئاهەنگێن داوەت و سەمایا.

**رنگارنگ(Rengareng):** رەنگین، جوراوجور.

**رنگرز(Rengrez):** خەمبەدار، خمدار، خندار(کەسێ کو کارێ وی رەنگ کرنا بەنک و پەڕوک و جلکا بیت)ـ وەرزێ پاییزێ.

**رنگریز(Rengrîz):** خەمبەدار، خمدار، خندار.

**رنگی(Rengî):** رەنگین.

**رنگین(Rengîn):** رەنگین.

**رنگین کمان(Rengîn keman):** کەسکوسور، کەسکوئالا(قوس قزح).

**رو(Rû):** روی، روخسار، دێم ـ روی، ئالێ ب سەرڤە یان ژ دەرڤە یێ هەر تشتەکی(بەروڤاژی پشت)ـ سەبەب، وەکی: (از این رو = لەورا، ژ بەر ڤێ چەندێ).

**روا(Reva):** تشتەکێ رون وەکی ئاڤێ کو د حالەتێ چوونێ دا بت(جاری) ــ رەنگە، چێدبیت(ممکن، جایز) ـ شایان، هەژی، بسەرڤە، لایق.

**روال(Reval):** شێواز. ئەڤ پەیڤە یا نوی یە و ل ڤێ داویێ دناڤ زمانێ فارسی دا زێدەبوویە.

**روان(Revan):** گیان(هندەک دبێژن «روان» تایبەت بۆ مروڤا دهێتە

بکارئینان و بۆ گیانەوەرا (حیوان) پێدڤی یە پەیڤا «جان» بکار بهێت، ژ بەر کو «جان» پویچ دبیت و دچیت لێ «روان» دمینیت.. هندەکێن دی دبێژن چو جیاوازی لناڤبەرا هەردووان دا نینە و پەیڤا «روان» بۆ گیانەوەرا ژی بکار دئینن.) ـ هەگەر پەیڤەک یان کارەک دگەل بێت ئانکوێن ژێک جودا ددەت، وەکی: (آب روان: ئاڤا ڤەرێژ، ئاڤا رەوان ـ طبع روان: گێولێ کو ب ساناهی هوزانا بڤەهینت ـ شعر روان: هوزانا کو تێگەهشتنا وێ چ کوسپ و تەگەرە تێدا نەبن بۆ خواندەڤای یان گوهداری ـ روان کردن: ژ بەرکرن«مەبەست ژێ ژبەرکرنا وانانە»).

**روانخواه(Revanxah)**: گەدا، گەدایی.

**رواندار(Rû endaz)**: هەر تشتێ کو لدەمێ نڤستنێ ب خوە دادەن، وەکی لحێف و بەتانی و......هتد.

**رواندن(Revanden)**: ب رێ کرن، ڤرێکرن ـ ڤەرژاندن، رەوان کرن.

**روان شاد(Revan şad)**: پەیڤا رێزلێگرتنێ یە بۆ کەسێ مری، هەر وەکی د کوردی دا دبێژن: (خودێ لێ خوەش بووی، خودێ ژێ رازی، رەحمەتی).

**روانکاو(Revankav)**: پزیشکێ دەروونی.

**روانکاوی(Revankavî)**: زاراوەکێ زانستێ دەروونی یە(پسیکانالیز)، کو ئێک ژ شێوازێن ڤەدیتنا چارەسەریێ یە بۆ ئێشێن دەروونی.

**رواه(Revah)**: زادێ ئێخسیرا، خوارنا زیندانیا.

**روبارو(Rûbarû)**: روی ب روی.

**روباره(Rûbare)**: کەڤا کو ب سەر کەرستێن حەلاندی، مینا ئاسنی دکەڤیت.

**روباه(Rûbah)**: رویڤی.

**روباه ترکی(Rûbahê turkî)**: سیخور.

**روبر(Rûbur)**: نموونە.

**روبراه(Rûbêrah)**: ئامادە بۆ ب رێکەفتنێ، بەرهەڤ بۆ کارکرنێ، ئامادەبوون بۆ سەفەرێ.

**روبرو(Rûbêrû)**: روی ب روی.

**روبند(Rûbend)**: خێلی،

پۆشی(پەڕوکەکێ سپی یان رەش کو دکەڤن دا ژنکا ب سەر رویێن خوە دا دئینانەخوار).

**رویە(Rûbeh):** کورتکریا پەیڤا (روباه)، ئانکو: رویڤی.

**رویـهـانـه(Rûbehanê):** حیلەکەرانە، فێلبازانە ـ وەکی رویڤی فێلباز و حیلەکەر.

**روبهک(Rûbehek):** کورتکریا پەیڤا (روباه)، ئانکو: رویڤی ـ رویڤیێ بچویک، تێشکێ رویڤی.

**روبیـان(Rûbîyan):** کولیا دەریایی(جراد البحر).

**روبیـدن(Rûbîden):** پاقژکرن، رامالین، گێسک کرن، مالشتن.

**روتـافـتن(Rûtaften):** روی لێ وەرگێران، پشت دانە تشتەکی ـ رەڤین و فیرارکرن.

**رود(Rûd):** رۆ، رویبار ـ ژەه(ژەها کڤانێ) ـ تێلە یان ژەها سازێ ـ زاروک، بچویک(چ کوڕ بت یان کچ)ـ رویس، تازی ـ مریشک یان هەر فرندەکێ ڤەریچکاندی ـ پەز و بزنێن کو هری و موییێن وان هاتبنە برین.

**روداد(Rûdad):** رویدان، ئەو تشتێ کو هاتیە رویدان(حادثة، واقعة).

**رودبار(Rûdbar):** رۆ، رویبار.

**رودخانه(Rûdxanê):** ئەو جهێ کو رۆ(رویبار) تێرا دبۆریت.

**رودزن(Rûdzen):** سازژەن(کەسێ کو سازێ«ئامیرێ موزیکی» دژەنیت).

**رودک(Rûdek):** کوڕک، کوڕکوک ـ پشیکا کویڤی(گیانەوەرەکێ درندەیە وەکی پلنگی و هندی سەیە، ب عەرەبی دبێژنێ«وشق»).

**رودگر(Rûdger):** کەسێ کو تێلێن سازێ یان ژەهێن کڤانێ چێدکەت.

**رودل(Rûdêl):** پڕبوونا عویرکی، قەڤزی کو تووشبووی پێدڤی ب دەرمان یان خوارنێن هناڤ نەرمکەر دبت(امساک).

**رودلاخ(Rûdlax):** جهێ کو چەند رویبارەک تێرا ببۆرن.

**روده(Rûdê):** رویڤیک ـ مریشک یان هەر فرندەکێ ڤەریچکاندی ـ پەز و بزنێن کو هری و موییێن وان هاتبنە برین ـ دارا بەلگ لێ وەریای.

**روده‌دراز(Rûdê dêraz)**: دڕکـه‌یه ژ مرۆڤێ پربێژ.

**روز(Rûz)**: رۆژ(هەر ژ رۆژهـلاتـنـێ تا رۆژئاڤابوونێ) ـ وەخت و دەم.

**روزافکن(Rûzefken)**: تایا کـو رۆژەکێ بێـتـە مـرۆڤی و رۆژەکێ نەء.

**روزان(Rûzan)**: کـۆمکریا پەیڤـا (روز)، ئانکو: رۆژان. هەروەسـا (روزها) ژی لکارە.

**روزانـــه(Rûzanê)**: هـــەر رۆژ، رۆژانە، رۆژ ب رۆژ ـ رزق یان ئەو خـــوارنا کـو مــرۆڤ تێـرا رۆژێ بدەست خوەڤە بینیت.

**روزبان(Rûzban)**: دەرگەهڤان.

**روزگار(Rûzgar)**: دنیا، گـێـتی ـ رۆژگـار، زەمـانە ـ دەم، وەخت ـ ئێڤار ـ وەرز، مەوسم.

**روزمـه(Rûzmeh)**: حـسـابا رۆژ و هەیڤ و سالێ(تاریخ).

**روزنـامـــــــــه(Rûznamê)**: رۆژنامـە(جـریدة) ـ دەفـتـەرکـا کـو بازرگان حساباتێن خوە یێن رۆژانە تێدا دنڤیسن.

**روزنامه‌نگار(Rûznamênêgar)**: رۆژنامەنڤیس، رۆژنامەڤان.

**روزه(Rûzê)**: رۆژی(صـوم)، رۆژی ل سـالا دووێ کـۆچی لسـەر موسلمانا واجب بویە و پێدڤی یە ل هەیڤا (رمـضـان)ێ مـرۆڤێ مـوسلمـان ب رۆژی بیت و بەری هـینـگێ هەر هـەیڤ سێ روژا ب رۆژی دبوون ئەو ژی روژێن (١٣، ١٤، ١٥) بوون ژ هەر مەهەکێ کو دگوتنێ (ایام البیض).

**روزی(Rûzî)**: خـوارنا کـو تێـرا وێ رۆژا کو مرۆڤ تێدا بکەت ـ باهر، پشک.

**روسـپی(Rûsepî)**: ژنکا دەهمـەن پیس، قەحبە.

**روســـــپی باره(Rûsepî barê)**: زەلامێ زناکـــەر، زەلامێ کـــو نێزیکی یا گوهنێلیێ دگەل ژنکێن قەحبە دکەت.

**روســـــپی زاده(Rûsepî zadê)**: بیژی.

**روستا(Rûsta)**: گوند.

**روسـتـره(Rûsuture-ê)**: خـاولی، هەر پارچەکـا پەرۆکی کـو مـرۆڤ سەر و چاڤا پێ زوها بکەت.

**روش(Revêş)**: چـوون ـــ تــەرز، شێواز(اسلوب).

**روش(Roş):** رۆناهی، رۆناک.

**روشا(Roşa):** بنێره: (روشن).

**روشن(Roşen):** رۆناهی، رۆناک، رەوشەن، گەش ـ خوەیا، دیار، ئاشکەرا.

**روشنا(Roşena):** تیشک، تیروژک، نویرهە، گوری.

**روشنان(Roşenan):** تشتێن کو دتەبیسن(وەکی ستێرا).

**روشنایی(Roşenayî):** رۆناکی، رۆناهیاتی(بەروڤاژی پەیڤا «تاریاتی»یێ).

**روغن(Roxen):** دوهن.

**روفتن(Roften):** مالشتن، گێسک کرن.

**روم(Rom):** رێڤ(مویێن شەرمگەهێ ـ مویێن دۆرماندۆری ئامیرێن گوهنێلیێن زەلامی و ژنکێ).

**رومال( Rûmal):** دەستمال یان هەر پەروکەکێ کو دەست و رووی یا پێ پاقژ بکەن.

**رون(Reven):** ئەزموون.

**روند(Revend):** شێواز، تەرز.

**رونما(Rûnuma):** سەرسبەحی (خەلاتێ کو داوەتی ددەنە بیک و زاڤا)ـ سەرپێچک(خەلاتێ کو دبەنە سەرێ نویزادەی).

**روهنی(Rûhênî):** پیلا ـ شیرێ کو ژ پیلای هاتبیتە چێکرن.

**رویا(Rûya):** رووەک.

**رویارو(Rûyarû):** رووی ب رووی.

**رویاندن(Rûyanden):** رواندن، شینکرن(چاڤدێری و سەرەگوهی یا توڤێ چاندی کرن تا کو شین ببیت).

**رویداد(Rûydad):** بنێره: (روداد).

**روی زرد(Rûyzerd):** شەرمکری، رەنگ و رووی قولپی ژ شەرما.

**رویگر(Rûyger):** سەففار(صفّار).

**رویه(Rûyê):** رووی، رەخێ ژ دەرڤە ژ هەر تشتەکی.

**روی هم(Rûyê hem):** لسەرێک، ڤێکرا(جمعاً، کلاً).

**روییدن(Rûyîden):** شین بوون (مەبەست ژێ شین بوونا گیا و شینکاتیایە).

**رویین(Rûyîn):** درکەیە ژ تشتێن رەق و موکوم.

**رویین تن(Rûyîn ten):** ب هێز و زاخ ـ نازناڤێ «ئسفەندیار»ی یە د

شەهناما فردەوسی دا.

**رویین خم(Rûyîn xum)**: داهۆل.

**رە(Reh)**: کورتکریا پەیڤا (راه): رێ، رێک ـ جار، کەرەت ـ رێ و رەسم، رێباز ـ ئاواز.

**رها(Reha)**: ئازاد، سەربخوە.

**رهاندن(Rehanden)**: ئازادکرن، رزگارکرن.

**رهاوی(Rehavî)**: ئاوازەکا موزیکا ئیرانی یە.

**رهایش(Rehayêş)**: ئازادبوون، رزگار بوون.

**رهبان(Rehban)**: زێرەڤانێ رێکێ ـ کەسێ کو ژ مەزناهی یا خودێ زێدە بترسییێت.

**رهبان(Ruhban)**: خودێناس و عیبادەتکەرێ ئولێ مەسیحی، کەسێ کو د دێرێ ڤە دروینت و ب عیبادەتی مژویل دبت.

**رهبر(Rehber)**: رێبەر، پێشەوا، رێ نیشاندەر.

**رە بردن(Reh burden)**: ڤەدیتن یان بسەرهلبوونا تشتەکی یان رێکەکێ یان چارەیەکێ.

**رە بسیج(Reh besîc)**: رێڤنگ، سەفرەکەر.

**رهبە(Rehbe)**: ترس، سەهم.

**رە پیما(Rehpêyma)**: کەسێ کو رێکەکێ دپیڤت، رێڤنگ ـ هەسپ یان هێستری کو حێل بچیت و مرۆڤ لێ سوار بیت.

**رە توشە(Rehtûşê)**: خوارنا رێکێ، ئازوقێ کو رێڤنگ دگەل خوە دبەت دا برێڤە بخوت.

**رهرو(Rehro)**: رێڤنگ ـ زاهد ـ مرید ـ کولانکێت د ناڤ خانی یان شکەفتێ یان مزگەفتێن کەڤن دا کو پشکێن ژێک جیاواز پێکڤە گرێبدەت.

**رهزن(Rehzen)**: دز، جەردەچی، رێگر.

**رەگو(Rehgû)**: سترانبێژ.

**رهگیر(Rehgîr)**: رێگر، دز، جەردەچی ـ رێڤنگ، گەریدە.

**رهن(Rehn)**: گرەو، تشتەک ل نک کەسەکی ب گرەو دانان، دەمێ کەسەک مەبلەغەکێ پارەی قەر بکەت دڤێت بەرامبەر وی پارەی تشتەکی ب هەمان بها بدانیتە نک خودانێ پارەی و چ گاڤا قەرێ خوە زڤراندەڤە دێ وی تشتێ کو ب گرەو ل نک خودانێ پارەی

دانای ژی وەرگریتەڤە.

**رهنما(Rehnema):** رێ نیشاندەر.

**رهنمون(Rehnemûn):** بنێرە: (رهنما).

**رهو(Rehû):** رێباز ـ شەنگستە ـ هەروەسا دبێژن ناڤێ وی چیایە یێ کو (ئادەم) لسەر روینشتی پشتی کو ژ بەهشتێ هاتیە دویرئێخستن.

**رهی(Rehî):** رێڤنگ ـ خولام ـ بەنی، عەڤد.

**رهیاب(Rehyab):** کەسێ کو رێکێ ڤەبینتەڤە ـ کەسێ کو رێکەکا تازە یان رێبازەکا نوی بدانت ژ بۆ ئەنجامدانا کارەکی.

**رهیدن(Rehîden):** ئازادبوون، رزگاربوون.

**رهیق(Rehîq):** مەی، عەرەق.

**رهینە(Rehîne):** بنێرە: (رهن).

**ریاست(Riyaset):** سەرۆک بوون، سەروەری کرن ـ سەروەری، سەرداری، مەزنی، فەرمانرەوایی.

**ریاضت(Riyazet):** هەڤتکرنا جانی هەسپی و رێڤەچۆن نیشا دان ـ وەرزش کرن ـ وەک زاراوەکێ صوفیاتی، ئانکو: خوە لبەر رەنج و وەستیانێ گرتن ل پێناڤ پالاوتنا نەفسێ و بدەستڤە ئینانا سنجێن قەنج ـ خوە ڤەدەرکرن ژ بۆ هزرکرن و عیبادەتی.

**ریاکار(Riyakar):** دو رووی، کەسێ کو ب سەرڤە وەسا خوە نیشان بدەت کو یێ کارێن قەنج دکەت و دەهمەن پاقژە و دبنڤە بەرۆڤاژی ڤێ چەندێ بت.

**ریال(Rêyal- Riyal):** ناڤێ پارێ ئیرانێ یە و د کەڤن دا دگوتنێ (قران: Qêran)، کو هەر ریالەک بەرامبەری سەد دینارانە و هەر دەه ریال دبنە ئێک تومان.

**ریچار(Rîçar):** مرەبا ـ ریچول، ریچال ـ ئاخفتنێن پویچ و بێهودە.

**ریخ(Rîx):** ریخ، گوی.

**ریخت(Rîxt):** بەژن و بال.

**ریختن(Rîxten):** پەلاتەکرن، بەلاڤکرن ـ رشتن.

**ریدک(Rîdek):** کورک، کورکوک.

**ریدن(Rîden):** ریتن، تارەت کرن.

**ریز(Rîz):** هویر، بچویک، گەلەک بچویک ـ چیک ـ قورچ ـ پەیالە ـ ئارەزوو، مراد.

**ریزابە(Rîzabê):** ئاڤا کو ژ جهەکی یان جۆوەکێ یان رۆوەکێ برێژتە

سەر رووبارەکی.

**ریزان(Rîzan)**: رێژ، وەکی: (اشک ریزان: روندک رێژ، بەرگ ریزان: وەرزێ بەلگ کەفنێ(پاییز)).

**ریزە(Rîzê)**: هویر، بچویک.

**ریزیدن(Rîzîden)**: رشتن.

**ریژ(Rîj)**: ئەردێ پڕ گـرک ـ ئارەزوو، مراد ـ گێول.

**ریس(Rîs)**: بەنک، دەزی.

**ریستن(Rîsten)**: بنێرە: (ریدن).

**ریسمان(Rîsman)**: وەریس، کنف.

**ریسیدن(Rîsîden)**: رێسان، ڤەهاندن.

**ریش(Rîş)**: ریە، ڕدێن ـــ برین(جرح).

**ریش کاو(Rîşkav)**: هەبلە، بێ فەهم ـ ئەحمەق.

**ریشو(Rîşû)**: ریە درێژ.

**ریشور(Rîşûr)**: بنێرە: (ریشو).

**ریشە(Rîşê)**: رە و ریشال(مەبەست ژێ رە و ریشالێن دار و گیاینە).

**ریشیدن(Rîşîden)**: زیڤال زیڤال بوون، پرت پرت بوون، برین لێ دیار بوون ـ رشتن، پێداکرن، رەشاندن.

**ریغ(Rîx)**: دەهمەنا چیای ـ بیابان ـ دوژمنی، کینە، نەفرەت.

**ریغال(Rîxal)**: پەیالە یان جاما مەی ڤەخوارنێ.

**ریکا(Rîka)**: بنێرە: (رایکا).

**ریکاشە(Rîkaşê)**: سیخور.

**ریگ(Rîg)**: خش بەرک، بەرکێت هویر، خیز.

**ریم(Rîm)**: کێم و عەداف ـ قرێژ و قیڤار.

**ریمن(Rîmen)**: فێلباز، حیلەکەر ـ کیندار.

**ریمە(Rîme-ê)**: کنیشتێ چاڤی.

**ریو(Rîv)**: فێل، حیلە.

**ریواس(Rîvas)**: بنێرە: (ریو)ـ رێڤاس.

**ریوە(Rîve)**: گر، مل، کومت ـ بنێرە: (ریو).



**ز(Za):** تیپا سێزدێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی. هندەک جارا دهێتە گوهارتن ب تیپا (ج)، وەکی: (ارز = ارج: بها، قەدر و قیمەت)، و هندەک جارا دبیتە (غ)، وەکی: (فروز = فروغ: روناکی).

**زائو(Za'û):** ژنکا کو ژ نوی خوەدێ بچویکەک دابیتێ(ژنکا کو د رۆژێن دەستپێکێ دا بت پشتی بچویک بوونێ).

**زاب(Zab):** ئاڤ زە ـ کانی ـ رێکا کو ئاڤ تێرا دبوریت ـ سالوخ و خەسلەت.

**زابل(Zabul):** ناڤێ ئاوازەکا مۆزیکا ئیرانی یە، پارچەیەکە ژ موزیکا چارگاه.

**زابلستانی(Zabulêstanî):** خەلکێ باژێرێ زابلستان(کو ناڤێ کەڤنێ سیستانێ بوو).

**زاج(Zac):** ژنا کو بچویک ببیت هەتا حەفت روژێن وێ تمام دبن دبێژنێ زاج(مە پەیڤەکا نێزیکی ڤێ پەیڤێ ب زمانێ کوردی یا هەی، کو ئەو ژی پەیڤا «زاک»ە، و «زاک» ژی ئەو شیرە کو هەر ژ پشتی بوونێ ژ گوهانێن دەیکێ یان ماکێ دەردکەڤیت.. ئەڤ پەیڤە بۆ مرۆڤ و گیانەوەران هەردووان بکار دهێت).

**زاج سور(Zac sûr):** رۆژا کو ژنکا بچویک بووی دچیتە حەمامێ و خوە دشوت، وێ رۆژێ مێهڤانداری یەکێ دادنن و دبێژنێ «زاج سور».

**زاد(Zad):** کورتکریا پەیڤا «زادە: زا، ژ دایکبووی» ـ تەمەن و ژی، مینا: (زاد برآمدن = بە زاد برآمدن: پیربوون، دانسال بوون،

بناڤسالڤەچوون).

**زاد بر زاد(Zad ber zad):** بابک بۆ باکی، جیل بۆ جیلی، سینگ بۆ سینگی.

**زادبود(Zadbûd):** زادگەه، جهێ ژ دایکبوونێ.

**زادبـــوم(Zadbûm):** وەلات، وار، جهێ ژ دایکبوونێ.

**زادغر(Zadxer):** بیژی، حەرامزادە.

**زادن(Zaden):** زان، بچویک بوون.

**زادوبـــــــود(Zado bûd):** هەبوون(وجـــود) ـ ســـامـــان و ســـەرمـــایە ـ زادگـــەه(جـــهێ ژ دایکبوونێ).

**زاده(Zade-ê):** ژ دایکبـــووی، زا، زادە(وەکی: میرزا، شاهزادە).

**زار(Zar):** پاشگرە و ئانکوا زێدەهی و پرانی و فـراوانییێ ددەت، وەکی: (پنبەزار = جهێ کو گەلەک پەنبی لێ هەبیت، ریگزار = جـــهێ کـــو گەلەک خیز لێ هەبیت)ـ بێ هێز، وەستیـای، لاواز، لەغـەر ـ نالین، گـری ژ بەر زێدەهی یا ئێـشـا یان خەما ـ خراب، بێ سەروبەر، شێل و بێل.

**زارخورش(Zarxurêş):** کێم خوارە، کەسێ کو ژ بەر کێم خوارنێ لەغەر و بێ هێز ببیت.

**زاریدن(Zarîden):** گرین(بەروڤاژی کەنینێ).

**زاستر(Zaster):** وێڤەتر، دویرتر.

**زاغـــــــــر(Zaxer):** بـەرچـێـلـک (کـیـسکەکە کـو دکەڤتە د ناڤبەرا حەفک و عـویرکێ مـریشکێ دا و تۆمک تێدا خڕڤە دبت).

**زاغنول(Zaxnûl):** دم، نکل ـ تیـرا سەر تیژ.

**زافه(Zafe):** ژویژی.

**زاگاب(Zagab):** حبرێ چینی.

**زال(Zal):** پیـر، دانســال ـ هەروەسا سالوخە بۆ دنیـایێ یان ژی دڕکەیە بۆ دنیـایێ ـ ناڤێ بابێ روستـەمی یە کـو کـوڕێ «سـام»ی بوو و دبێژن دەمێ کـــو ژ دایک بـووی مـــویێ ســـەرێ وی ســپـی بوو، لەورا ژی ناڤێ «زال» ل سەر دانابوون.

**زالو(Zalû):** زیری، زێلی.

**زامـــهـــــران(Zamehran):** نوشدارو(دەرمانێ دژی ژەهرێ یە ـ دەرمـانەکە ڤـەدخـون بۆ ژ ناڤـبـرنا ژەهرێ و کارتێکرنێن ژەهرێ).

**زامـــیـــاد(Zamyad):** ناڤێ رۆژا

بیست و هەشتێ یە ژ هەر هەیڤەکا
سالا هەتاڤی ـ ناڤێ فریشتەکێ یە
د ئاییێ زەردەشتی دا.
**زانو(Zanû):** چۆک.
**زانویی(Zanûyî):** هەر تشتەکێ وەکی چۆکی چەمیای بیت، بۆ نموونە: (ئیشکێن بۆری یا).
**زاو(Zav):** ب هێز، ب زاخ ـ ب شیان، هۆستا (دکارێ هونەری دا) ـ شکەن، دەرز، کەلشت.
**زاور(Zaver):** هێز، زاخ، شیان ـ خزمەتکار.
**زاورا(Zavêra):** بێچارە ـ دەربەدەر.
**زاوش(Zavuş):** د زمانێ فارسی دا ناڤێ ستێرا (موشتەری)یە.
**زاولانە(Zavlane):** قەید(خەلەکێن ئاسنی کو دەست و پێن زیندانیان پێ گرێددان) ـ هەروەسا بۆ کەزیێن بادای ژی دهێتە گوتن.
**زایا(Zaya):** یا بزێت(بەروڤاژی ستەور).
**زایاندن(Zayanden):** پیرکاتی کرن، هاری ژنکا ب حەملە کرن دا بچویک ببیت.
**زایش(Zayêş):** بوون، بچویک بوون.
**زایشگاه(Zayêşgah):** جهێ بچویک بوونێ(ب تایبەتی بۆ پشکەکێ ژ نەخوەشخانێ دهێتە گۆتن کو ل وێ پشکێ زاروک دهێتە سەر دنیایێ(ولادە)).
**زایان(Zayman):** بنێرە: (زایش).
**زاییدن(Zayîden):** زان، بچویک بوون.
**زب(Zeb):** بەلاش، ب هەروە.
**زبان(Zeban):** ئەزمان(لیسان) ـ زمان(لغة).
**زبانە(Zabanê):** پێت، بلێسە، گڕپە.
**زبر(Zêbr):** زڤر(بەروڤاژی نەرم).
**زبر(Zeber):** سلال، لسەر ـ «ە، ـە» (مەبەست ژێ «فتحە»یە، بۆ نموونە هەگەر بێژی «فتحە»یەکێ دانە سەر فلان تیپێ، دێ ب فارسی بێژی: «زبری بگذار بالای فلان حرف»).
**زبرتنگ(Zeberteng):** تەنگا دەوارا.
**زبردست(Zeberdest):** ب هێز، ب شیان، ب زاخ ـ زۆردەست، زۆردار(بەروڤاژی ژێردەستیێ).

**زبرزیر(Zeberzîr):** سەرابن، نوخین ـ ڤاژی، بەراپشت ـ وێران.

**زبوده(Zebûde):** ناڤێ گیایەکی یە ـ ژ نشکەکی ڤە.

**زبهر(Zêbher):** بێزاربوونا دەیک و بابا ژ زاروکێن خوە.

**زخ(Zex):** بەهلیلک، بالیل ـ بنێرە: (زخم)ـ بنێرە: (زخمە)ـ نال نال ـ ئاواز، ئاوازێن خەمگین.

**زخاره(Zexare):** چەقێن دارێ.

**زخم(Zexm):** برین، جهەکێ لەشی کو درب دیتبیت و خوین و کێم ژێ بهێت.

**زخم خـــوردن(Zexm xorden):** بریندار بوون.

**زخمدار(Zexmdar):** بریندار.

**زخم کـاری(Zexmê karî):** برینا ب ترس، برینا کو گەهشتبیتە ئەندامەکێ گرنگ یێ لەشی کو جهێ مەترسیێ بیت.

**زخمناک(Zexmnak):** بریندار.

**زخمه(Zexme):** ئالاڤەکێ بچویکە کو سازژەن دناڤ هەردو تبلێن خوە بێن شەهدە و بەرانێ دا دگرت و ژەهێن سازێ پێ دژەنت.

**زخمی(Zexmî):** بریندار.

**زد(Zed):** جەوی، سترک.

**زداییدن(Zêdayîden):** پاقژکرن ـ صەفاندن، پارزنین ـ هوسین.

**زدن(Zeden):** لێدان، قوتان.

**زدوخـــورد(Zedo xord):** هەڤدو قوتان.

**زدودن(Zudûden- Zêdûden):** بنێرە: (زداییدن).

**زر(Zer):** زێڕ ـ پیر، دانسال.

**زراغنگ(Zeraxeng):** ئەردێ رەق ـ جهێ کو گەلەک خیز لێ بیت.

**زر آگین(Zeragîn):** پڕی زێر، تژی زێر.

**زراندود(Zerendûd):** ئاڤزێرکری، تامدای ب زێری.

**زراه(Zerah):** دەریا.

**زربان(Zerban):** پیر، دانسال.

**زرچوبه(Zerçûbê):** دەرمـــانکێ زەر(جورەکێ بهاراتایە).

**زرد(Zerd):** زەر، رەنگێ زەر.

**زردالو(Zerdalû):** مژمژە.

**زردپاره(Zerdparê):** پەڕوکەکێ ب رەنگێ زەری کو د کەڤن دا جوهی یا دادنانە سەر ملێن خوە داکو ژ موسلمانا بهێنە فەرق کرن.

**زردک(Zerdek):** کورتکریا پەیڤا

(زرد) ئانکو: رەنگێ زەر ـ گێزەر.

**زردگــوش(Zerdgûş)**: دڕکــەیە ژ مرۆڤێن منافق و پویچ و فەلیتە و کولافە و پەشێمان.

**زردە(Zerdê-e)**: زەرک(زەرکـــــا هێکێ)ـ هەسپێ زەر.

**زردی(Zerdî)**: ئێشا زەرکی.

**زرزر(Zêrzêr)**: زرزڕ، زرێـــــــن، زرێنی، زرەزڕ.

**زرزورە(Zurzûre)**: جـــــورەکێ تەڤنپیرکایە.

**زرگر(Zerger)**: زێرنگر.

**زرمـــان(Zerman)**: پیـــــری، دانسالی.

**زرنـــگ(Zereng- Zêreng)**: زیرەک ـ چست و چالاک ـ دارا کو گەزو ل سەر بەلگێن وێ چێدبیت.

**زرنیلە(Zernîle)**: رێڤاس.

**زرو(Zerû)**: زێری، زێلی.

**زروان(Zer- Zurvan)**: ئێـک ژ خوداڤـەندایە د ئایینێ زەردەشـتی دا. دەسـتـەکـەک ژ زەردەشـتـیـێن کـــەڤن ل وێ باوەرێ بوون کـــو «زروان» دەستپێکا ئافراندنێ یان ئافرندێ باشیێ یە(بابێ مەزنییێ).

**زرە(Zêrêh)**: زری و کومزری.

**زرەپوش(Zêrêhpûş)**: کـەسێ کـو زری و کـومـزری کـربنە بەر خـوە ـ زریپوش(مدرّع).

**زرەگر(Zêrêhger)**: زری ساز.

**زریـــن(Zerrîn)**: زێـــریـــن، هـــەر تشـــتـــەکێ وەکی زێری یان ب رەنگێ زێری یان ژ زێری هاتبـیـتـە چێکرن.

**زستن(Zêsten)**: ژیان.

**زشت(Zêşt)**: کرێت.

**زشـتــار(Zêştar)**: ئاخـفتن پیس، قەسە تامسار.

**زشت خو(Zêşt xû)**: بێ تبعەت.

**زشت نام(Zêşt nam)**: رســـوا، هەتک لێ چووی.

**زشت و زیبـــا(Zêşto zîba)**: ئەو هۆزانا کـو هۆزانڤـان د رێزەکێ دا پەسنێ بدەت و د رێزا دویڤ دا تێ بوەربنیت(نەکامییێ بکەت).

**زشت یاد(Zêşt yad)**: غـەیبـەت، نەکـامـی کـو دەربارەی کـەسـەکی نەئامادە بێتەکرن.

**زغـار(Zexar)**: لەککە یان پنی یا کـو لسـەر ئەردی خـویا دبیت لژێر کـــارتێکرنا نمێ(رطوبت) یان دوهنی ـ بەلا، نەخـوەشی، ئازار ـ

هاوار، فریاد، قیژین.

**زغارو(Zexarû)**: قەحبەخانە.

**زغـارە(Zexare)**: نانێ گـارسی ـ گرگێن هەڤیری.

**زغاک(Zexak)**: چقێن دارمێوێ.

**زغال(Zuxal)**: رەژی.

**زغال سنگ(Zuxal seng)**: کۆمر.

**زغـاو(Zexav)**: ژنا دەهمـەن پیس، قەحبە.

**زغـنـد(Zexend)**: دەنـگـێ بـلـنـد، هەوار، قـیـژی، نرینا گـیـانەوەرێن درندە.

**زفت(Zeft)**: گر، قەلەو، بخوەڤە.

**زفت(Zuft)**: قـــەلس، بەخـــیـل، خەسیس.

**زفت(Zêft)**: زفت، قیـرا کو ژ گازێ دهێــتــە وەرگــرتن ـ هەروەســا بۆ سترکێ(صمغ) ژی دهێتە گوتن.

**زفر(Zefer)**: دەڤ.

**زک(Zek)**: ئاخفتنا د بن لێڤانڤە.

**زکاب(Zekab)**: حوبرێ نڤیسینێ.

**زکـارە(Zekarê)**: ســەرســەری، شەرکەر، شەرخواز.

**زکاسە(Zukasê)**: سیخور.

**زکند(Zukend)**: ترارکێ کو ژ ئاخا جێرکا هاتبیتە چێکرن.

**زگال(Zugal)**: رەژی.

**زگـیـل(Ze- Zêgîl)**: بەهلویلک، بالویلک.

**زلف(Zulf)**: بسک.

**زلو(Zelû)**: زێری، زێلی.

**زلوبیا(Zelûbîya)**: زەلابی، ژ بەر شکلێ وێ کو وەکی (زلو = زێری، زێلی)یە، لەورا ئەڤ ناڤـە لسـەر دانایینە.

**زلە(Zelle)**: چرچرک.

**زلیـــفن(Zelîfen-Zelêyfen)**: ترس ـ گەفکرن ـ کینە.

**زم(Zem)**: سەرما، سر ـ بایێ سار.

**زماروغ(Zemarûx)**: کڤارک.

**زمـــان(Zeman)**: وەخت، دەم ـ رۆژگار ـ مەرگ.

**زمانە(Zemanê)**: رۆژگار.

**زمترا(Zemetra)**: ترانە و یاریکرن ب کەسەکی.

**زمـزم(Zemzem)**: دوعـــایا کـــو زەردەشتیـا ل دەمێ شویشتنا لەشێ خوە یان ل دەمێ خوارنێ دگوتن.

**زمـــســـتـــان(-Zemêstan Zêmêstan)**: زڤـستـان، وەرزێ زڤستانێ.

**زمـــودن(Zemûden)**: نەخش و

نیگار چێکرن.
**زمی(Zemî):** ئەرد.
**زمـــیــــاد(Zemyad):** بنیـــرە: (زامیاد).
**زمین(Zemîn):** ئەرد.
**زن(Zen):** ژن(مرۆڤا مێ ـ کەسا کو دبیتە هەڤژینا زەلامی).
**زناشویی(Zenaşûyî):** جۆتبوون، زەوجین(شـویکرنا ژنێ، ژن ئینانا مێری).
**زنـانـە(Zenanê):** وەکـی ژنـکـا. هەروەســا پەیڤــا (زنانگی) ژی ژ ڤێ پەیڤێ یە، ئانکو هەر کارێ کو تایبەت بیت ب ژنکاڤە.
**زنبـــارە(Zenbarê):** ســـەرژنـک، زەلامێ کـو گـەلەک حـەژ ژنکا و سـوحبـەتێن وان بکەت. هەروەسا پەیڤا (زنبارگی) ژی ژ ڤێ پەیڤێ یە، ئانکو هەر زەلامێ کـو خـوە دژنـکا ڤـــەددەت و یاریا ب ژنـکا دکەت.
**زن بمـزد(Zenbêmuzd):** زەلامـێ بێ غیرەت و گەواد کو خەلکی ب ئنیـەتا پێـڕابوونا کارێ گـوهنێلیێ بینـتـە دەڤ ژنکا خـوە بەرامـبـەر پارەکی یان تشتەکێ ماددی.
**زنبـورک(Zenbûrek):** جـورەکێ تۆپێ بوو.
**زنبــــورکـــــچی(Zenbûrekçî):** ســـەربازێ کــو تۆپا ژ جـــورێ «زنبورک» ب حێشترا یان هێسترا هەلدگـــرت و د شـــەڕی دا بکار دئینا. ئەڤ رەنگێ ســـەربازا ل ســـەردەمێ «ســـەفـــەوی»یا و سەردەمێ «قـاجاری»یا جورەک ژ جێشا ئیرانێ بوون.
**زنبـــوری(Zenbûrî):** پەردا کـــو دئێـخنە دەرێ خـانـی دا پێـشی و مـێش و تشـتـێن وەکی وان نەئێنە دژۆرڤە.
**زنبیل(Zenbîl):** سەلک، زەمبیل.
**زنج(Zênc):** جـــــــــــەوی، سترک(صمغ).
**زنجره(Zencere):** چیرچیروک.
**زنجه(Zence):** زێمار.
**زنجیـدن(Zencîden):** زێمـارکـرن، گرین ل هنداڤ تەرمێ مری.
**زنـچـک(Zençek):** ژنا دەهمــــەن پیس، قەحبە.
**زنخ(Zenex):** ئەرزنـک. دگــــەل کـارێن کـو لدویڤـرا دهێن واتایێن تایبـەت ددەت، وەکی: (زنخ زدن:

ئاخفتنێن بێهودەکرن. یان: زنخ برخـون زدن: دڕکـەیە ژ شەرمکرنێ).

**زنخدان( Zenexdan):** ئەرزنک ـ بن کوڕ.

**زند(Zend):** تەفسیر، تەفسیرا ئاڤێستایێ ـ مەزن، گر ـ ب زاخ، ب هێز ـ ناڤێ تیرەکەکا کوردێن ئیرانێ یە کو ل دورماندوری باژێرێ (مەلایر) دژیان و «نادرشاهی» گەلەک ژ وان راکرن و برنە دەڤەرا (گەز) سەر ب پارێزگەها نوکە یا خوراسانێ ڤە نیشتەجێ کرن و پشتی مرنا «نادرشاهی»، «کەریم خانێ زەند» کو ئێک ژ سەردارێن «نادرشاهی» بوو ئەو «زەند»ی هەموو ڤەگەراندنەڤە (مەلایر) و بوو سەروکێ عەشیرا (زەندی)یا و هەروەسا دەستەلات ژی کەتە دەستا و ژ (١١٦٣ـ١٢٠٩کوچی) ل فارس و اصفهان حوکم گێڕا و ب دەستێ «آقا محمد خان» دەستەلاتا زەندی یا ژ دەستا هاتە دەر. بۆ زانین د ڤان سالێن ناڤ ئینای دا و لدویڤ ئێک، ژ ڤێ بنەمالێ (٨) شاه رابوون ئەو ژی ئەڤە بوون: (کریم خان ـ ابوالفتح ـ علیمراد ـ محمد علی ـ صادق ـ علیمراد(دوبارە) ـ جعفر ـ لطفعلی).

**زندان(Zêndan):** حەبس، زیندان، گرتیگەه.

**زندانبان(Zêndanban):** زێرەڤانێ زیندانێ.

**زندان سکندر(Zêndanê Sê-kender):** نازناڤێ کو د کەڤن دا لسەر باژێرێ (یەزد)ا نوکە بوو.

**زندانی(Zêndanî):** زیندانی.

**زندبار(Zendbar):** گیانەوەرێ بێ ئازار وەکی پەز و چێلا.

**زندگانی(Zêndêganî):** ژیان ـ د ژیانێ دا ـ ژی، تەمەن.

**زندواف(Zendvaf):** کەسێ کو (زند: ئاڤێستایا وەرگێڕای) دخوینیت، پێشەوایێ زەردەشتی یا ـ سروودبێژ ـ بلبل، فرندێ دەنگ خوەش.

**زندە(Zêndê):** ساخ، زیندی، گیاندار(بەروڤاژی پەیڤا «مری»).

**زندە بگور(Zêndê bêgor):** کەسێ کو ب ساخی هاتبیتە

ڤەشارتن.

**زندەدل(Zêndêdêl)**: کەیف خوەش، خوەشحال ـ دل تەڕ(دڕکەیە بۆ وی مرۆڤێ سەرەرایی پیراتیا خوە، هەرێ گێولۆ بت و دلێ وی حەژ خوەشیان بکەت).

**زنگ(Zeng)**: ژەنگ، ژەنگار ـ ئەو کەرەستێ کو ل پشتا شیشێ ددەن دا ببیتە خودیک ـ تیرۆژکێن تاڤێ و هەیڤێ ــ زەنگل ــ ژەنگ، ئاتافەکێ گیایی یە ـ لدەڤ صۆفی و خودێناسا دڕکەیە ژ وێ طاریاتییا کو ژ گونەه و کریارێت نەشایستێت نەفسێ دکەڤیتە سەر دلی، و دلی ژ وەرگرتنا راستیییا و رۆناهیان دویر دئێخیت .

**زنگار(Zengar)**: ژەنگ، ژەنگار.

**زنگال(Zengal)**: ساقێن چەرمی کو دئێخنە پێ ی.

**زنگدان(Zengdan)**: زەنگل.

**زنگل(Zengul)**: زەنگل. هەروەسا پەیڤێن (زنگلە، زنگلیچە، زنگولە) ژی هەر ب ڤێ مەبەستێ لکارن.

**زنگولە(Zengûlê)**: زەنگل ـ ناڤێ ئاهەنگەکا موزیکی یە.

**زنگیچە(Zengîçê)**: ئەنیشک.

**زنودن(Zenûden)**: زێمارکرن ـ لوبرین.

**زنوییدن(Zenûyîden)**: بنێرە: (زنودن).

**زنهار(Zênhar)**: پەیڤەکە بۆ هشیارکرنێ و های لخوەبوون یان ئاگەهدارکرنێ بکار دهێت و ئانکویا (هشیار بە، خوە دویر بێخە، تە های ل خوە هەبیت) ددەت، وەکی: (زنهار دروغ نگو = نهێ درەوا نەکی، خوە دویر بێخە ژ درەوا) ــ هەروەسا ئانکویا پەناه(امان) ددەت، وەکی: (بە زنهار کسی درآمدن = پەناه برنە بەر کەسەکی ـ پەیمان(عهد).

**زنهارخوار(Zênharxar)**: پەیمان شکێن.

**زنهاردار(Zênhardar)**: خودان پەناه و خودان پەیمان، وەفادار.

**زنینە(Zenînê)**: هەر تشتەکێ بسەر ژنکاڤە بیت ـ ب ئانکویا (ژن) بخوە ژی دهێت.

**زو(Zev)**: دەریا.

**زوادە(Zevade)**: زاد، خوارنا

رێڤنگ دگەل خوە دبەت.

**زوار(Zevar):** خزمەتکار ـ کەسێ کو چاڤدێری و سەرەگوهیا نەخوەشا یان زیندانیان دکەت.

**زواله(Zevalê):** گرگێت هەڤیری.

**زاوه(Zavê):** خوارنا کو بۆ زیندانیان بەرهەڤ دکەن.

**زوبین(Zûbîn):** رما بچویک، خشت.

**زوتر(Zûter):** کورتکریا پەیڤا (زودتر) ئانکو: زویتر.

**زود(Zûd):** زوی، توند، حێل، ب لەز.

**زور(Zûr):** شیان، هێز، زاخ ـ فشار ـ دەستهەلی ـ زۆر، زولم و ستەم.

**زور(Zever):** سلال، ژۆر.

**زورآزما(Zûrazma):** وەرزشکار ـ پەهلەوان ـ ئەو کەسێ کو زاخا خوە بجێرببینت.

**زورخانه(Zûrxanê):** جهەکێ تایبەتە ب وەرزشێن کەڤنێن ئیرانیان ڤە.

**زورمند(Zûrmend):** ب هێز، ب زاخ.

**زورین(Zeverîn):** ژۆری.

**زوزه(Zûzê):** لویرین(وەکی لویرینا سەی و طوری یا).

**زوغ(Zûx):** جۆ ـ روبیار ـ زەرداڤ.

**زون(Zûn):** باهر، پشک.

**زه(Zêh):** ئافەرین ـ باش، قەنج ـ ژەها کڤانێ ـ ئاڤزە(ئاڤا کو ژ جهەکی بزێت) ـ بوون، زان(هەروەسا ژ ڤێ پەیڤێ و ب ڤێ ئانکوێنە پەیڤێن: دردزه = ژانێن کو دهێنە ژنکا یان گیانەوەرا لدەمێ باردانانێ ـ زهی = باردار، ب حال، ب تشت(حامله) و هەروەسا بۆ گیانەوەرا ژی ئانکو: ئاڤز)ـ گیانەوەرێ کو ئامادە بیت بۆ ئاڤزبوونێ ـ ماهینا کو بارێ خوە دانابیت.

**زهاب(Zêhab):** ئاڤزە.

**زهار(Zêhar):** بنێ زکی، شەرمگەه، پشتیکا ئالاڤێ گوهنێلیێ ژنکێ، دۆرماندۆری ئالاڤێن گوهنێلیێن ژن و زەلامان کو رێڤ لێ دهێن.

**زهدان(Zêhdan):** مالبچویک، رەحم(جهێ بچویکی د زکێ دەیکێ یان ماکێ دا). پەیڤێن: (بوگان، بوبگان، پوگان، بوهمان و

بون) ژی لکارن.

**زهر(Zehr):** ژەهر.

**زهره(Zehrê-e):** کیسکێ زەرداڤێ(کیسة الصفراء)ـ دلێری و مێرانی. د کەڤن دا خەلک ل وێ باوەرێ بوون کو ترسا زێدە دبیتە هۆیێ پەقینا یان قەتیانا ڤی کیسکێ زەرداڤێ؛ و ئەڤروکە ژی هەگەر کەسەک ژ ترسا ژ حال بچیت و بێ هۆش ببیت، خەلک دبێژن: زەراڤا وی یا قەتای. ل شوینا ڤێ رستا کوردی ب فارسی دبێژن: (زهره ترک شده.).

**زهزاد(Zêhzad):** ژن و زاروک، عەیال.

**زهشت(Zêhêşt):** بێهن(نفس).

**زهک(Zêhek):** زاک و فری(شیرێ چێلێ یان پەزی د دەمێن پشتی زایینێ دە).

**زهگیر(Zêhgîr):** هندەک قەلپیشک کو ژ چەرمی یان هەستیا دهاتنە چێکرن و تیرهاڤێژا دئێخستنە سەرێ تبلێن خوە دا ژەها کڤانێ زیانێ نەگەهینتە تبلێن وان.

**زهنجه(Zêhence):** رێنج، زەحمەت، ئازار.

**زهی(Zêhî):** هەر ئامیرەکێ موزیکی یێ ژهدار ـ گیانەوەرێ بەرهەڤ بۆ ئاڤزبوونێ ـ هەر تشتێ کو بزێت ـ ئاڤز، باردار، ب تشت(حامله) ـ ماهینا کو ژ نوی زابیت ـ پەیڤا باشیێ یە، وەکی: ئافەرین، چ جوان، چ خوەش و......هتد.

**زهیدن(Zêhîden):** زایین، زاروک بوون ـ زانا ئاڤێ ژ کانی یا یان هەر تشتەکێ دی.

**زی(Zî):** ئال، رەخ، کنار ـ نێزیک.

**زیان(Ziyan):** زیان، زەرەر، دۆراندن ـ زندی(هەر تشتێ کو بژیت).

**زیب(Zîb):** کەشخەکرن، ئاراستەکرن، خەملاندن.

**زیبا(Zîba):** باش، دەلال، خشکوک، جوان، رند.

**زیبال(Zîbal):** هەسپ و هێستری کو توند بچیت.

**زیبان(Zîban):** بنێرە: (زیبا).

**زیبیدن(Zîbîden):** ژ هەژی بوون، ب سەرڤەبوون.

**زیچ(Zîç):** چست و چالاک.

**زیر(Zîr)**: ژێر، بن، خوارێ ـ نیشانا (کسره) بەرامبەر تیپا (ێ)یا کوردی ـ د زاراوێ موزیکی دا دەنگێ نازک، زراڤ یان نزمە.

**زیرا(Zîra)**: ژ بەرکو، چونکی ـ لەورا ـ ژ بەر ڤێ چەندێ.

**زیرافکن(Zîrefken)**: دوشەک، جودەلیک، یان هەر تشتێ کو لبن خوە برایێخن ـ ناڤێ ئێک ژ ئاهەنگێن کەڤنێن موزیکی یە ـ ئێک ژ دوازدە مەقامێن موزیکێ یە.

**زیرزار(Zîrzar)**: نالینێن قەهرێ کو ب دەنگەکێ هێدی دەربکەڤن.

**زیرزبانی(Zîrzebanî)**: پارە یان خەلاتێ کو ل شەڤا ئێکێ زاڤا ددەتە بویکێ دا بئاخڤیت(ئەڤ عادەتە لجەم مە کوردا نینە) ـ ئاخفتنا هێدی ـ ئاخفتنێن د بن لێڤان ڤە.

**زیرزمین(Zîrzemîn)**: سەرداڤ(ئەو قاتێ خانی یێ کو ژ ئاستێ حەوشێ یان جاددێ کویرتر هاتبیتە ئاڤاکرن).

**زیرک(Zîrek)**: زیرەک، چەلەنگ، ب ژیر، ب عاقل، فەهما، زانا.

**زیرگاه(Zîrgah)**: کورسیک، تەخت، یان هەر تشتێ چوارپێپک کو لسەر روینن.

**زیر نگین(Zîrê nêgîn)**: دڕکەیە ژ دەستهەلات و فەرمانداریێ.

**زیره(Zîrê)**: پشکا ژێری ژ هەر تشتەکی ـ ناڤێ گیایەکێ بێن خوەشە کو ئیرانی مشە د خوارنێن خوە دا بکاردئینن.

**زیستن(Zîsten)**: ژین، زیندەگی کرن.

**زیغ(Zîx)**: حێسیل.

**زیغال(Zîxal)**: پەیالە، پەیالا مەی ڤەخوارنێ(قدح).

**زیغگر(Zîxger)**: حێسیل چێکەر.

**زیف(Zîf)**: گونەه ـ بێ تورەیی، بێ ئەدەبی.

**زیلو(Zîlû)**: بەڕک(جۆرەکێ رائێخایە کو ژ بەنکێن پەنبەیی و ب نەخشێن رەنگاورەنگ دهێتە چێکرن).

**زین(Zîn)**: زین(زینا هەسپا).

**زینه(Zînê)**: دەرەجک ـ پێسترک.

**زینهار(Zînhar)**: بنێرە: (زنهار).

**زیور(Zîver)**: هەر تشتێ کو تشتەکێ دی پێ بخەملینن.



**ژ(Jê):** تیپا چواردێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی، هندەک جارا دبیتە (ج)، وەکی: (رژە = رجـــــــە: رێـڤـــــــەچوونـا رێـک و پـێـکا لەشکەری. یان، هژیر = هجـیـر: زیرەک، هشـیـار ـ باش، قـەنج.)، هەروەسـا ل هندەک جـهـێـن دی دبیـتـە (ز)، وەکـی: (کـوژ = کـوز: قۆز، چەمیای، خوار).

**ژابیژ(Jabîj):** ئەو چیکێن ئاڤێ یێن کـــو ژ دارێ تەڕ دکـــەڤن لدەمێ سۆتنێ ـ چریسکێن ئاگری.

**ژاژە(Jajê):** ئـاخـــفـــتـنێـن پـویـچ و بێهودە.

**ژاژیدن(Jajîden):** ئاخفتنێن بێهودە کرن.

**ژاغر(Jaxer):** بەرچێلکا مریشکێ.

**ژافە(Jafê):** ژویژی، سیخور.

**ژالە(Jale):** خوناڤ ـ باران و گژلوکا توند ـ کەلەک.

**ژغ(Jex):** نالین، ئاوازێن غەمگین.

**ژغـــار(Jexar):** هەوار، فـــریـاد، نرڕێن.

**ژرف(Jerf):** کویر ـ دویر و درێژ.

**ژرفـا(Jerfa):** کـویـری یا بیـرێ یان حەودێ یان دەریایێ.

**ژغ ژغ(Jex jex):** دەنگێ ڤـێککەتنا ددانا. هەروەسـا دەنگێ ڤـێککەتنا باهیڤ و گویزا د ناڤ تەلیسی دا.

**ژغند(Jexend):** بنێرە (ژخار).

**ژف(Jef):** تـەڕ، شـل(بـەروڤـــــــاژی پەیڤێن «هشک، زوها»).

**ژفک(Jefk):** کنیشتێ چاڤی.

**ژفـیــدن(Jefîden):** تەڕبوون، شل بوون.

**ژک(Jek):** ئاخفتنێن د بن لێڤانڤە.

**ژکارە(Jekare):** پرێژ و مـایـتێـکەر ـ کیندار ـ شەڕکەر.

**ژکفر(Jekfer)**: بێهنفرەه، سابر.
**ژکیدن(Jekîden)**: ئاخفتنێن ل بن لێـڤـانڤـە ژ ئەگـەرێ قـەهر و عێجزاهیێ.
**ژگـور(Jegûr)**: قـەلس، چوریک، بەخیل، خەسیس.
**ژندە(Jende)**: کـەڤن، خـەسـپـال ـ مەزن.
**ژنگ(Jeng)**: کوریشک(کوریشکێن کو لسەر پویستی دیار دبن ژ ئەگەر پیـربوونێ) ـ ژەنگ(ژەنگی بوونا ئاسنی یان گەنمی).
**ژنگار(Jengar)**: ژەنگار.
**ژنگدان(Jengdan)**: زەنگل.
**ژنگلە(Jengule)**: زەنگل ـ سمـێن کەلاشتی(وەکی سمـێن بزن و چێل و خەزالا).
**ژنە(Jene)**: زیلکێ پێڤەدەرێن وەکی پێـشی و زرکـێـتکا و......هتـد ـ سەرکێ دەرزیک و شویژنێ.
**ژوژە(Jûje)**: ژویژی، سیخور.
**ژول(Jûl)**: پەریشـان، پێکداچووی و بێ سـەروبەر ـ قـورمـچک و کوریشک.
**ژولیدن(Jûlîden)**: پەریشـان بوون، پێکداچوون و بێ سەروبەر بوون.
**ژون(Jûn)**: پەیکەر، بوت.
**ژوهیدن(Jûhîden)**: دلۆپ کرن.
**ژە(Je)**: نیـشـانە بۆ بچـویککرنێ، وەکی: (دریاژە: دەریایا بچـویک، گۆل).
**ژی(Jî)**: ئاڤگر، حەود، هەر تشتێ کو ئاڤ تێدا خرڤە ببیت.
**ژیان(Jiyan)**: توبرە، تبـعـەت رەق ـ درندە.
**ژیر(Jîr)**: بنێرە (ژی).
**ژیژ(Jîj)**: مرار.
**ژیک(Jîk)**: چیک، چیکا بارانێ.

# س

**س(Sîn):** تیپا پازدێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی. هندەک جارا دبیتە (ش)، وەکی: (فرستە = فرشتە: فریشتە) و هندەک جارا ژی دبیتە (ه)، وەکی: (خروس = خروە: دیکل).

**سا(Sa):** ئالاڤێ وەکیاتیێ و کورتکریا پەیڤا (آسا)یە، کو وەک پاشگرەک لدویڤ هندەک پەیڤا دهێت و ئانکوا (مینا، وەک، شتی) ددەت ـ باج، ئەو تشتێ کو شاهێن ب سەرکەفتی ژ شاهێن شکەستی و بێ دەستهەلات وەردگرتن.

**سابوتە(Sabûte):** پیرەژن.

**سابورە(Sabûre):** خرابکار ـ بێ شەرم.

**سابیدن(Sabîden):** قوتان، نەرمژاندن.

**سابیدە(Sabîdê):** قوتای، نەرمژاندی، نەرم کری.

**ساج(Sac):** سێهل(سێهلا نانی) ـ جورەکێ داری یە ـ فرندەکە کو دبێژنێ (مریشکا کونجی خور) ژی.

**ساجی(Sacî):** نانێ لسەر سێهلێ بێتە پەحتن.

**ساچی(Saçî):** سپی(رەنگێ سپی).

**ساخت(Saxt):** چێکر(بۆ سێیەم کەسێ تاک)ـ چێکری، دەستکرد ـ زین و جلێ هەسپی ـ چەکێ شەری.

**ساختمان(Saxtman):** چێکرن، ئاڤاکرن ـ خانیێن بلند(عمارة) ـ شێوازێ چێکرنێ.

**ساختگی(Saxtêgî):** بەرهەڤی بۆ پێرابوون ژ بۆ بجهـ ئینان یان ئەنجامدانا کارەکی.

**ســـــاختن(Saxten):** چێکرن، دروستکرن ـ ئاڤاکرن ـ بەرهەڤکرن و ئینانە هەبوونێ ـ جـوانکرن و رێک و پێک کرن.

**ساختە(Saxtê):** چێکری.

**ســاد(Sad):** ســادە، بێ نەخش و نیگار ـ دەشت، بیـابان ـ بەرازێ نێر، بەرازێ کویڤی.

**سـادە(Sade):** سـادە، بێ نەخش و نیگـار ـ راست، ســاناهی ـ بێ غش ـ کورێ کـو هێـشتـا مـوی ل سەر و چاڤا نەهاتبیت.

**سـار(Sar):** پاشگرەکە کـو ئانکویا زێدەهی و گـەلەکـایەتیێ ددەت، وەکی: (چشـمـەسـار = پر کـانی، کـوهسـار = پر چیـا) ـ هەروەسـا ئانکویا جـهـ، در(مکان) ددەت، وەکی: (خشکسار = جهێ هشک و بێ ئاڤ، گرمسار = جهێ گەرم) ـ ل هندەک جـهـان ئانکویا (سـەر) ددەت، وەکی: (گـــــاوســـــار = تشــتـەکێ کـو ب رەنگێ سـەرێ چێلێ بیت، سـبکسـار = مـەژی هشـک، بێ عـاقـل، نگـونسـار = سەرنوخین) ـ فـرندەکە کـو خـوارنا وی حەلالە و ژ چویچکێ مـەزنترە کـو ل بهـارا پەیدا دبیت، گـەلەک حەژ تری و توی و کـولیـا دکـەت ـ رێـــنـج، ئـازار، دەرد، ئـێــش، خـەمــخـوارن ـ ئەو پەرۆکێ کـو ژنکێن هندی لشـوینا جلکی لدۆر خوە دئالینن.

**سـارا(Sara):** خـوری، بێ غش(بو زێر و مـــسـک و عنبـــەرا بکار دهێت).

**ســـــاران(Saran):** کــــــۆمـــــا سەرا(رۆوس).

**سـاربان(Sarban):** خـودانکەرێ حێشترا.

**سارج(Sarec):** زەرزێری(فرندەکە)، عــــەرەب ژی دبێـــژنێ(زرزور)، هەروەســا ناڤـێن(سـارو، سـارە، سارک، ساروک، سارج، سارجە، سـارچە، سـاسـر، شـار، شـارک، شارو، سارنگ، سارنج، ساری) د زمـانێ فـارسی دا بۆ ڤی فـرندەی لکارن.

**ســـــارخک(Sarxek-Sarexk):** پێشی.

**ســــارشک(Sareşk):** بنێـــــرە: (سارخک).

**سارغ(Sarux):** مێدەک، بوخچک.

**ساروج(Sarûc)**: هەڤیرەکێ ژ کلس و خوەلیێ بوو کو د چێکرنا حەود و عنبارێن ئاڤێ دا بکاردئینان.

**سارە(Sarê)**: جلکێ ژنکێن هندی ئەڤێ لدۆر خوە دئالینن.

**ساز(Saz)**: ئامیرێن موزیکی، کو ب سێ رەنگانە:١) سازێن بای، وەکی: بلوولێ، زرنایێ و ئاکوردیونێ. ٢) سازێن ژەهی، وەکی: عود، بزق و کەمان. ٣) سازێن قوتانێ، وەکی: داهۆل و تمبلک و دەف. ـ هەروەسا ئالاڤ، یان ئالاڤێن کاری، یان هەر تشتێ کو مرۆڤ د ژیانا خوە یا رۆژانە دا پێدڤی ببیتێ ـ فەرمانە ب چێکرنێ(چێکە)، هەروەسا وەک پاشگر لدویڤ هندەک پەیڤا دهێت ب ئانکویا چێکەر، وەکی: (چارەساز: چارەبین، کەسێ کو چارەیێ ل ئاریشەکێ بکەتن) ـ چەک و ئالاڤێن شەڕی، کو پڕانیا جاران د زمانێ فارسی دا (ساز و برگ) بهەڤرە دهێن.

**سازش(Sazêş)**: ئاشتی ـ پێکڤە ژیان ـ وەکهەڤی ـ پێکهاتن.

**سازمان(Sazman)**: رێکخستن و تەرتیفکرن ـ شێوازێ چێکرنێ ـ دەزگەهەک یان بنگەهەک یان رێڤەبەریەک کو کارمەندێن وێ بهەڤرە و ب شێوەکی رێکخستی و رێک و پێک کارێن خوە بجی بینن.

**سازمند(Sazmend)**: چێکری و بەرهەڤ ـ رێکخستی و رێک و پێک.

**سازندە(Sazendê)**: چێکەر ـ دروستکەر ـ ئاڤاکەر ـ بەرهەڤکەر و ئافرندە ـ جوان و رێکوپێککەر.

**سازو(Sazû)**: لیفکێ خورمێ، وەریسێ کو ژ لیفکێ خورمێ چێدکەن.

**سازور(Sazver)**: ئامادە و بەرهەڤ.

**سازیدن(Sazîden)**: بنێرە: (ساختن).

**ساس(Sas)**: تەختەبینک(پێشکێن کو دکەڤنە لاندکێن بچویکا).

**ساسان(Sasan)**: هەژار، فەقیر، دەستکورت.

**ساستا(Sasta)**: ستەمکار ـ بێ رەحم ـ ئازارگەهینەر ـ ئەهریمەن.

**ساسر(Sasur)**: جورەکێ لەڤەنی یە

کــو قــەلەمــا ژێ چێــدکــەن ژ بو نڤیسینێ.

**ســاسی(Sasî):** هەژار ـ دەروێش ـ گەدا.

**ساغر(Saxer):** جام، پەیالا مەیێ.

**ساغری(Saxerî):** کـەڤلێ هەسپی یان هێـسـتـری کـو هاتبـیـتـە گەمارکرن.

**سـافـوت(Safût):** فـیـتـی(دەنگێ فیتی یێ).

**سال(Sal):** سالٚ.

**سالار(Salar):** سەردار، سەرکردە، مــەزنێ مللەتی، مــەزن یان پێشرەوێ کاروانی یان لەشکەری ـ د زاراوێ جــوتیــاریێ دا ئانکو جوتیارێ شارەزا د کارێ خوە دا.

**سالاسال(Salasal):** سالٚ بۆ سالٚ، سالانە، هەر سالٚ.

**ســالانە(Salane-ê):** هەر ســالٚ، سالٚ بۆ سالٚ ـ سالێ جارەکێ.

**سال خـرد(Sal xurd):** بچـویک، کوڕ یان کچا کو ژیێ وان کێمتر بیت ژ پێنج سالێێ.

**سالخورد(Salxord):** کەڤنار، پیر، دانسالٚ.

**سالک(Salek):** برینەکە کو لسەر لەشێ مـرۆڤی ب تایبەتی ل سـەر دفنێ یان ئالەکـا دیار دبیت کـو هندەک جـــارا تـا ســـالـەکێ ڤـەدکـێشـیـت هەتا ئەو برین ساخ ببـیـتـەڤـە و پشـتی ساخ دبیت ژی هەر شـوینا وێ وەک راڤـەکێ دیارە دکــەت و ژێ ناچیت. ئەڤ برینە برێکا پێشیا(مەلاریا) ژ ئێکی بۆ یێ دی دهێتە ڤەگوهاستن و هەگەر جارەکێ ئەڤ برینە ل کەسەکی دیار بوو، جار دی دووبارە نابیتەڤە.

**سالگرد(Salgerd):** سالڤەگەڕ.

**سالە(Salmeh):** مێژوو(مێژووا کو بۆ دەست نیشـانکرنا رۆژ و هەیڤ و سـالێ د نڤـیـسـارێن فـەرمی دا دهێتە نڤیسین).

**سـالو(Salû):** پەرۆکـەکێ سـپـی یێ تەنکە کو دەرسوک و جلکێن ژنکا ژێ دهێتە چێکرن.

**سالوس(Salûs):** فێلباز، حیلەکەر.

**ســـالوک(Salûk):** لاواز ـ هەژار، دەستکورت ـ دز و رێگر.

**سـالیـان(Saliyan):** کـۆمـا پەیڤـا «سال» (سالان = اعوام، سنوات).

**سام(Sam):** وەرمتن، کـیـسـەدان ـ ناڤێ کـــوڕێ «نەریمان» و بـابێ

«زال» و باپیرێ «روستەم»ێ پەهلەوانه.

**ساماکچه (Samakçe):** ئێلەک، زەخمە (زەخمێن لسەر مەمکا بۆ ژنکا).

**سامان (Saman):** ناڤمالی ـ هەر تشتێ کو مرۆڤ د ژیانێ دا پێدڤی ببیتێ ـ ئالاڤێن کاری ـ رێکخستن و رێک و پێکی ـ ئەندازه.

**سامه (Same):** پەیمان، سوز ـ سوبند ـ پەناه، پەناگەه.

**سان (San):** داب و نەریت ـ تەرز و شێواز ـ جۆر، رەنگ (نوع) ـ پتر دگەل هندەک پەیڤێن دی دهێت و پەیڤەکا نوی یا دارشتی ژێ چێدبیت، وەکی: (یکسان = وەکهەڤ، بدان سان = وەسا)ـ وەک پاشگر دگەل هندەک پەیڤان دهێت و ئانکوا (وەکی، مینا) ددەت، وەکی: (پیل سان = وەکی فیلی، دیوسان = مینا دێوی) ـ هەروەسا کورتکریا پەیڤا (ستان)ە کو پاشگرەکێ جهی یە، وەکی: (گورسان: گورستان = گورستان، بیمارسان: بیمارستان = نەخوشخانه) ـ پشک، باهر (حصة) ـ د زاراوێ لەشکەری دا کارێ لێنێرین و چاڤدێریا وی فەرماندەیە یێ کو لبەر رێزا جندی یا را دبورت و دنێریتە جندی یا کا کیژ ژ وان ب چەوتی فەرمانێن فەرماندەی جێ بەجێ دکەت ـ کارتیک، بەراڤ.

**ساو (Sav):** باج، ئەو تشتێ کو شاهێن ب سەرکەفتی ژ شاهێن شکەستی و بێ دەستهەلات وەردگرتن ـ کارتیک، بەراڤ ـ هویرکێ زێری ـ زێرێ خوری.

**ساوه (Savê):** هویرکێ زێری ـ زێرێ خوری.

**ساویز (Savîz):** تبعەت خوەش.

**ساویس (Savîs):** هەر تشتێ کێم و گرانبها.

**ساوین (Savîn):** سەڵکا کو پەنبیێ بەرهەڤ بۆ رێسانێ دکەنە تێدا.

**سایبان (Sayêban):** سیهوانه، پەردە، کەپر یان هەر تشتێ کو بێتە هلدان داکو سیبەرێ بکەت.

**سایه (Sayê):** سه، سیبەر.

**سایەرس (Sayêres):** فێقیێ کو لبەر سیبەرێ دگەهیت.

**سـایيـدن(Sayîden):** قـوتان، نەرمژاندن، نەرمکرن ـ تێکهوسینا دو تشتا.

**سبد(Sebed):** سەلّک، زەمبیل.

**سبز(Sebz):** کەسک.

**سـبـزارنگ(Sebzareng):** ب رەنگێ کـەسکی ـ ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن کەڤنێن موزیکا ئیـرانی یە.

**سـبـزپا(Sebzpa):** (درکـەیە بۆ کەسێن پێ برەشک، بێ ئیـفلەح، کـورِ و بەش، کـو پێ وان نە یێ خێرێ بت).

**سبزپری(Sebzperî):** بهار، وەرزێ بهارێ.

**سبـز در سبـز(Sebz der sebz):** ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن کـەڤنێن موزیکا ئیرانی یە ـ ناڤێ ئاوازەکێ یە ژ هەر سیه ئاوازێن «باربد»ی.

**سبـزه(Sebzê):** گـیـایێ کـو ژ نوی شین دبیت، چیـمـەن ـ مـێـویژێن کەسک ـ کەسێ کو سەروچاڤێن وی برەنگێ گەنمی بیت.

**سبزی(Sebzî):** کەسکاتیێن کو ب خـاڤی یان کـەلاندی بێنە خـوارن، وەکی: کـەرەفس، گـژنیـژ، شـاهی و......هتد(خضروات).

**سبک(Sebuk):** سڤک، بەروڤاژی پەیڤا «گران» ـ سـڤک، سـرت، چست و چەلەنگ.

**سبو(Sebû):** گوزک، جەرِک.

**سبوره(Sebûre):** بنێره: (سابوره).

**سـبـیل(Sêbîl):** سـمـبێل، مـوییێن دسەر لێڤا سەری یا زەلامی دا.

**سپـار(Sêpar- Supar):** ئامـیـرێ کو ئاڤا تری پێ بهێتە وەرگرتن ـ ئیسل ـ گێسن.

**سپاروک(Separûk):** کوتر.

**سپاس(Sêpas):** سوپاس.

**سپاسی(Sêpasî):** گەدایی.

**سـپـاه(Sêpah):** سـوپا(زاراوەکێ لەشکەری یە).

**سـپـاهان(Sêpahan):** باژێرێ ئەسفەهان ـ کوما پەیڤا «سپاه» ـ ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن مـوزیکا ئیرانی یە.

**سپر(Sêper):** مەطال.

**سـپـردن(Sêpurden):** سـپـاردن، دانەڤ دەست کـەسـەکی ژ بۆ چاڤدێری و پاراستنێ.

**سپـردن(Sêperden):** قـوناغ برین، رێ ڤەبرین.

**سـپـرز(Sêpurz):** خالخالک(طحال).

**سپرغم(Sêperxem):** گول و گیا، گول و گیاییێ بێن خوەش، رحان.

**سـپـرلوس(Sêperlûs):** تەلار، سەرا، قەسر، قەسرێن شاهینییێ.

**سپری(Sêperî):** دویاهیک هاتی، تمام بووی.

**سپریدن(Sêperîden):** دویاهیک ئینان، تمام کرن ـ بن پێ کرن.

**سـپـریغ(Seprîx- Superîx):** ئویشییێ تری.

**سپزک(Sêpezk):** ئاخفتن ڤەگوهێز.

**سپس(Sêpes):** پاشی، لدویڤرا.

**سپست(Supust):** ب بێهن، بێهن پیس، گەنی.

**سپل(Sepel):** سمێ حێشترێ ـ سم یان نینوکا فیلی.

**سـپلشت(Sêpeleşt):** رویدانەکـا نەخوەش.

**سـپنتـامـینو(Sêpentamînû):** هێـزا زێدەکرنا باشیێ و عـاقلی، دژی (انگرەمینو) کو هێزا ژ بنبرن و خرابیێ یە.

**سپندآسا(Sêpendasa):** چست و چەلەنگ، سرت و بلەز.

**سپوختن(Sêpuxten):** ب تەعدایی تشـتـەک د تشـتـەکی را کـرن ـ هاژۆتن، دویرکرن.

**سپوس(Supûs):** سڤی ئار.

**سـپـوسـه(Supûse):** سـڤی ئار ـ کەڤشکێ سەری.

**سپهر(Sêpêhr):** ئەسمان.

**سـپهـرار(Sêpêhrar):** ئەسـمـانێ نەهێ، ئەسـمـانێ د سـەر هەمی ئەسمانان را.

**سپی(Sepî):** سپی، رەنگێ سپی.

**سپیتمه(Sêpîtme):** وەکی سپی، برەنگێ سپی ـ نازناڤێ زەردەشت پێغەمبەری یە.

**سـپـیچ(Sepîç):** جلکێ رەش ـ دەرسوکا رەش ـ بەرکا رەش.

**سـپـیـد(Sepîd- Sêpîd):** سپی، رەنگێ سپی.

**سپیده(Sepîdê):** سپیلکا هێکێ ـ سـپـیـاتی ـ رۆناهی ـ سـپـێـدە، ئەلند، سحار.

**سپیرک(Sepîrek):** سیسرک.

**سـتـا(Sêta):** پەسن(مـدح) ـ کـورتکریا پەیڤـا (سـه تار) کـو ئامـیـرەکێ مـوزیکێ یە ـ ناڤێ ئاوازەکـا مـوزیکێ یە ـ کـورتکریا

پەیڤا (سە تا)یە، کو ئانکویا (سێ طا) یان ژی(سێ لا) ددەت - جۆرەکێ خیڤەتانە - کورتکریا پەیڤا (سەتا)یە، ئانکو (سێ دانە).

**ستا(Seta- Suta):** کورتکریا پەیڤا (اوستا)یە، کو پەرتوکا پیرۆزا زەردەشت پێغەمبەری یە(ئاڤێستا).

**ستاخ(Sêtax):** چەقێ دارێ.

**ستاد(Sêtad):** راوەستا، ژ پێڤە راوەستا.

**ستادن(Sêtaden):** راوەستیان، ژپێڤە راوەستیان - وەرگرتن، ستاندن.

**ستارە(Sêtarê):** ستێر - سەتار: ئامیرەکێ موزیکێ یە، کو بتنێ سێ ژەهـ تێدا بکار چووینە، و هەر ژ ڤی جۆری هەنە کو چوار ژەهـ تێدا بکار برینە و ئەو ژەها چوارێ ژی، موزیکڤان (مشتاق علی شاهـ) تێدا بکار برینە. بۆ زانین ئەڤا ب چوار ژەها ژی بیت هەر دبێژنێ (سەتار) لێ بۆ ژەها چوارێ بتنێ دبێژنێ (سیم مشتاق).

**ستازن(Sêtazen):** کەسێ کو ئامیرێ (سەتار)ێ دژەنت.

**ستاغ(Sêtax):** جانیک، جانیکێ کو هێشتا زین ل پشتێ نەکرین - ستەور.

**ستاک(Sêtak):** کاتێن دارێ، چەقێن کو ژ نوی ل دارێ دەردکەڤن.

**ستام(Sêtam):** لغاڤ، سەرهەڤسار.

**ستان(Sêtan):** پاشگرێ جهی یە کو ئانکویا گەلەکی و بەرفرەهی یا جهی دگەهینیت، وەکی: (تاکستان: ئەردەکێ بەرفرەهـ کو دارمێو لێ هاتبنە چاندن، رەز - کردستان: جهەکێ بەرفرەهـ کو مللەتەک بناڤێ کورد لسەر د ئاکنجی نە). هەگەر ئەڤ پاشگرە لگەل ناڤەکی هات کو دویاهیکا وی ناڤی (ساکن) بیت، وەکی(Kurd)، هینگی دێ (ê)یا (Sêtan)ێ ژێڤەبیت و دێ مینیتە بدویاهیا وێ پەیڤێ ڤە یا کو بۆ بوویە پاشگر، و دێ بیتە(Kurdêstan). لێ هەگەر ئەو ناڤ ب تیپا (واو) ب دویاهیک بێت، وەکی (بو Bû)،

هینگی (ê)یا (Sêtan)یَ نامینیت و دیَ بیته(Bûstan). هەروەسا هەگەر ناڤ ب پیتا(ە ê) ب دویماهی بێت، هینگی (ê)یا (Sêtan)یَ دیَ مینیت، وەکی (لالەستان: Lalêsêtan)، هەرچەندە هندەک هۆزانڤانان ژ بۆ کو برگێن هۆزانا وان تێک نەچیت، بۆ نموونە ڤیَ پەیڤا داویێ(Lalêstan) دخوینن - کەسێ کو لسەر پشتێ خوە درێژ کربیت، رازای - کورتکریا پەیڤا (آستان)ە، ئانکو: دەرازینک.

**ستاندن(Sêtanden):** ژێ ستاندن، ژێ وەرگرتن.

**ستانە(Setane):** دەرازینک.

**ستاوە(Sêtave):** فێل، حیلە.

**ستایش(Sêtayêş):** پەسنا قەنجیێن کەسەکی کرن.

**ستاییدن(Sêtayîden):** پەسندان، مەدح کرن.

**ستبر(Sêtebr):** مەزن، قەلەو، بخوەڤە - رەق و قاییم - ستویر.

**ستردن(Suturden- Sêturden):** تراشین - سەلخاندن - پاک کرن.

**سترگ(Suturg- Sêturg):** مەزن، ب کەلەخ - ب هێز، ب زاخ.

**سترون(Seterven):** وەکی هێستریَ - هەر تشتێ کو وەکی هێستریَ نەزێت - خرش(عقیم).

**سترە(Suture):** دەفکیَ سەر و ریهـ تراشینیَ، گویزان.

**ستل(Setel):** قوتان، حوتک - ئازاردان، ئێشاندن.

**ستم(Sêtem):** ستەم، زولم.

**ستم دیدە(Sêtem dîdê):** ستەم لێکری، زولم لێ بووی.

**ستنبە(Sêtenbe):** مەزن، ب کەلەخ - ب هێز، ب زاخ - کرێت، کەسیَ کو کەلەخەکیَ کرێت لێ بیت - دێو.

**ستنج(Sêtenc):** ڤ پاش ئێخستن، هەلگرتنا قویتی، مالی یان هەر تشتەکی کو مرۆڤ د ژیانیَ دا پێدڤی دبیتیَ بۆ رۆژا تەنگاڤییَ.

**ستوان(Sutvan):** قایم، نەلڤ - د زاراویَ لەشکەری دا پلەکا ئەفسەریێ یە کو د کەڤن دا دگۆتنیَ (نایب).

**ستودان(Sutûdan):** گۆرستان،

گۆڕستانێن زەردەشتیا.

**ستودن( Sutûden- Sêtûden):** پەسندان ـ سالوخ دان.

**ستور( Sutûr):** دەوار.

**ستون( Sutûn):** ستوین ـ د زاراوێ لەشکەری دا دەستەیەکا سەربازا کو ل پشت ئێک و ل سەر هێلەکی بێن و بچن.

**ستون پنجم( Sêtûnê pencum):** تابۆرێ پێنجێ(د زاراوێ سیاسی دا لکارە).

**ستوه( Sutûh):** وەستیای ـ مەلویل و پەریشان.

**ستوهانیدن( Sutûhanîden):** وەستاندن ـ پەریشان کرن.

**ستوهیدن( Sutûhîden):** وەستیان ـ پەریشان بوون.

**ستهم( Sêtehm):** رەق، دژوار.

**ستی( Setî):** پیلا ـ ئاسن ـ سەرێ رمێ.

**ستیز( Sêtîz):** شەڕ، جەنگ ـ دوژمنی، نەیاری.

**ستیغ( Sêtîx):** راست و بلند ـ راست راوەستیای وەکی ستوینێ ـ هەروەسا بۆ (بلندی یا چیای، سەرێ چیای، کێلیا چیای) ژێ لکارە.

**ستیم( Sêtîm):** عەداف، کێم.

**ستیهیدن( Sêtîhîden):** بێ ئەمری کرن، بێ فەرمانی کرن، سەرپێچی کرن، لادان.

**سج( Sec):** روی، دێم.

**سجام( Secam):** سڕ و سەقەم، سەرما دژوار.

**سخ( Sux):** باش، قەنج ـ خوەش ـ پیروز.

**سخ( Sex):** کێم و عەداف ـ قرێژ و قیڤار.

**سخت( Sext):** دژوار، ب زەحمەت، بەروڤاژی پەیڤا «ب ساناهی» ـ رەق، بەروڤاژی پەیڤا «نەرم» ـ قاییم و بنەجە ـ قەلس و چریک، بەخیل و خەسیس.

**سختانه( Sextane):** ئاخفتنا رەق.

**سخت دل( Sext dêl):** دل رەق، بێ رەحم.

**سخت رو( Sext rû):** بێ شەرم، روی قاییم، بێ حەیا.

**سختن( Sexten):** کێشان، پیڤان، (وزن)کرن.

**سخن( Suxen- Suxun):** ئاخفتن ـ گوتار.

**سخن آرا(Suxen ara):** کەسێ کو جوان دئاخڤیت، کەسێ کو جوان دئاخڤیت.

**سخن چین(Suxen çîn):** ئاخفتن ڤەگوهێز.

**سد(Sed):** سەد، هژمارا سەد.

**سدره(Sêdre):** جلکێن بێ هچک و ب یاخێن فرەهـ و ب رەنگێ سپی کو هەر زەردەشتیەک ژ کچ و کورا کو بگەهتە ژیێ دەهـ سالیێ، د رێ ورەسمێن ئۆلی ییێن تایبەت دا دکەتە بەر خوە، و لسەر وان پێدڤی یە کو بەردەوام د هەر رێ و رەسمەکێ دا ڤان جلکێن تایبەت بکەنە بەرخوە.

**سده(Sede-ê):** سەدە، چەرخ، سەدسال(قرن) ـ هەروەسا بۆ خولێن سەد رۆژی ژی لکارە ـ ناڤێ جێژنەکێ یە کو ئیرانیێن کەڤن ل رۆژا دەهی بەهمەنێ(دویەمین هەیڤا زڤستانێ) ئەڤ جەژنە دگێران و هەر ل شەڤا دەهی بەهمەنێ ژی ئاگر هلدکرن و ل دورماندوری وی ئاگری کەیف و شادی دکرن. دبێژن ژ بەرکو هەر ژ ڤێ رۆژێ تا رۆژا نەڤروزێ پێنجی شەڤ و پێنجی روژن کو کۆما وان دبیتە سەد، لەورا ناڤێ (سدە) لسەر ڤێ جەژنێ دانایە. و هندەکێن دی دبێژن زڤستانا کەڤن پێنج هەیڤ بوون، ئانکو ژ (١)ی ئابانێ(کو نۆکە هەیڤا دووێ یە ژ پاییزێ) تا دویاهیکا ئسفەندێ، و دەمێ سەد رۆژ ژ ڤێ زڤستانا پێنج هەیڤی دبۆرن، دەم دبیتە دەهی بەهمەنێ، رەنگە ئەڤ بۆچوونا داویێ بەرئاقلتر بیت.

**سر(Ser):** سەر(کو ئەو ژی ئێک ژ ئەندامێن لەشێ مرۆڤ و گیانەوەرایە) ـ سەر یان دەستپێکا هەر تشتەکی ـ سەر یان بلندی یا هەر تشتەکی، وەکی سەرێ چیای، سەرێ تبلا، سەرێ شویژنێ ـ هەروەسا بۆ کەسێ مەزن یان سەروکا ژی لکارە.

**سر(Sur):** سۆل، جۆرەکێ پێلاڤایە کو رەخێ ژ سەرڤە ب بەنکا دهێتە چێکرن ـ مەیا کو ژ برنجی دهێتە چێکرن.

**سرا(Sera):** خانی، خانیێ مەزن ـ ژۆر، ئودە ـ جـﻫ، در.

**سـراب(Serab):** زەڤى يان بيستانێن كو نێزيكى جۆ و دەراڤا بن ـ لەيلان، سەراب.

**سراپرده(Seraperdê):** بارەگا ـ خيڤەتا مەزن ـ پەردا مەزن كو لشوينا ديوارى لدورماندورى خيڤەتێ دادنن.

**سرآخر(Seraxur):** هەسپێ كو د گۆڤێ ڤە ژ ناڤ هەمى هەسپا چێتر بيت.

**سرازير(Serazîr):** سەرنشيڤى ـ سەرنوخين.

**سراسر(Seraser):** ژ ڤى سەرى هەتا وى سەرى، سەرانسەر، هەمى.

**سراسيمه(Serasîmê):** سەرگەردان، پەريشان، شەپرزە.

**سراغ(Surax):** نيشان، هێما ـ دەوس، شوين دەوس ـ پرسيار ژ جهێ تشتەكى يان كەسەكى (لێگەريان ژ بۆ ڤەديتنا جهێ تشت يان كەسێ بەرزە يان نە ل پێش چاڤ).

**سرآغاز(Seraxaz):** پێشگۆتن، سەرگوتار.

**سرافراز(Serefraz):** سەرفيراز، سەربلند.

**سرافسار(Serefsar):** دەست هەفسار.

**سرافشان(Serefşan):** سەرهەژينك ـ سەرخوەش، مەست ـ دفنبلند (مغرور و متكبر).

**سرافكنده(Serefkendê):** سەرشۆر، هەتك لێ چووى، شەرم بسەردا هاتى.

**سراگوش(Seragûş):** دەرسۆك، كەڤينك.

**سرامد(Seramed):** بژارتى، بژارە، يێ بلندتر و باشتر ژ خەلكەكێ دى.

**سرانجام(Serencam):** ئەنجام، دويماهيك.

**سرانداز(Serendaz):** دەرسوك، كەڤينك ـ بێ پەروا، نە ترس، دلێر.

**سراندن(Suranden):** خشاندنا تشتى لسەر ئەردى و بەرەڤ پێشڤە برنا وى تشتى.

**سراييدن(Surayîden):** سروود خواندن، ئاواز خواندن، هوزان خواندن.

**سرب(Surb):** رساس.

**سربار(Serbar)**: ئاليەكێ بارى يان ژى سەربارک کو دادننە سەر بارێ گيانەوەرا ـ ديسان بۆ مرۆڤا ژى لکارە کو ببيتە سەربار يان جهێ زەحمەتێ بۆ کەسەکێ دى.

**سرباز(Serbaz)**: دەرڤەکرى ـ لەشکەر، عەسکەر.

**سربيلە(Serbîle)**: سەرکێ تيرێ هەگەر پەحن بيت ـ تيرا دو چق.

**سربينە(Serbînê)**: ژۆرەکا حەمامێ يە کو جلکێن خوە تێڤە دئێخن بەرى بچن د ژۆرا سەرشويشتنێ ڤە.

**سرپا(Serpa)**: سەرپێ، کەسەک يان تشتەک کو لسەر پيێ خوە راوەستياى بيت.

**سرپاس(Serpas)**: فەرماندێ زێرەڤانا، سەرۆکێ دەستەکەکا زێرەڤانا ـ پلەکا لەشکەرى بوو ل سەردەمێ رضاشاهێ کبير کو نوکە لشوينا ڤى زاراوى پەيڤا «سرتيپ» لکارە ـ کومزرى، کولاڤێ ئاسنى کو د شەران دا دکرنە سەرێ خوە.

**سرپايان(Serpayan)**: شاشک يان دەرسوکەکا نەرم کو شەرڤانێن بەرێ لبن کومزرى ڤە دکرنە سەرێ خوە.

**سرپايى(Serpayî)**: کارێ کو ژ پێڤە بهێتە ئەنجامدان يان ژى کەسێ کو بەردەوام ب کارەکى رادبيت و بۆ دەليڤە نينە روينيت ـ کريارا گوهنێلى کو ژ پێڤە بهێتە ئەنجامدان ـ ژنکا دەهمەن پيس، قەحبە ـ نەعال.

**سرپيچ(Serpîç)**: شاشک، جەمەدانى.

**سرپيچى(Serpîçî)**: بێ ئەمرى، سەرپێچى.

**سرتاپا(Sertapa)**: هەمى، هەموو.

**سرچشمە(Serçêşmê)**: سەروکانى، چاڤکانى.

**سرچکاد(Serçekad)**: پێشيا سەرى(هنداڤا ئەنيێ).

**سرخ(Surx)**: قورمز، سۆر، رەنگ سۆر.

**سرخارە(Serxarê)**: شە و فرکێت و سنجاقکێن سەرى کو ژنک بکار دئينن.

**سرخوردن(Surxurden)**: حولسين، تەحسين.

**سرخوش(Serxoş)**: شاد،

خوەشحال.

**سرد(Serd):** سار، هێن، فێنک، تەزی.

**سرداب(Serdab):** سەرداڤ(هندەک دبێژنێ بنداڤ ژی).

**سردادن(Serdaden):** ئازاکرن، رەهاکرن ـ جان فیداکرن، سەر د رێکا تشتەکی دا ژ دەست دان.

**سردادن(Surdaden):** لڤاندن، لڤاندن و بەرەڤ پێشڤەبرنا تشتەکی لسەر جهەکێ راست، خوشاندن ـ حولساندن، تەحساندن.

**سردار(Serdar):** فەرماندێ سوپای ـ سەرۆک یان مەزنێ دەستەیەکێ یان عەشیرەکێ.

**سرداری(Serdarî):** جۆرەکێ جل و بەرگێ زەلاما کو درێژ و ب کوریشک بوو و د کەڤن دا دکرنە بەرخوە.

**سردبیر(Serdebîr):** سەرنڤیسەر، سەرنڤیسکارێ کۆڤار یان رۆژنامێ.

**سردر(Serder):** سەرەدەر.

**سردرختی(Serdêrextî):** هەر فێقیەکێ کو ب دارێ ڤە بهێت، وەکی: (سێڤ، هرمیک، خوخ، حولیک و......هتد).

**سردستە(Serdestê):** سەرکردە، مەزنێ کومەلەکێ، سەرپەرشت یان مەزنێ کومەلەکێ ژ مرۆڤا.

**سردسیر(Serdsîr):** کویستان، جهێن سار.

**سردم(Serdem):** قەهوەخانە ـ خانەقا، جهێ کو دەروێش و قەلەندەر لێک خرڤە دبن.

**سردواندن(Serdevanden):** کەسەک مەحتل و سەرگەردان کرن(دەمێ کو وەعدێن ئەڤرو و سوباهی ددەتێ).

**سردوشی(Serdûşî):** سەرملک(سەرملکێ جلکێن لەشکەری کو پلێن لەشکەری لسەر دادنن).

**سرراهی(Ser rahî):** پارێ کو رێڤینگ لدەمێ برێکەفتنێ وەک سەدەقە یان خێر ددەتە خەلکی دا کو خێر د رێکا وی دا هەبیت ـ نویزادە یان زارۆکێ کو ژ نوی بووی و دادننە سەر رێکا دا کەسەک بهێت و ببەت و بخودان کەت.

**سرز(Serez):** مالنجا بەنناییێ.

**سرزدای(Serzêday):** دڕکەیە ژ خەنجەرا خوەش و بڕەک.

**سرزدن(Serzeden):** شین بوونا گیای(ئانکو سەرێ خوە ژ بن ئاخێ دەرێدخیت) ـ ڕۆژ هەلاتن ـ سەرەدان.

**سرزده(Serzedê):** ژ نشکەکی ڤە.

**سرزمین(Serzemîn):** وەلات، پارچەیەکا پان و بەرین کو ملەتەک یان عەشیرەک لسەر بژیت. هەروەسا پەیڤێن (مرز و بوم ـ کشور) ژی لکارن.

**سرزنش(Serzenêş):** تەعن تێ قوتان، گازندە ژێکرن، نسحەتکرن.

**سرسبز(Sersebz):** تەڕ و تۆل ـ گەنج، کامەران، خوەشبەخت.

**سرسره(Sursurê):** حولیسانک، تەحیسانک.

**سرشار(Serşar):** لێڤولێڤ، پڕ، مشت، تژی.

**سرشت(Sêrêşt):** سروشت، تبعەت.

**سرشتن(Sêrêşten):** هەڤیرکرن ـ تێکەلکرن ـ تێڤەدان، دناڤ هلاندن ـ ئافراندن.

**سرشک(Sêrêşk):** رۆندک، هێستر ـ هەروەسا ناڤێ دارەکێ یە ژی کو پتر بۆ وێ دارێ ناڤێ (زرشک) لکارە.

**سرشکوان(Sêrêşkvan):** پەری(پەریا بویکێ)، پەلهە.

**سرشناس(Serşênas):** بەرنیاس، سەرنیاس.

**سرشیر(Serşîr):** قەیماغ ـ سەرتیک.

**سرغچ(Serxêç):** کۆد، ترارکێ کو ژ داری هاتبیتە چێکرن.

**سرغین(Serxîn):** زڕنا(ئامیرەکێ موزیکێ یە).

**سرفراز(Serferaz):** سەرفەراز، سەربلند.

**سرفه(Surfê):** کوخک.

**سرفه خروسک(Surfê xurûsek):** خەندخەندوک، خەندقوک(کوخکا وەکی یا دیکلی).

**سرک(Serek):** کورتکریا پەیڤا(سر)، ئانکو: سەرک، سەرێ بچویک ـ پتری یا تشتەکی لدەمێ بەراوردکرنێ دگەل تشتەکێ دی(ئەڤ پتری یە چێدبیت ژ لایێ کێشێ ڤە بیت و چێدبیت ژی ژ لایێ بهای ڤە بیت) ـ سەربار، سەربارک.

**سرکش(Serkeş)**: کەسێ کو بێ ئەمرێ دکەت ـ ب شیان، ب زاخ، ب هێز ـ سەرفەراز ـ هەروەسا ناڤێ ناڤدارەکی بوو لسەردەمێ خسرو پەرویزی.

**سرکوب(Serkûb)**: جهەکێ بلند وەکی بورجێ، کەلهێ، دویرگەهێ، یان گرەکی یان چیایەکی کو شەرڤان بشێن لڤی جهی لسەر دوژمنی زاڵ ببن و دوژمنی بشکێنن.. هەر ژ ڤێ پەیڤێ یە (سرکوب کردن: شکاندن«مەبەست ژێ شکاندنا لەشکەری یە» )ـ تەعن تێ قوتان.

**سرکە(Sêrkê)**: سیهک.

**سرگران(Sergeran)**: قەهری، دل نەخوش ـ سەرخوەش، مەست ـ دفنبلند(مغرور).

**سرگرد(Sergurd)**: پلەیەکا لەشکەری یە کو ددەنە ئەفسەران و د کەڤن دا دگوتنێ «یاور».

**سرگردا(Sergerda)**: گێژی، سەرگێژی.

**سرگردان(Sergerdan)**: سەرگەردان، حەیران ـ ئاوارە، دەربەدەر، بێ مال و حال ـ بەرزەبووی.

**سرگرم(Sergerm)**: مژویل.

**سرگزیت(Sergezît)**: باج و خەراج ـ (جزیە).

**سرگزین(Serguzîn)**: پەز و چێل و هەسپێن کو د کەڤن دا بۆ پاشای یان حاکمی ڤەدەردکرن.

**سرگین(Sêrgîn)**: کوشپل(پشکل)ێن دەوارا، سەرگین.

**سرم(Serm)**: کەنگر.

**سرما(Serma)**: سەرما، سڕ و سەقەم.

**سرمایە(Sermayê)**: سامان.

**سرمست(Sermest)**: سەرخوەش ـ کەیف خوەش ـ دفنبلند(مغرور).

**سرمە(Surme-ê)**: کل(کلێ چاڤا).

**سرمەدان(Surmêdan)**: کلدانک.

**سرمەکش(Surmêkêş)**: کل چیڤک ـ هەر کەسێ کو کلی ل چاڤێن خوە بدەت.

**سرنا(Surna)**: زڕنا(ئالاڤەکێ موزیکێ یە).

**سرناچی(Surnaçî)**: زڕنابێژ.

**سرند(Serend)**: جۆرەکێ بێژینکێ یە.

**سرنشین(Sernêşîn)**: نەفەرێن کو ب رێڤنگی ل تەیارێ یان ترومبێلێ سویار دبن ـ د کەڤن دا بۆ وی رێڤنگی دهاتە گۆتن یێ کو د ناڤ کاروانی دا ل هێستری یان هەسپی سویار دبوو.

**سرنگون(Sernêgûn)**: سەرنوخین.

**سرنوشت(Sernêvêşt)**: تشتێ کو د ئەزەل دا بۆ مرۆڤی هاتیە دەستنیشانکرن، قەدەر ـ شەنس، بەخت.

**سرنیزە(Sernêyzê)**: قەمە.

**سرو(Serv)**: دارا سەروێ.

**سرو(Surû)**: شاخێن پەز و چێل و گیانەوەرێن مینا وان.

**سروا(Serva)**: ئاخفتن ـ چیڤانوک ـ هوزان.

**سرواد(Servad)**: سروود ـ هوزان.

**سروادە(Servadê)**: هوزان ـ سەروا(قافیە).

**سروان(Servan)**: پێشەوا، سەرۆک، سەروەر ـ پلەیەکا لەشکەری یە.

**سرود(Surûd)**: سروود.

**سرودن(Surûden)**: ستران گوتن ـ هوزان خواندن.

**سرور(Server)**: سەروەر، سەرۆک، پێشەوا، سەرپەرشت، مەزنێ بنەمالێ یان عەشیرێ.

**سروستاە(Serv sêtah)**: ناڤێ ئاوازەکا موزیکا کەڤنا ئیرانی یە.

**سروسهی(Servê sehî)**: دارا سەروێ کو چقێن وێ د راست بن ـ درکەیە ژ یارا بەژن و بال دەلال ـ ناڤێ ئاوازەکێ یە ژ هەر سیە ئاوازێن «باربد»ی.

**سروش(Surûş)**: فریشتە ـ جبرائیل ـ د ئایینێ زەردەشتی دا ئەو فریشتەیە یێ کو فەرمانێن ئاهورامەزدای جێ بەجێ دکەت و رێکێن جێ بەجێ کرنا ڤان فەرمانا نیشا بەنی یا ددەت.

**سرە(Sereh)**: بێ غش، خوری ـ هلبژارتی ـ پاک ـ باش، قەنج ـ بێ عێب.

**سرهال(Serhal)**: سەرگەردان، حەیران، پەریشان.

**سریدن(Surîden)**: خوشکین ـ حولسین، تەحسین.

**سرین(Surîn)**: رەهن، ران.

**سرین(Serîn)**: بۆ رەخێ سلال ـ ل هنداڤ سەری ـ جهێ سەری ل

ناڤ نڤینکا، بالیفک.

**سـزا(Sêza-Seza)**: پاداش، جزا(حەقێ قەنجییێ یان خرابییێ).

**سـزاوار(Sêzavar)**: ژ هەژی، بسەرڤە(لایق).

**سـزیدن(Sezîden)**: ژ هەژی بوون، بسەرڤەبوون.

**سـست(Sust)**: سـست، لاواز، بێ هێز، نەرم.

**سغ(Sex)**: بان، بـانێ خـانـی ـ گـونبـەد، قـوببـە ـ پەحنکا دەڤی ـ شاخێن گیانەوەرا.

**سغانه(Sexane)**: سەرداڤ.

**سغبه(Suxbe)**: کەسێ کو ترانە پێ هاتبنەکرن یان د یارییێ دا فـێل لێ هاتبنەکرن.

**سغر(Suxur)**: سیخور.

**سـفـارش(Sêfarêş)**: دەسـتـوور، فەرمان.

**سـفـارشی(Sêfarêşî)**: هەر تشـتێ کو ب دەسـتوور یان ب داخـوازیڤە بۆ مرۆڤی ئامادە ببیت.

**سفال(Sufal)**: ئامانێن مینا جێرک و ترارکا کـو ژ ئاخ سورکا تایبـەت ب ڤـان رەنگە ئامـانان ڤـە هاتبنە چێکرن ـ قـەلپـیـشکێ فـسـتـەق و بندەق و باهیڤ و گـویز و تشـتێن مینا وان.

**سـفـالگر(Sufalger)**: جـێـرک چێکەر.

**سفاهن(Sefahen)**: شە(شەیێ کو پرچێ پێ شە دکەن).

**سفت(Sêft)**: رەق ـ ستوير ـ موکوم ـ تیر.

**سفت(Suft)**: مل، شان ـ کون(وەکی کونا دەرزیکێ).

**سفتن(Suften)**: کون کرن، سمتن.

**سفته(Suftê)**: کون کری، سمتی.

**سفـته(Sufte)**: تیر، سـەرێ تیرێ، سـەرێ قـەمـەی، هەر تشـتێ کـو سـەرێ وی هاتبـیـتـە تیـژکـرن ـ خەلات، هەدیە.

**سفید(Sêfîd)**: سپی، رەنگێ سپی.

**سفیدار(Sêfîdar)**: سپیندار.

**سفیده(Sêfîde)**: سپـیـک، سپیلکا هێکێ ـ سپێدە، سحار.

**سک(Suk)**: لڤلڤین ـ سیـخـەکا سەر تیژە کو دەوارا پێ دهاژۆن.

**سـکـار(Sêkar- Sukar)**: رەژی، رەژی یا ئاگر پێـڤـە، پەل ـ ئاگـر ـ نانێ دوهندای.

**سکارو(Sukarû)**: نان یان گـوشـتێ

کو لهنداڤ ئاگری بهێته براژتن.

**سکره(Sukre):** ترارک ـ پەیاله.

**سکستن(Sukêsten):** ڤەقەتیان، ژێک جودابوون، ژێکڤەبوون.

**سکنج(Sukunc):** کەسێ کو بێهنا پیس ژ دەڤێ وی بهێت.

**سکنج(Sêkunc):** کوخک ـ سەلخین، کەلداچوون.

**سکندری(Sêkenderî):** هلنگفتن.

**سکیزه(Sêkîze):** پێهن، جۆتک، زیچک، لیتک ـ پێکولا ژ جه رابوونا دەوارا.

**سکیزیدن(Sêkîzîden):** پێهن دانان، لیتک هاڤێتن ـ ژ جه رابوونا دەوارا.

**سگ(Seg):** سه.

**سگال(Sêgal):** ئەندێشه، هزر.

**سگاله(Segale):** پیساتیا سەی.

**سگالیدن(Sêgalîden):** هزرکرن ـ بۆچوون.

**سگ توله(Seg tûlê):** کویچکێ سەی، تێشکێ سەی.

**سگرمه(Sêgêrme):** ئەنی گرێ، برە تێکچووی ـ خیچ و کوریشکێن ل سەر ئەنیێ.

**سگزن(Segzen):** جۆرەکێ تیرایه کو سەرێ وی زراڤ و تیژه.

**سگلاس(Seglas):** دێهل.

**سلک(Selk- Sêlk):** بوتکا سرکێ(جهێ کو ئاڤا بارانا ژ سەربانا پێدا دهێته خوار).

**سلم(Sêlem):** تەختەرەش (سابوره).

**سلمانی(Selmanî):** حەللاقی، سەرتراشخانه.

**سلمک(Selmek):** ئێک ژ ئاوازێن کەڤنێن ئیرانی یه.

**سلنج(Sêlunc):** لێڤ کەم(کەسێ کو لێڤەکا وی نیشانێن دو چەقییێ لێ د دیار بن).

**سم(Sum):** سمێن دەوارا ـ کۆتانێن پەزی.

**سماروغ(Semarûx):** کڤارکێن کو ب کێر خوارنێ بهێن.

**سماری(Sumarî):** بەلەم، قایک.

**سماکار(Semakar):** مەیگێر، ساقییێ مەیخانێ.

**سمانه(Semane):** بانێ خانی(سقف).

**سمج(Sumc):** سەرداڤ ـ رێکێن بن ئەرد ـ زیندانێن بن ئەرد ـ کۆتانا پەزی کو ل بن ئەردی

هاتبیـتـه چێکرن یان ل نـاڤ چیای هاتبیته سمتن.

**سنار(Sênar- Senar):** ئەو جـه ژ دەریایێ کـو بنێ باخـیـرێ ژ ئەردی بگریت و باخـیـره نەکـاریت ل وێ دەڤـەرێ بهـێـت و بچـیت ـ کـنارێ دەریایێ، بەندەر(مینا ء).

**سنباده(Seunbadê):** زمپاره.

**سنبـــاندن(Sunbanden):** کـــون کرن، سمتن.

**سنبک(Sunbek):** قایکا بچویک.

**سنبوسـه(Senbûse):** هەر تشـتێ سێ کوژی.

**سنبـیـدن(Sunbîden):** کـون کـرن، سمتن.

**سنتور(Sentûr):** ئالاڤەکێ موزیکی یه کـــو بۆ شکلێ خـــوه نێــزیکی ئامـیـرێ قـانوونێ یه و (٧٢)ژەه تێــدا بکار هاتینه و ب دو دارکـا دهێته ژەنین.

**سنج(Senc):** ئالاڤـەکێ مـوزیکێ یه کـو ژ دو قـەپاخـان پێکهـاتیـه کـو لدەمێ لێکدانا ڤـان قـەپاخا دەنگ ژێ دهێت(ئەڤ ئامیـره پتـر د ناڤ مـەسـیـــرێن لەشکەری دا دهاتنه بکارئینان).

**سنجاب(Sencab):** سقوره.

**سنجـــد(Sênced):** سنج(دارەکـــا کـورت و ب سـتـربه، بەلگێن وێ مـینـا یێن بیێ نه، گـولێن وێ ب ئوبشینه و د سپی و بێهن خوەشن، بەرێ وێ بچویکه و قەلپیشکەکێ تەنکێ سور یێ بسەرڤه و ئارکەکێ شـرین و بەرکـەک درێژ و رەق یێ د ناڤ ڤی قەلپیشکی دا).

**سنجـیـدن(Sencîden):** پیـڤـان و کێشان ـ بەراوردکرن.

**سنگ(Seng):** بەر، کـەڤر ـ قـەدر، بها، سەنگ.

**سنگچین(Sengçîn):** شـــویرهه، دیوارێ بەرا.

**ســـنـــگـــدولـــه(Sengdûle):** بابەلیسک.

**سنگر(Senger):** چەپەر، سەنگەر.

**سنگریزه(Sengrîzê):** خشـبـەرک، بەرکێن هویر.

**سنگله(Sengule):** نانێ کـــو ژ گارسی هاتبیته چێکرن.

**سنگین(Sengîn):** هەر تشـتێ کـو ژ بەری هاتبیـتـه چێکرن ـ گران، ب سەنگ، ب وەزن(بەروڤـاژی پەیڤا «سڤک»).

**سنه(Sene):** نفرین، دوعاییّن خراب ـ لەعنەت.

**سـو(Sû):** رەخ، کنار، ئال، نک ـ رۆناکی ـ سوود، مفا، قازانج.

**سـوار(Sevar):** سـویار(بەروڤـاژی پەیڤا «پەیا»).

**سوت(Sût):** فیتی، فیتک.

**سـوتام(Sûtam):** کـیم، پچـەک، هندک ـ بچـویک، کـچـوچ ـ ب کیّماسی، عیّبەلو.

**سوتک(Sûtek):** فیتفیتوک، فیڕک (ئالاڤـەکە کو خودان پیّ فیـتیـا ڤەددەت).

**سوت و کور(Sûto kûr):** جهیّ بیّ رەوش، جهیّ بیّ دەنگ، جهیّ بیّ گیّول.

**سوختن(Sûxten):** سۆتن، ئاگر تیّ بەربوون.

**سوختە(Sûxtê):** سۆتی، ئاگر تیّ بەربووی.

**سود(Sûd):** سوود، مفا، قازانج.

**سـودا(Soda):** کـڕین و فروتن(معاملة).

**سوداگر(Sodager):** بازرگان.

**سودن(Sûden):** کون کرن، سمتن ـ رەنین ـ قـوتان، هەڕشـاندن ـ پەرخـاندن ـ ئیّک ژ هەسـتـیّن پیّنجینەییّن مـرۆڤی یە کـو مـرۆڤ ب ڤیّ هەستیّ، هەست ب گـەرمی و سـاری و نەرمی و زڤـری پیّ دکەت و ئالاڤیّ وی پویستیّ لەشی یە. بۆ ڤیّ ئانکوویّ د زمـانیّ فارسی دا زاراویّ (بساوایی) پتر بکار دهیّت.

**سـور(Sûr):** مـیّـهـڤـانی ـ جـەژن ـ داوەت و شـەهیـان ـ دەواریّ کـو خیچەکا رەش ژ پشتا ستویّ وی دەست پیّ بکەت و حەتا دویماهیکا کوریا وی یا بەردەوام بیت کو ئەڤ رەنگە دەوارە بۆ بیّ ئیـفلەحـییّ د ناڤدارن ـ هەر گیانەوەر یان مرۆڤیّ کو خوە ژ کۆمەلیّن وەکی خوە ڤەدەر بکەت ـ رەنگیّ سۆر یانژی رەنگیّ وەکی ییّ خـوەلییّ ـ دارەکا هەردەم کـەسکە کـو داریّ ویّ د چیّکرنا قەنەپا دا بکار دهیّت.

**سـوراخ(Sûrax):** کـون ـ کـەلشت، دەرز.

**سـورنا(Sorna):** زرنا(ئالاڤـەکیّ موزیکیّ یە).

**سوز(Sûz):** بەرامبەر پەیڤا (سوژ)ا کـوردی یە کـو ژ ژیّدەریّ(سـوختن:

سۆتن) هاتیه وەرگرتن.

**سوزاندن(Sûzanden)**: سوتاندن، سوژاندن، ئاگر تێ بەردان.

**سوزمانی(Sûzmanî)**: قەرەچ، ژنکا قەرەچ.

**سوزن(Sûzen)**: شویژن.

**سوسک(Sûsk)**: کێز، کێزک.

**سوسمار(Sûsmar)**: مارگیسک (ڤان مارگیسکا جۆرێن خوه هەنە، مینا مارگیسە و حولیسە و کمکمە و چەپچەپیسک و بزمێژک و حەتا دگەهتە تیمساحی).

**سوسو(Sûsû)**: رۆناهیەکا کێم کو ژ دویر ڤە مرۆڤ دبینیت.

**سوغە(Sevxe-ê)**: ئەو پارێ کو د کەڤن دا شەرڤانان ژ راتبێ خوە دکوشتن و ددانە نڤیسەر و کارمەندێن دیوانێ.

**سوف(Sûf)**: جۆرەکێ ماسی یە.

**سوفار(Sûfar)**: ترارک یان گوزک یان هەر تشتەکێ کو ژ ئاخا جێرکا هاتبیتە چێکرن ـ کونا دەرزیکێ ـ ئەو جهـ ژ تیرێ کو دکەڤیتە ژەها کڤانێ.

**سوک(Sok)**: بنێرە: (سوگ) ـ رەخ، کنار، لا، سەمت ـ نک، جەم ـ کوژی ـ داسیکێت گەنم و جەهی.

**سوگ(Sog)**: خەم ـ تازی، بەهی، شینی ـ بەلا، مسیبەت.

**سوگند(Sogend)**: سوبند.

**سوم(Sêvum)**: سێیەم ـ سێیەمین.

**سومین(Sêvumîn)**: سێیەمین.

**سون(Sûn)**: رەخ، کنار، لا، سەمت.

**سوهان(Sohan)**: کارتیک ـ جورەکێ شریناهیێ یە.

**سوین(Sevîn)**: ئامان، ترارک، گوزک، مەنجەل ـ ئامانێ کو بو سەی ئاڤێ دکەنێ.

**سە(Sê)**: هژمار سێ(٣).

**سەتار(Sêtar)**: ئالاڤەکێ موزیکێ یە کو ژ سێ تێلا پێک دهێت.

**سهر(Suhr- Sêhr)**: رەنگێ سۆر ـ چێلا سۆر ـ چێل.

**سهستن(Sehêsten)**: پەیدا بوون ـ ترسان ـ رەڤین.

**سەشنبە(Sêşenbê)**: سێ شەمبی کو رۆژا چوارێ یە ژ هەفتیێ.

**سەگان(Sêgan)**: سێ سێیە، سێ جارکی.

**سەگانە(Sêgane)**: سێ جامێن مەیێن کو سپێدەهیا ڤەدخون.

**سەگاە(Sêgah)**: ئێک ژ

دەستگەهێن موزیکا ئیرانی کو خەم هلێخە.

**سهم(Sehm)**: سەهم، ترس.

**سهمگین(Sehmgîn)**: ترسناک، ب سەهم.

**سهمیدن(Sehmîden)**: ترسیان.

**سهی(Sehî)**: راست، راست راوەستیای.

**سه یک(Sê yek)**: سێک، ئێک ژ سێیێ.

**سی(Sî)**: هژمار سیه(٣٠).

**سی ام(Sî um)**: سیهەمین، ئەو تشتێ کو بکەڤیتە پلا سیهێ.

**سیاه(Siyah)**: رەش، رەنگێ رەش.

**سیاه چادر(Siyah çadur)**: رەش مال، کوین.

**سیاهی(Siyahî)**: رەشاتی، تاریاتی.

**سیب(Sîb)**: سێڤ.

**سیب زمینی(Sîb zemînî)**: پتات، کرتوپ.

**سیب زمینی ترشی(Sîb zemînîyê turşî)**: سێڤ بن ئەرد.

**سیج(Sêyc- Seyc)**: مێویژێن رەش.

**سیچیدن(Sîçîden)**: ئامادەکرن، بەرهەڤکرن، رێکخستن، رێک و پێک کرن.

**سیخ(Sîx)**: سیخ، سیخێن کەبابا.

**سیخگاه(Sîxgah)**: جهەکە ژ لەشێ دەوارا کو دەمێ سیخێ لێ ددەن دێ ژ جه رابت و خوە هلاڤێت.

**سیخول(Sîxûl)**: سیخور.

**سیر(Sîr)**: تێر(یێ کو تێر زاد خوار بیت)- بۆ کێشانێ بکار دهێت و بەرامبەر شازدە مسقالا یان (٧٥)گرامایە - سیر(گیایەکە ژ بنەمالا پیڤازایە).

**سیرآب(Sîrab)**: تێر ئاڤ بووی، پزپزی، ربسی، تشتەک یان ئەردەک کو ژ ئاڤێ پر ببیت.

**سیران(Sîran)**: دیوار یان شویرهێن دۆرماندۆری باژێری.

**سیرت(Sîret)**: سوننەت - رێباز - مەزهەب - طبعەت و سروشت.

**سیر سور(Sîr sûr)**: ناڤێ جەژنەکا کەڤنا ئیرانی یایە کو دکەڤتە رۆژا چارێ ژ ئێکەمین مەها زڤستانێ و د ڤێ رۆژێ دا گوشت و سیر دهاتنە خوارن.

**سیرسیرک(Sîrsîrek)**: چرچرک.

**سیرمان(Sîrman)**: یاقوتا سۆر -

ئارمویشێ نەخشاندی.

**سیرنگ(Sîreng):** سیمەرخ، عنقاء(فڕندەکێ چیڤانۆکی یە).

**سیز(Sîz):** سرت، توند، حێل.

**سیزدە(Sîzdeh):** هژمارا سێزدە(١٣).

**سیزدە بدر(Sîzde bêder):** رۆژا سێزدێ یە ژ ئێکەم مەها وەرزێ بهارێ، کو د ڤێ رۆژێ دا هەمی خەلکێ ئیرانێ ژ مالێن خوە دەردکەڤن و ب ئنیەتا سەیران و خوشیێ قەستا چان و رەخێن باژێری دکەن.

**سیس(Sîs):** هەسپێ کو حێل بچیت، سرت بت و خوە فڕ دەت.

**سیغ(Sîx):** باش، قەنج ـ دەلال، جوان، کەشخە.

**سیفە(Seyfe):** ئالاڤەکێ ئاسنی یە وەکی کێرکێ کو کنارێن پەرتوکا یان کاغەزا پێ دبڕن.

**سیم(Sîm):** زیڤ ـ تێلە ـ کێم و عەداف.

**سیما(Sîma):** روی، دێم ـ بۆ دەزگەهێ رۆژنامەڤانیێ بینینێ(تێلەفزیون) ژی دهێتە بکارئینان.

**سیمرغ(Sîmurx):** بنێرە: «سیرنگ».

**سیم ساق(Sîm saq):** کەسا کو خودانا پیێن سپی و جوان بت.

**سیمەسار(Sîmêsar):** حەیران و سەرگەردان.

**سیمین(Sîmîn):** زیڤین، هەر تشتێ کو وەکی زیڤی بیت.

**سینە(Sînê):** سینگ ـ سینگ و بەر، مەمک، چچک، گوهان.

**سینەچاک(Sînêçak):** درکەیە ژ مرۆڤێ بەلادیتی و خەمدار، ئەڤینداریێ دل سۆتی.

**سینی(Sînî):** سێنیک.

**سیە(Siyeh):** کورتکریا پەیڤا (سیاە)ە، ئانکو: رەش، رەنگێ رەش.



**ش(Şîn)**: تیـــپـــا شـــازدێ یه ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی ـ جیناڤێ پێڤەگرێدایە بۆ کەسێ نە ئامادە، وەکی: (قلمش: قەلەمێ وی/وێ؛ یان کـتـابش: کـتـابا وی/وێ) و هەگەر دویماهیکا پەیڤەکێ ب تیپا (ه) ب دویـــاهـــی هـــاتـــبـــت، وەکی(جـامـــه)، دەمێ جـیـناڤێ (ش) پێڤە بهێتە گرێدان دێ تیپا (ا) وەک قاعیدە ل ناڤبەرا (ه) و (ش)یـــدا هـــێـــت دانـــان و دێ بیتە(جامەاش: جلکێ وی/وێ). هەروەسا ل دویماهیکا هندەک پەیڤا دهێت و ئانکوبێن (بۆ وی/وێ، ژێرە و......هتد) دگەهینیت.

**شاباش(Şabaş)**: شاباش(کورتکریا پەیڤـا «شـادباش»ە، ئانکو شـاد بە.).

**شاپورگان(Şapûrgan)**: پیلا.

**شـاخ(Şax)**: چەقێ دارێ ـ شـاخێ بزنێ و گـیـانەوەرێن مـینا وێ ـ باهر، پارچە، حصـە ـ پەیالا مـەی ڤـەخـوارنێ، ئەو ژی ڤـەدگـەرت بۆ سەردەمێن کەڤن کو ژ شاخێن چێل و کـەرکـەدان و عـاجـێن فـیـلا ئەڤ پەیالە دهاتنە چێکرن.

**شاخور(Şaxver)**: شاخدار.

**شـاخور(Şaxûr)**: کـوبرها مـەزن کـو تابۆکا تێتە بقەلینێ.

**شاخە(Şaxê)**: چەقێ دارێ.

**شـاد(Şad)**: شـاد، کـەیفـخـوەش، خوەشحال، بێ خەم.

**شـاداب(Şadab)**: تەڕ و طول، تەڕ و تازە.

**شـــادان(Şadan)**: دلخـــوەش، کەیفخوش.

**شـادباد(Şadbad)**: ئێک ژ ئاوازێن کەڤنێن موزیکا ئیرانی یە.

**شـــادباش(Şadbaş)**: پەیڤـــا پیروزکرنێ یە، ئانکو: شاد بە.

**شادروان(Şadrevan)**: پەیڤەکە کو بۆ کەسێ مری دهێتە گوتن و د کـــوردی دا بەرامـــبـــەر پەیڤـــا (رحمەتی)یە.

**شـــادروان مـــرواريد(Şadurvanê Murvarîd)**: نـاڤـێ ئـێـک ژ سـیـه ئاوازێن باربەدی یە، ئەڤ ئاوازە بـاربـەدی چـێـکـربـوو و بـۆ «خسرو پەرویز»ی لێ ددا.

**شـادگـونە(Şadgûnê)**: بالیـفک، پالپـــشت، پالگـەھ ـ نالیک، جودەلیک، دوشەک ـ جبە ـ کەپەن ـ ژنا ستران بێژ و یاریکەر.

**شادیچە(Şadîçê)**: جهێ نقستنێ ـ لحێف ـ کەپەن.

**شـار(Şar)**: شـار، باژێر ـ ئاڤـاهیێ بلند ـ رێکا پان، شاهرێ.

**شـــارســــتــــان(Şarêstan)**: شارستان(قضاء).

**شـاره(Şare)**: شـاشکا هندی یا ـ پەروکێ کـو ژنا هندی لدور خـوە دئالینیت.

**شاریدن(Şarîden)**: سەرابن بوون، رشتن.

**شاش(Şaş)**: میز، دەستاڤا زراف.

**شـاشک(Şaşek)**: ناڤێ ئالاڤـەکێ موزیکێ یە کو ب چوار تێلا دهێتە لێدان(رباب).

**شــــاشـــو(Şaşû)**: بچــــویکێ خوەڤەمیزک.

**شاشیدن(Şaşîden)**: میزتن.

**شـافـیـدن(Şafîden)**: کـەفتن، هلنگفتن.

**شاک(Şak)**: نێری، بزنێ نێر، بزنێ پیر.

**شاکار(Şakar)**: سـوخره، کـارێ ب تەعدایی و بێ بەرامبەر.

**شاگرد(Şagêrd)**: قـوتابیێ پولێن سـەرەتایی ـ کـەسێ کـو لنک هونەرمەندەکی یان زانایەکی فێری هونەری یان زانستی ببیت ـ کورێ کـو ل دوکـانەکێ خـزمـەتێ بکەت(بەردەستکێ دوکانداری).

**شال(Şal)**: شال ـ شویتک ـ شاشک ـ کورک.

**شـالوده(Şalûde)**: شـەنگسـتـە، ئاساس ـ نەخشە، پلان.

**شالهنگ(Şalheng)**: گرەو، رەهینە ـ فـێل و حـیلە ـ دەنگ و دور و هوسە ـ بێ نەگوهدار و سەرپێچی

یا فەرمانان بکەت.

**شالی(Şalî):** پویش برنج.

**شالی زار(Şalî zar):** زەڤییێن برنجی.

**شام(Şam):** دەستپێکا شەڤێ ـ شیڤ .

**شامە(Şame):** دەرسوک، کەفیک ـ د زاراوێ فیزیولوژی دا ئانکو پەردا نازک(غشاء).

**شامی(Şamî):** خەلکێ وەلاتێ شامێ(خەلکێ سوریێ) ـ جورەکێ خوارنێ یە.

**شامیانە(Şamyanê):** سیهوانە، کەپر.

**شان(Şan):** کورتکریا جیناڤێ (ایشان = ئەو)ـ شانا مێشا هنگڤینی .

**شاندن(Şanden):** شەکرن ـ دامەزراندن ـ ڤەمراندن.

**شانزدە(Şanzdeh):** هژمار شازدە(١٦).

**شانک(Şanek):** بەرچێلکا مریشکێ.

**شانە(Şanê):** مل ـ شەیێ سەری.

**شانیدن(Şanîden):** بنێرە: «شاندن».

**شاه(Şah):** شاه، سولتان ـ هەر تشتێ کو ژ لایێ مەزناهی و باشیێ ڤە ژ هندەکێن وەکی خوە مەزنتر یان باشتر بت، وەکی: (راه < شاهراه، تیر < شاەتیر و......هتد).

**شاهانە(Şahanê):** وەکی شاهی ـ یێ شاهی(هەر تشتێ کو گرێدای بت ب شاهی ڤە).

**شاهانی(Şahanî):** جورەکێ تری یە.

**شاهباز(Şahbaz):** تەیرێ بازی یێ کو مەزن و رەنگ سپی یە.

**شاه بالا(Şah bala):** گەنجێ کو هەڤ بەژن و هەڤ ژیێ زاڤای بت و ل شەڤا داوەتێ ب رەخ زاڤای ڤە تێت و دچیت(ل جەم مە برازاڤایە کو سال و بەژن نە مەرجێن سەرەکی نە بۆ برازاڤای.).

**شاهبو(Şahbû):** عەنبەر، بێهنا عەنبەرێ ـ مسک، بێهنا مسکێ.

**شاهپر(Şahper):** مەزنترین پەڕ د ناڤ فرندا دا.

**شاهپور(Şahpûr):** کورێ شاهی، شاهزادە.

**شاه تیر(Şah tîr):** کاریتێن کو بۆ

بانێ خانی بکار تینن.

**شاهد(Şahêd):** ژ بلی ئانکوییێن عەرەبی کو ب هەمان رامان ل فارسی ژی دا لکارن، ئانکوا(یار، دلدار، مێر و ژنێن روی جوان) ژی ددەت.

**شاهدباز(Şahêdbaz):** کەسێ کو کارێ گوهنێلی یێ دگەل کورِ یان ژنێن جوان بکەت.

**شاهدخت(Şahduxt):** کچا شاهی، شاهزادە خاتوین.

**شاهراه(Şahrah):** شاهرێ، رێک یان جاددا گەلەک پان و بەرین بیت.

**شاهرود(Şahrûd):** ژەها مەزنا سازێ - رویبارێ مەزن - ناڤێ رویبارەکێ یە کو سەروکانیا وێ ل شاهکوهە و ل باژێرێ شاهرود را دبوریت - ناڤێ باژێرەکێ ئیرانێ یە کو دکەڤتە د پارێزگەها سمنان دا.

**شاهزاده(Şahzadê):** شەهزادە، کورِێ شاهی.

**شاهنامه(Şahnamê):** پەرتوکا کو تێدا سەرهاتییێن شاهێن ئیرانێ ب هوزان یان پەخشان هاتبنە ڤەهاندن. ئیرانیان گەلەک شاهنامە هەنە، وەکی: شاهناما ابو المؤید بلخی کو ل نیڤا ئێکێ ژ سەدسالا چارێ کوچی ب پەخشانکی هاتبوو نڤیسین، و ب شاهناما مؤیدی ناڤدارە، لێ نهو نەمایە. هەروەسا شاهناما ابو منصوری کو ب فەرمانا ابو منصور محمد بن عبدالرزاقێ حاکمێ (طوس)ێ هندەک زانا و مێژوونڤیسان هەر ل نیڤا ئێکێ ژ سەدسالا چارێ ئەو شاهنامە بەرهەڤ کربوو، لێ ئەو ژی نهو نەمایە. بەلام شاهناما ژ هەمیان ناڤدارتر شاهناما فردوسی یە، و یا زانایە ژی کو فردوسی بۆ نڤیسینا شاهناما خوە گەلەک مفا ژ شاهناما (ابو منصوری) وەرگرتبوو.

**شاهنای(Şahnay):** زرنا (ئالاڤەکێ موزیکێ یە).

**شاهندن(Şahenden):** خوە ژ خرابکاریا پاراستن، کارێن قەنج کرن.

**شاهنشاه(Şahenşah):** کورتکریا پەیڤا (شاهان شاه)ە، ئانکو: شاهێ شاهان.

**شاهی(Şahî):** شاهاتی،

دەستهەلاتداری ـ پارێ هوبردە بوو ل سەردەمێ قاجاری یا ـ گیایێ شاهی.

**شاهیدن(Şahîden)**: شاهاتی کرن، دەستهەلاتداری کرن ـ بنرە: (شاهندن).

**شایان(Şayan)**: هێژا، ب سەرڤە، لایق. د کرمانجیا خوارێ دا هەر شایان لکارە.

**شاید(Şayed)**: بەلکی، چێدبیت، رەنگە.

**شایستن(Şayêsten)**: هێژا بوون، بسەرڤەبوون.

**شاییدن(Şayîden)**: بنێرە: (شایستن).

**شب(Şeb)**: شەڤ.

**شبالنگ(Şebaleng)**: نێچیر.

**شبان(Şeban)**: کوما شەڤا، چەند شەڤ ـ شڤان.

**شبانگاه(Şebangah)**: دەمێ شەڤێ ـ هەڤشیێ پەزی.

**شبانه(Şebanê)**: شەڤی(هەر تشتێ کو ژ بەر شەڤێ مابیت و رۆژا لدویڤ دا ئەو تشت بهێتە بکارئینان ب تایبەتی خوارن)ـ شڤان.

**شباهت(Şebahet)**: وەکیاتی، ئەڤ پەیڤە د زمانێ عەرەبی دا نینە بەلام فارسا ژ پەیڤا (شبیه) یا عەرەبی چێکریە.

**شباهنگ(Şebaheng)**: بلبل ـ ستێرا سپێدێ.

**شب باره(Şeb barê)**: کەسێ یان کەسا کو حەژ شەڤێ بکەت ـ ژنا پویچ و دەهمەن پیس.

**شب بازه(Şeb bazê)**: شەڤ رەڤینک، چەکچەکیلە.

**شب پره(Şeb perê)**: بنێرە: (شب بازە).

**شبدیز(Şebdîz)**: ب رەنگێ شەڤێ ـ ناڤێ هەسپێ خسرو پەرویزی کو رەنگێ وی رەش بوو ـ ناڤێ ئێک ژ هەر سیە ئاوازێن باربەدی یە.

**شبست(Şêbêst)**: کرێت.

**شبستان(Şebêstan)**: جهێ شەڤێ، جهێ نڤستنێ ـ جهێ تایبەت بو ژنکا ل خانیێن مەزنان ڤە ـ ئەو جهـ ژ مزگەفتێ یێ کو بان کری بیت.

**شب فرخ(Şebê ferrux)**: ناڤێ ئێک ژ هەر سیە ئاوازێن باربەدی.

**شبنم(Şebnem)**: خوناڤ.

**شبی(Şebî)**: مالێ شەڤێ (مەبەست ژی جلکێ نفستنێ یە).

**شبیخون(Şebîxûn)**: هێرشێن ژ نشکەکیڤە کو لدەمێ شەڤێ ببەنە سەر دوژمنی.

**شبینە(Şebînê)**: شەڤی، تشتێ (وەکی خوارنێ) کو ژ بەر شەڤێ مابیت.

**شپشە(Şêpêşê)**: پێشک، وەکی: (پێشکا برنج و گەنم و ئاری).

**شپل(Şêpl)**: فیتی ـ پلە و دەرەجە.

**شپلیدن(Şêplîden)**: فیتی ڤەدان.

**شپیلیدن(Şepîlîden)**: گڤاشتن.

**شتا(Şêta)**: برسی، کەسێ کو تێشت یان فراڤین نەخواربیت.

**شتاب(Şêtab)**: لەز، زوی، حێل چوون، توند چوون.

**شتابان(Şêtaban)**: ب لەز ـ لەزۆ (کەسێ کو ب لەز قەستا کارەکی بکەت).

**شتافتن(Şêtaften)**: لەزکرن، عەجەلەکرن ـ زوی چوون، توند چوون.

**شتر(Şutur)**: حێشتر.

**شترمرغ(Şuturmurx)**: کەردیکل (نعام).

**شته(Şete)**: تری ـ شەڤی.

**شجام(Şecam)**: سر، سەرمایا دژوار.

**شجانیدن(Şecanîden)**: سارکرن، تەزاندن.

**شجیدن(Şecîden)**: ساربوون، تەزین.

**شخ(Şex)**: چەقێ دارێ ـ سەرێ چیای،گوپیتکا چیای ـ ئەردێ رەق و بێ سەروبەر ـ موکوم، قاییم.

**شخ(Şux)**: کێم و عەداڤ ـ قرێژ و قیڤار.

**شخالیدن(Şexalîden)**: سەلخین. هەروەسا (شخاییدن) ژی لکارە.

**شخش(Şexş)**: کەڤن ـ پێتی ـ جلکێ کەڤن ـ کەتن، حولسین، تەحسین.

**شخشانیدن(Şexşanîden)**: حولساندن، تەحساندن.

**شخکاشە(Şexkaşê)**: گژلوک.

**شخم(Şuxm)**: کێلان (کێلانا ئەردی).

**شخودن(Şuxûden)**: کەلدابرن ـ بریندارکرن ـ سەلخاندن.

**شخول(Şexûl)**: فیتی ـ نالین و قێرین.

**شـخـولیـدن(Şexûlîden):** فـیـتـی ڤەدان ـ نال نال کرن ـ قیژی ڤەدان ـ چرمسین.

**شـخـیـدن(Şexîden):** حـولسین، تەحـسین ـ کـەفـتن ژ جـهـەکی ـ چرمسین، قورمچین.

**شـدکـار(Şudkar- Şêdkar):** ئەردێ کێلای و تۆڤ کری.

**شدکـیس(Şedkîs):** کـەسکوسـور، کەسکوئالا(قوس قزح).

**شـدن(Şuden):** بوون ـ چوون ـ بۆرین.

**شدەبند(Şudebend):** رۆژنامەڤان ـ مێژوونڤیس.

**شدیار(Şudyar):** بنیرە: (شدکار).

**شرب(Şerb):** جورەکێ پەرۆکێ نەرم و تەنک بوو کـو دەرسـوک و کەفیک ژێ چێدکرن.

**شـرشـر(Şurşur):** دەنگێ شـرشـرا ئاڤێ.

**شـرشـرە(Şurşurê):** سـوپلاڤکێن بچویک.

**شـرفـاک(Şerfak):** دەنگێ پێی، هەر دەنگەکێ هێـدی. هەروەسـا (شـرفـانگ، شـرفـالنگ، شـرفـە، شرفک) ژی لکارن.

**شـرم(Şerm):** شـەرم(حـیـا) ـ نامـوس، هەتک ـ ئامـیـرێن گوهنێلیێ.

**شـرمگاه(Şermgah):** ئامـیـرێن گوهنێلیێ یێن زەلام و ژنکا(کیر، قوز).

**شرمگین(Şermgîn):** شەرمین.

**شـرنگ(Şereng):** ژەهر ـ هەر تشتێ تەحل.

**شست(Şest):** هژمار شێست(٦٠) ـ تبـلا بەرانێ ژ دەست و پێـیـا ـ شۆکا ماسی یا ـ تەلـه، تەلی.

**شـسـتگانی(Şêstganî):** شەنگستە، ئاساس.

**شـسـتگر(Şestger):** کـڤـاندار، تیرهاڤێژ.

**شستن(Şusten):** شویشتن.

**شش(Şeş- Şêş):** هـژمـار شەش(٦).

**شش(Şuş):** پش، مێلاکا سپی.

**شش بانو(Şêş banû):** دڕکـەیە ژ هـەیـڤـێ و هـەر پـێـنـج سـتـێـرێن(عطارد، زهره، مـریخ، مشتری و زحل). هەروەسا پەیڤێن (شش خاتون، شش عروس و شش بانوی پیر) ژی لکارن.

**شش پستان(Şuş pêstan):** مەمک پزدان، ژنکا کو مەمکێن وێ نەرم و مەزن بن ـ پیرەژن.

**شش پستان(Şêş pêstan):** دڕکەیە ژ دێهلێ(سەیێ مێ) ـ خەبەر(جنێو)ەکە کو ددەنە ژنکا، هەروەکی د کوردی دا (دێهلێ) لکارە.

**ششلیک(Şêşlîk):** تکە و کەباب.

**شغ(Şex):** چەقێ دارێ ـ شاخێ گیانەوەرا.

**شغال(Şexal- Şuxal):** طوری، تویری.

**شغر(Şexer):** تیڤلێ نیڤا دەستی کو ژ بەر زێدەکارکرنێ رەق ببیت.

**شفت(Şeft):** مەزن، گر ـ نەتراشی، نە حولیکری(بو داری دهێتە بکارئینان).

**شفتالو(Şeftalû):** جورەکێ خوخانە.

**شفشف(Şefşef):** چقێ دارێ کو خوەهر و ڤیج بیت ـ رهێ دارێ.

**شفشه(Şefşe):** چقێ دارێ کو راست و نازک بیت.

**شفک(Şefek):** بێ هونەر، نەزان، هەبلە.

**شفل(Şefel)** نینوکێن فیل و حێشترا.

**شفوده(Şufûde):** حەفتی(روژێن حەفتیێ هەر ژ شەمبی تا دگەهیتە ئەینیێ).

**شکار(Şêkar):** نێچیر.

**شکارگر(Şêkarger):** نێچیرڤان.

**شکاریدن(Şêkarîden):** نێچیر کرن.

**شکاف(Şêkaf):** شکەن، دەرز، کەلشت ـ گلولکا بەنکێ ئارمویشی.

**شکافانیدن(Şêkafanîden):** دەرزاندن، کەلاشتن.

**شکافتن(Şêkaften):** دەرزاندن، کەلاشتن ـ پرت پرت کرن ـ دڕاندن.

**شکافه(Şêkafê):** ئالاڤەکێ بچویکێ داری یان ئاسنی یە کو سازژەن سازێ پێ دژەنیت.

**شکافەزن(Şêkafêzen):** سازژەن.

**شکاندن(Şêkanden):** شکاندن، هویرهویر کرن.

**شکانک(Şekanek):** بەرچێلکا مریشکێ.

**شکر(Şêker):** شەکر ـ فەرمانە ب

نێچیرکرنێ، ئانکو: (نێچیرێ بکە).

**شکراب(Şêkerab):** قەنداش ـ دڕکەیە ژ دلمانەکا هندک ل ناڤبەرا دو هەڤالان دا.

**شکرافشان(Şêkerefşan):** ئاخفتن خوەش، سوحبەتکەر.

**شکرپا(Şêkerpa):** لەنگ، سەقەت.

**شکرخند(Şêkerxend):** گرنژین.

**شکردن(Şêkerden):** نێچیرکرن.

**شکرفیدن(Şêkerfîden):** حولسین، تەحسین ـ هلنگفتن، سەتمین(بۆ دەوارا پتر لکارە).

**شکره(Şêkere-ê):** هەر فرندەکێ نێچیرکەر، وەکی: (بازی، شاهین و......هتد).

**شکست(Şêkest):** شکەست، هویر هویر بوو.

**شکستن(Şêkesten):** شکەستن، هویر هویر بوون ـ بەرامبەر دوژمنی شکەستن خوارن(مغلوب بوون).

**شکسته زبان(Şêkestê zeban):** لالوتە، ترتری.

**شکفتن(Şêkuften):** بشکفتن، ڤەبوون(ڤەبوونا گولێ)، ژ سەرێک رابوون(ژ سەرێک رابوونا لێڤا لدەمێ گرنژینێ).

**شکفیدن(Şêkufîden):** بنێرە: (شکفتن).

**شکک(Şekek):** تەنبویر(ئامیرەکێ موزیکێ یە) ـ دەنگێ پێی ل دەمێ هاتن و چوونێ.

**شکله(Şêkle):** زیڤال، ریتال (پرتێن دڕیای ژ جلکی لدەمێ ب بزمارەکی یان کەلەمەکی دکەڤیت) ـ تویزی، کویزی(بێن گوندور و زەبەشا).

**شکم(Şêkem):** زک.

**شکمبه(Şêkembe):** ئاشکێ گیانەوەرێن گیاخور.

**شکمو(Şêkemû):** بێ نەفس، کەسێ کو بۆ خوارنێ گەلەک حەژ زکێ خوە بکەت.

**شکن(Şêken):** کووریشکێن پەڕوکی ـ گولالی بێن پرچێ.

**شکنج(Şêkenc):** بنێرە: (شکن)ـ ئەشکەنجە ـ فێل و حیلە.

**شکنجیدن(Şêkencîden):** ئەشکەنجەدان ـ قورنجیک دانان.

**شکند(Şêkend):** کرمێن سۆر و درێژ کو ل ئەردێن تەڕ و نمدار

دمشەنە.

**شکنه (Şêkene):** نازداری.

**شکوب (Şukûb):** دەرسوک، کەفیک.

**شکوخ (Şukûx):** کەفتن، هلنگفتن، سەتمین.

**شکوخیدن (Şukûxîden):** بنێرە: (شکوخ)ـ ترسیان.

**شکوفا (Şêkûfa):** بشکفتی، ڤەبووی.

**شکوفه (Şêkûfê):** بشکوژ، غونچە ـ هلاڤێتن، دل رابوون.

**شکوفیدن (Şêkûfîden):** بنێرە: (شکفتن)ـ کەلاشتن ـ شکاندنا لەشکەری.

**شکوه (Şukûh):** شکۆ، مەزناتی، پایەبەرزی.

**شکوه (Şêkûh):** ترس.

**شکیب (Şekîb):** صەبر، ئارام، قرار.

**شکیبا (Şekîba):** بێهن فرە، صابر.

**شکیبیدن (Şekîbîden):** بێهنا خوە فرەهـ کرن، صەبر کێشان.

**شکیش (Şekîş):** جهال.

**شکیفتن (Şekîften):** بنێرە: (شکیبیدن).

**شکیل (Şêkîl):** فێل، حیلە ـ سەختە، قەلپ.

**شکینه (Şekîne):** جێرێ مەزن کو دەخل و دانی بکەنێ.

**شگال (Şegal):** طوری، توبری (گیانەوەرەکە).

**شگال (Şugal):** رەژی.

**شگال (Şêgal):** شکەن و دەرزێن مەزن لسەر رویێ ئەردی ـ چال ـ بیر.

**شگالیو (Şugalîv):** نان یان گوشتێ کو لسەر ئاگری بهێتە قەلاندن یان براشتن.

**شگرد (Şêgêrd):** رێ و رێباز.

**شگرف (Şêgerf):** سەیر، عنتیکە، عەجێب ـ باش و دەلال ـ تشتێ کو بۆ جوانی و قەنجی یا خوە بێ هەڤتا بت و کێم بدەست بکەڤت.

**شگفت (Şêgêft):** سەیر، عەجێب.

**شگفتیدن (Şêguftîden):** سەرسورمان، حەیبیرین.

**شگون (Şugûn):** فالا خێرێ ـ پیروزی.

**شل (Şul):** نەرم، سست ـ ڤلّ، ئاڤدار ـ مرۆڤێ سست و لاوز و تەمبەل.

**شل(Şêl)**: رِما کورت، خشت.

**شـــل(Şel)**: رەهـــن، ران(رانـــێ گیانەوەر و مرۆڤا).

**شل(Şell)**: شـەلەلی، کـەسێ کـو دەستێ وی ژ کار کەتبیت.

**شـلال(Şêlal)**: دریارا ژێک فـرِ (بۆ دریـارا پەرِوک و جل و بەرگـــا لکارە).

**شلپ(Şêlêp)**: دەنگێ تشـتـەکی دەمێ دکەڤیتە د ئاڤێ دا.

**شلپـــوی(Şelpûy)**: دەنگێ پێی لدەمێ رێڤەچوونێ.

**شلتوک(Şeltûk)**: پویش برنج.

**شلتـــه(Şelte)**: جـــهێ کـــو پشکل(کـوشـــپـل) و گلێـــشی بکەنێ.

**شلخـتـه(Şe-Şêlexte)**: ژنا بێ مەرِێز، ژنا تەمـبەل کو کارێن خوە ب بێ تەرتیفی برێڤە ببەت.

**شلغم(Şelxem)**: شێلم.

**شلف(Şelf)**: ژنا دەهمـــەن پیس، قەحبە.

**شلفـــینه(Şelfîne)**: ناڤ لـنگێ ژنکێ، قوز.

**شلفیه(Şelfîye)**: بنێرِە: (شلف + شلفینە)ـ (الفیه و شلفیه): ناڤێ پەرتوکـــەکێ بـوو کـــو وێنـێن جوراوجور تێدا بوون ژ چەوانی یا گـوهنێلی یا مـێـر و ژنا؛ ئەڤ پـەرتوکـــــــە «ئـەزرەقـی» بـۆ «طغانشاه»ی بەرهەڤ کربوو.

**شلوار(Şelvar)**: شەلوال.

**شلوغ(Şulûx)**: دەنگ و دور، هوسە و قەرەبالغ.

**شله(Şulle)**: جـهێ کـو گلێـشی دکەنێ ـ ناڤ لنگێ ژنکێ، قوز.

**شله(Şele)**: تۆلڤەکرن.

**شلیـته(Şelîte)**: جورەکێ دەهمەنێ کو د کەڤن دا ژنکا لسەر دەرپێیا را دکرنە بەرخوە.

**شلیـدن(Şelîden)**: نجـمین، وەکی مـرۆڤـێن شـەلەلی یان سـەقـەت برێڤەچوون.

**شلیک(Şêllîk)**: دەنگێ ڤـالەبوونا تەلقێ یان گـولله توپێ ـ فـەرمـانە ب رەمی کرنێ.

**شم(Şum)**: پێـلاڤـا چەرمی کـو شـــروخـــێت وێ ژ بەنـکا هاتبنە چێکرن.

**شـم(Şem)**: رەڤـین، رەڤـین ژ بـەر ترسیـانێ ـ پەریشان بوون ـ فێل، حـیلە، بسـەردابرن، خـاپاندن ـ

نینوکێن دەست و پی یا.

**شما(Şuma):** هوین ـ هەوە، وە ـ هەروەسا بۆ رێزگرتن ل شوینا جیناڤێ «تو» (کو جیناڤێ تاکە بۆ کەسێ دووێ یێ ئامادە) ژی بکار دهێت.

**شماخ(Şemax):** ئێلەک، زەخمە (زەخمێن سەر مەمکێن ژنکا).

**شمار(Şumar):** هژمار ـ حساب ـ نمرە.

**شماله(Şemale):** شەمالک، مۆم ـ ناڤێ جورەکێ برنجی یە.

**شمانیدن(Şemanîden):** پەریشان کرن ـ رەڤاندن(ژ بەر ترسێ مەجبور کرن کو برەڤیت) ـ ترساندن.

**شمخال(Şemxal):** جورەکێ چەکی کو لسەردەمێن کەڤن دهاتە بکارئینان.

**شمد(Şemed):** پەروکەکێ سپی یێ تەنک بوو کو ل هاڤینێ و لدەمێ نڤستنێ بسەرخوە دادان.

**شمر(Şemer):** سکر، حەود، یان هەر تشتەکێ کو ئاڤ تێدا یان ل پشت خرڤە ببیت.

**شمردن(Şumurden):** هژمارتن.

**شمشیر(Şemşîr):** شیر (جورەکێ چەکی یە).

**شمغن(Şemxen):** هەر تشتێ کو بێهنا پیس ژێ بهێت، ب تایبەتی ژنکا کو بێهنا نەخوەش ژێ بهێت.

**شمل(Şemel):** پێلاڤا چەرمی کو شروخێت وێ ژ بەنکا هاتبنە چێکرن.

**شمه(Şême):** فری.

**شمیدن(Şemîden):** ترسیان ـ رەڤین ـ ژ حال چوون، بێ هش بوون ـ پەریشان بوون.

**شمین(Şemîn):** بێهن خوەش.

**شن(Şên):** خیز.

**شنا(Şêna):** مەلەڤانی.

**شناخت(Şênaxt):** نیاسین ـ تێگەهشتن و بسەرهلبوون ـ زانین.

**شناختن(Şênaxten):** نیاسینی دگەلێک کرن، هەڤالینی ـ زانین، زانایی.

**شناساندن(Şênasanden):** دانە نیاسین، ناساندن.

**شناسنامه(Şênasnamê):** ناسنامە (هویە).

**شناگر(Şênager):** مەلەڤان.

**شناور(Şênaver):** مەلەڤان ـ هەر

تشتێ کو لسەر ئاڤێ کەفتبیت.

**شنب(Şe-Şunb):** گونبەد، قوببە.

**شنبد(Şenbed):** شەمبی، ئێکەمین ڕوژا حەفتییێ.

**شنبه(Şenbê):** بنێڕە: (شنبد).

**شنج(Şenc):** کومتێ چیای، سەرێ چیـــــــای ـ ئـەردێ ڕەق و بـێ سەروبەر.

**شندف(Şendef):** داهۆل.

**شنغار(Şunxar):** فڕندێ نێچیرێ، بازیێ چاڤ ڕەش.

**شنفتن(Şênuften):** گوهـ لێ بوون، بهیستن.

**شنگ(Şeng):** شـــەنگ، جـــوان، دەلال.

**شنگل(Şengul):** بنێڕە: (شنگ)ـ سەرخوەش، مەست.

**شنگله(Şengule):** ڕیشـــالوکـێـن دەرســـــــوک و پـەردە و جلـکـا ـ ئوبشییێن تری و گەنمی و......هتد.

**شنوا(Şêneva):** گوهدار، بهیسەر، یێ کو گوهـ لێ دبیت.

**شنـوانیـــــــدن(Şênevanîden):** گەهاندن، بـهیـساندن(ئاخفـتنەکی بگەهینیە گوهێ ئێکی).

**شنوایی(Şênevayî):** ئێک ژ هەر پێنج هەستـان کو هەسـتا گـوهـ لێ بوونێ یان بهیستنێ یە.

**شنه(Şene):** ئاواز ـ شهینا هەسپی ـ لەعنەت و نفرین.

**شنیـدن(Şênîden):** گـوهـ لێ بوون، بهیستن.

**شو(Şû):** مێر(مێرێ ژنکێ).

**شـوا(Şêva):** پەقـیـشکێت کـەفـا دەســـتی، کـــو ژ ئـەگـــەرێ زێدە کارکرنێ دیار دبن.

**شوخ(Şûx):** کێم و عەداڤ ـ قرێژ و قـیـڤـار ـ شـاد و خـوەشـحـال ـ ترانەکەر، یاریکەر، صوحبەتچی ـ شوخ و شەنگ.

**شـــور(Şûr):** ســـویر، ب خـــوێ ـ سەرهلدان، شورش، فتنە ـ دەنگ و دور ـ ئێـک ژ ئاوازێن کـــەڤنێن ئیرانی یە.

**شـــوراندن(Şûranden):** فــــتنە هلێـخـــستن ب وێ ئـنیـــەتێ کـــو خــــەلک ڕابیـــتــە ســـەرخـــوە و سەرهلدانا بکەت.

**شوربا(Şorba):** شوربە.

**شـــوربخت(Şûrbext):** بەخت ب ڕەش، بێ شەنس.

**شورپا(Şûrpa):** هەسپ یان هێستر

یان کـــەرێ کـــو ل دەمێ چوونێ چۆکێن وی ڤێک بکەڤن.

**شـــــورش(Şûrêş)**: شــــۆرش، سەرهلدان.

**شورم(Şûrem)**: چیا.

**شوریدن(Şûrîden)**: پەریشان بوون ـ شورش کرن، سەرهلدان.

**شـــــــولا(Şola)**: جـلـکـێ دەروێشا (خرقە).

**شـولک(Şûlek)**: هەسپ، هەسـپێ کو حێل بچیت.

**شـولیـدن(Şûlîden)**: تێکچـوون، پەریشان بوون، دامای بوون.

**شومیـز(Şûmîz)**: ئەردێ کێلای و بەرهەڤ بۆ تۆڤچینیێ.

**شومیزیدن(Şûmîzîden)**: کێلان، قلێب کرن و کولانا ئەردی.

**شوهر(Şoher)**: مێر(مێرێ ژنکێ) ـ زەلامێ ب ژن.

**شـــوهردار(Şoherdar)**: ژنکا ب مێر.

**شوی(Şûy)**: بنێرە: (شوهر).

**شـوی دیده(Şûy dîdê)**: ژنکا کـو شوی کربیت ـ بیژن.

**شە(Şeh)**: بنێرە: (شاە).

**شهر(Şehr)**: شار، باژێر.

**شهربانی(Şehrbanî)**: رێڤەبەری یا پۆلیسا.

**شهرداری(Şehrdarî)**: رێڤەبەری یا باژێرڤانیێ.

**شـهرسـتـان(Şehrêstan)**: قـەزا، باژێرێ کو قایمقامی لێ بیت.

**شهرک(Şehrek)**: باژێرک.

**شهریار(Şehryar)**: مەزنێ باژێری، دەستهەلاتدارێ باژێری.

**شـــهـــریده(Şehrîdê)**: بژالە، پرتیبەلاڤ ـ پەریشان بووی.

**شهریور(Şehrîver)**: هەیڤا شەشێ یە ژ هەر سـالەکا هەتاڤی، هەیڤا دویـماهیکێ یە ژ وەرزێ هاڤینێ ـ رۆژا چوارێ یە ژ هەر هەیڤەکا سالا هەتاڤی.

**شهریورگان(Şehrîvergan)**: ناڤێ وێ جـــەژنێ یە یا کـــو ل رۆژا «شـهـریور، ئانکو: رۆژا چوارێ ژ هەیڤـا دویاهیـا وەرزێ هاڤـینێ» دهاتە گێڕان.

**شهسوار(Şehsevar)**: سوبارچاک ـ شەهسوبار.

**شهله(Şehle)**: بەز(بەزێ گوشتی).

**شهلیدن(Şehlîden)**: ژێک بژالە و پەلاتەکرن.

**شـهنا(Şehna):** زرنا (ئامـیـرەکێ موزیکێ یە).

**شـهناز(Şehnaz):** ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن موزیکا ئیرانی یە.

**شهنگانه(Şehenganê):** گژلوک.

**شـهـه(Şêhe):** دەنگێ شـهـینا هەسپی.

**شیاریدن(Şiyarîden):** قلێب کرنا ئەردی، کێلانا ئەردی.

**شیان(Şiyan):** سزا، پاداش.

**شـیـب(Şî- Şêyb):** نشـیـڤی، سەرنشیڤی ـ سەوداسەری، حەیران بوون د رێکا ئەڤینێ دا.

**شیبان(Şîban):** لەرزوک ـ پەریشان ـ تێکهل ـ سەوداسەری و حەیران بوون د رێکا ئەڤینێ دا.

**شیبانیدن(Şîbanîden):** لەرزاندن ـ ب سەردابرن، خاپاندن، فێل لێ کـرن ـ سـەرگـەردان کـرن ژ بەر ئەڤـینێ ـ تێکهـەلکرن ـ هەڤـیـر کرن.

**شـیـبـیـدن(Şîbîden):** بنێـرە: (شیبانیدن).

**شیپور(Şêy- Şeypûr):** زرنا.

**شید(Şîd):** رۆناهی ـ نویرهە، گۆری ـ هەتاڤ.

**شیدا(Şeyda):** شەیدا.

**شـیـذر(Şîzer):** ئێکە ژ ناڤـێن خودێ.

**شیر(Şîr):** شێر (گیانەوەرەکە کو ب سولتانێ دارستانێ هاتیە نیاسین ـ حـەنەفی (حـەنەفی یا ئاڤێ) ـ شیر (خواردەمەنی یا کو ژ مەمکێن دەیکێ ـ یان گوهانێن ماکێ لجـەم گـیـانەوەرا ـ دزێت هەر ژ رۆژا ئێکێ یا ژ دایکبـوونێ ـ یان زانێ لجـەم گـیـانەوەرا ـ.. هەروەسا بۆ (شـیـرێ توز) یان (شـیـرێ پاسـتـوریزەکـری) ژی هەر دهێـتـە گۆتن.

**شیـرازه(Şîrazê):** قـەیتـانا رەنگین کو بەری پەرتوک بهێتە بەرگ کرن ل سـەرو بنێن کـەعـبێ پەرتوکێ دادنن ژ بۆ جوانی یێ.

**شیرجه(Şîrcê):** غارا چارگاڤ وەکی شێری ـ سەرسەرکی خوە ئێخستنە ناڤ ئاڤێ (نکسة).

**شیـردوش(Şîrdûş):** بێری (نهـۆ ل جهێن کو چێلا و پەزی لێ بخودان دکـەن، زەلام ب ڤی کـاری رادبن)ـ زەرکا شیری (نهۆ ل جهێن کو چێلا و پەزی لێ بخودان دکەن، ئامـانێن

گەلەک مەزن کو گەلەنێن چەند لێترینە بکار دئینن)ـ ئالاڤێ کو ژنکێن زهستانی(هەر ژ دەمێ بچویک بوونی تا چلکێن وێ تمام دبن) شیری پێ ژ مەمکێن خوە دکێشنە دەر(هەروەسا ل وان جهێن کو پەز و چێل لێ دهێنە بخودانکرن، ئالاڤەکێ تایبەتی دهێتە بکاربرن کو ب کارێ دوهتنا شیری ژ گوهانێن گیانەوەرێن شیردەر رادبیت).

**شیرزج(Şîrzec):** شیرێ شەڤرەڤینکێ، شیرێ (چەکچەکیلە)یێ.

**شیرلان(Şîrlan):** جهێ کو گەلەک شێر لێ هەبن.

**شیروانی(Şîrvanî):** خەلکێ شێروان ـ سەربانێن کو ژ داری یان توتیای بهێنە چێکرن.

**شیروش(Şîrveş):** وەکی شێرا ـ دلێر، مێر، نەترس.

**شیرە(Şîrê):** ئاڤا فێقی کو هاتبیتە کەلاندن تا کو تیر دبیت.

**شیرین(Şîrîn):** هەر تشتێ ژ شیری بیت ـ هەر تشتێ وەکی شیری یان ب تاما شیری ـ شرین(بەروڤاژی تەحلی یێ).

**شیرینی(Şîrînî):** شریناهی.

**شیشک(Şîşek):** ئامیرەکێ موزیکی یە(ربابا چوار ژەهە) ـ بەرخێ نێر کو شەش هەیڤی یان ئێک سالی بیت.

**شیشلە(Şîşele):** شەلەلی، کەسێ کو دەست و پێن وی سست و بێ هێز بن.

**شیشم(Şîşum):** بنێرە: (شیشک).

**شیشە(Şîşê):** شیشە.

**شیفتن(Şîften):** عاشق بوون ـ سەرگەردان بوون د رێیا ئەڤینێ دا.

**شیلان(Şîlan):** سوفرا خوارنێ ـ ناڤێ دارەکێ یە.

**شیلە(Şîle):** شیڤک(ئەو جهێن کو ئاڤا بارانێ رێکا خوە لێ ڤەکەت).

**شیوا(Şîva):** رەهوان(بۆ ئاخفتنێ).

**شیون(Şîven):** گری و زێمار.

**شیوە(Şîvê):** رێ و رێباز ـ یاسا ـ بنواش ـ داب و نەریت.

**شیویدن(Şîvîden):** تێکهەلکرن ـ لەرزین.

**شیهە(Şîhê):** دەنگێ شهینا هەسپی.

# ص

**ص(Sad):** ئەڤ تیپە د زمانێ فارسی دا نینە و ئەو پەیڤێن کو ئەڤ تیپە د ناڤ دا بن، پەیڤێن عەرەبی نە، یان ژی پەیڤێن لێکدای یان دارشتی نە ژ هەردو زمانێن فارسی و عەرەبی. ل هندەک جها ئەڤ تیپە ل شوینا تیپا (س) هاتیە بکاربرن، وەکی: پەیڤا (سد) کو ل شوینا پەیڤا (صد: هژمار سەد) دهێتە نڤیسین. هەرچەوا بت بلێڤکرنا ڤێ تیپێ د زمانێ فارسی دا مینا بلێڤکرنا تیپا (س)ێ یە.

**صابون پز(Sabûn pez):** سابوین چێکەر.

**صاحب خانە(Sahêb xanê):** خودانێ خانی، خودانێ مالێ ـ مێهڤاندار.

**صاحب خرد(Sahêb xêred):** ژیر، عاقل.

**صاحب درد(Sahêb derd):** نەخوەش، نەساخ ـ بەلادیتی، مصیبەت دیتی.

**صاحب دل(Sahêb dêl):** دلێر، نەترس ـ خودێناس ـ دل نازک، ب رەحم، کەسێ کو ڤیان و میهرەبانی لدەڤ هەبت.

**صاحب دیوان(Sahêb dîvan):** چاڤدێرێ خەزینە و داراییا دەولەتێ. لسەردەمێن کەڤن (صاحب دیوان)ی کارەکێ گرنگ بوو کو بەرامبەر وەزارەتا دارایی یا نهۆ بوو ـ هۆزانڤانێ کو خودان دیوانا هۆزانا بت.

**صاحب سخن(Sahêb suxen):** ئاخفتنکەر.

**صاحب کلاە(Sahêb kulah):** کولاڤدار، تانجدار، شاه.

**صاحب مرده(Sahêb murdê):** خودان مری، ئەو تشتێ کو خودانێ وی مربت(ئەڤ پەیڤا لێکدای وەک ئاخفتن لدەمێ تۆرەبوونێ دهێتە گۆتن ئەو ژی ئەو دەمە کو مرۆڤ نفرینێ ل گیانەوەرەکی دکەت).

**صاحبی(Sahêbî):** جۆرەکێ ترێ سۆر و تلی گرە ـ جۆرەکێ جلکێ ئارموبشیێ گەخ گەخە.

**صادر شدن(Sadêr şuden):** دەرکەفتن، دەرچوون.

**صادقانه(Sadêqanê):** ب راستی و دروستی ـ ب براییی.

**صاع ستان(Sa'i sêtan):** هەژار و دەستکورتێ کو ل عەرەفاتێن عەیدێ، فتر و سەدەقا بۆ خوە ژ خەلکی وەربگرت.

**صاع سر(Sa'ê ser):** فتر یان سەدەقا سەرێ مرۆڤی کو ل رۆژێن عەرەفاتێن عەیدا رەمەزانێ ددن.

**صاعقه آسا(Sa'êqê asa):** وەکی برویسیێ.

**صاف کردن(Safkerden):** حولیکرنا قورمچک و کوریشکێن پەرۆکی یان ترومبێلێ یان هەر تشتەکێ دی.

**صافی دل(Safî dêl):** دلپاک، دلسافی، دلێ بێ کەرب و کین.

**صافی شدن(Safî şuden):** پاک و پاقژ بوون، بێ غش بوون.

**صباوت(Sebavet):** زارۆکینی، بچویکاتی.

**صبحانه(Subhanê):** تێشت، خوارنا دانێ سپێدێ.

**صبح خوان(Subhxan):** تەیرێ کو لدەمێ سپێدێ ئاوازا بخوینت، بلبل.

**صبح خیز(Subhxîz):** کەسێ کو سپێدەهیا زوی ژ خەو رادبت.

**صبحدم(Subhdem):** بەرێ سپێدێ، دەمێ سپێدێ.

**صبح سعادت(Subhê se'adet):** دەستپێکا خوەشبەختیێ.

**صحرانشین(Sehranêşîn):** کۆچەر، کەسێن کو بۆ خوە ل بیابانی کوبنا ڤەددەن و تێڤە دژین.

**صحنەساز(Sehnêsaz):** کەسێ کو دەپێ شانۆێ ئامادە دکت بۆ پێشکێشکرنا شانۆێ.

**صد(Sed):** هژمار سەد(١٠٠).

**صـــدبرگ (Sedberg)**: گـــولا كـــو پڕبەلگ بت.

**صدرنشين (Sedrnêşîn)**: كەسێ كو لســـەرێ كـــۆچكێ يـان جـــڤـــاتێ دروينت .

**صـرصـرتک (Sersertek)**: مـرۆڤ يان گيانەوەرێ كو توند بچت يان توند ببەزت.

**صرعدار (Ser'dar)**: كەسێ كو تەب يان ئەلەمک لێ بت(ئەو ئێشا كو ئەم دبێژينێ سەروبنێت هەيڤێ).

**صرع زده (Ser'zedê)**: تەبگرتی.

**صفاكردن (Sefakerden)**: ئاشتی كرن، سولح كرن، پێكهاتن ـ كەيف و شادی كرن.

**صــــفــــاهان (Sêfahan)**: باژێرێ ئەسفەهان ـ ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن موزيكا ئيرانی يە.

**صفدر (Sefder)**: كەسێ كو رێزێن دوژمنی د بەرۆكێن شەڕی دا تێک بدەت، دلێر، شەڕكەر.

**صفرابر (Sefrabur)**: هەر تشتێ كو ئێشا زەركێ كێم بكەت.

**صــــــفــــــرازده (Sefrazedê)**: زەركگرتی، ئەو كەسێ كـو ئێشـا زەرک هاتبتێ.

**صـــفـــراكـــردن (Sefrakerden)**: دڕكەيە ژ تۆڕەبوونێ.

**صف كشيدن (Sef kêşîden)**: ب رێز راوەستان، سرا گرتن.

**صــــلاح انديش (Selah endîş)**: خـێـرخـواز، كـەسێ كـو هزرێ د باشيێ دا بكەت.

**صـلاحـيت دار (Selahiyetdar)**: خودان سەلاحيات، كەسێ كو ماف هەبت ب ئەنجامدانا هندەک كاران رابيت ـ كەسێ كـو لايق و هێژای ئەنجامدانا كارەكی يان بجی ئينانا فەرمانەكی بت.

**صلبيه (Sulbiye)**: سپيلكا چاڤی.

**صلح جو (Sulhcû)**: ئاشـتـيـخـواز، كەسێ كو پێكۆلێ بكەت ل شوينا دلمانێ ئاشتيێ بينتە گۆڕێ.

**صـلـح كـــــــردن (Sulhkerden)**: ئاشـــتـی كـــرن، ســولـح كـــرن، پێكهاتن.

**صلح گونه (Sulh gunê)**: ئاشتيا وەخـــــتـی كــــو ژ بەر هندەک بەرژەوەنديێن تايبـــەت دهێـــتـــە بەستن.

**صـلـيب ســــــرخ (Selîbê surx)**: دەزگـــەهێ خـــاچا ســـۆر يا نێڤ

دەولەتی.

**صلیب شکستە( Selîbê şêkestê)**: هێمایێ خاچا شکەستی یە کو هێمایێ فەرمی یێ حوکمەتا نازی یا ئەلمانی بوو و لسەردەمێن گەلەک کەڤنتر ئەڤ هێمایە، هێمایێ ئارییان بوو و ل (تخت جمشید ـ ل ئیرانێ) ئەڤ هێمایە هاتیە نەخش کرن.

**صمیمانە( Semîmanê)**: ب هەڤالینی ـ ب دلپاکی.

**صوف پوش( Sof pûş)**: کەسێ کو جلکێن سۆفی دکەتە بەر خوە.

**صیدگر( Seydger)**: نێچیرڤان.

**صیغەرو( Sîxêro)**: ژنا کو ب رەنگێ مەهرکرنا وەختی(زواج متعە) شوی ب زەلامان بکەت.

**صیفی کار( Seyfî kar)**: فێقی و زەرزەواتێن کو ل وەرزێ هاڤینێ دهێنە چاندن، وەکی: ( هەمی رەنگێن کەسکاتییا، زەبەش، گوندۆر، خیار و......هتد).

# ض

**ض(Zad)**: ئەڤ تیــپــە د زمــانێ فــارسی دا نینە و ئەو پەیڤـێن كـو ئەڤ تیـپـە د ناڤ دا بكار هاتبت، پەیڤـێن عـەرەبی نە. ئەڤـە و چەند پەیڤـەكێن لێكدای یان دارشتی ژ دو پەیڤێن عـەرەبی یان ژ پەیڤـەكا عەرەبی و پەیڤەكا فارسی و یانژی ژ پەیڤـەكـا عـەرەبی و پاشگرەكێ فارسی و......هتد، د زمانێ فارسی دا بـكارهاتـینە كــو هندەك ژ وان هەر چو جــارا د زمــانێ عــەرەبی بخـوە دا دیار نەبووینە. بلێـڤكرنا ڤێ تیـپێ د زمـانێ فـارسی دا هەر وەكی تیپا (ز)ە.

**ضــایع شــدن(Zayê'i şuden)**: پـویـچ بـوون، زەعـی بـوون ــ بـەرزە بوون، هندابوون.

**ضـــبط صـــوت(Zebtê sowt)**: دەنگگر، مسەجل.

**ضرابخـانە(Zerrabxane)**: جهێ كو پارە لێ دهێتە چێكرن.

**ضـرب(Zerb)**: لێكدان(ئێـك ژ هەر چوار كـــریارێن ســـەرەكی یێن بیركاریێ یە و ب ڤی هێمای(×) هاتیــە دەســـتنیـــشـــانكرن) ـ تمبلك(ئالاڤـەكێ مـوزیكێ یە) ـ جـۆر و رەنگ ژ هەر تشــتــەكی ـ زەلامێ بیـرتیـژ و د هەمـان دەم دا چست و چەلەنگ.

**ضــرب خــوردن(Zerb xurden)**: درب دیـتن، درب خــــوارن، درب ڤێكەفتن.

**ضرب خوردە(Zerb xurdê)**: درب دیـتـی، درب خـــــواری، درب ڤێكەفتی.

**ضـــــرب دیـدن(Zerb dîden)**: بنێرە: (ضرب خوردن).

**ضـرب گـرفتن(Zerb gêrêften)**: تمبلك لێدان، تمبلك قوتان.

**ضــرر زدن(Zerer zeden)**: زیان

گەهاندن.

**ضعیف دل(Ze’îf dêl)**: ترسنۆک، کولافە.

**ضعیف چزان(Ze’îf çêzan)**: ئەو کەسێ کو هەژار و بندەستان بئێشینت.

**ضلالت(Zelalet)**: سەررێداچۆن، رێ بەرزەکرن، لادان ژ راستەرێ.

**ضلت(Zellet)**: حەیبرین، سەرسوورمان ـ سەرگەردانی.

**ضمانت(Zemanet)**: گرفتار بوون ب ئێشەکا هەروهەر کو هندەک جاران دژوار ببت و خودانێ خوە بێخیت ـ ب ستویێ خوەڤەگرتن، کەفیل بوون، دەمان.

**ضیافت(Ziyafet)**: مێهڤان بوون، مێهڤانی، مێهڤانداری.

**ضیاگستر(Ziyaguster)**: رۆناهی دەه، تشتێ کو رۆناهیێ بدەتە تشتەکی یان جهەکی.

**ضیقت(Zî- Zeyqet)**: دەستکورتی، هەژاری، دەست تەنگی، موحتاجی، بێ حالی.



**ط(Ta):** ئەڤ تیپە د زمانێ فارسی دا نینە و ئەو پەیڤێن کو ئەڤ تیپە د ناڤ دا بت، پەیڤێن عەرەبی نە، یان ژی پەیڤێن لێکدای یان دارشتی نە ژ هەردو زمانێن عەرەبی و فارسی. ل هندەک جها ئەڤ تیپە ل شوینا تیپا (ت) هاتیە بکاربرن. و بلێڤکرنا ڤێ تیپێ د زمانێ فارسی دا هەر مینا تیپا (ت)ە.

**طارم(Tarem):** خیڤەتا مەزن ـ گونبەد ـ خانیێ کو ژ داری هاتبتە چێکرن ـ محەجەلێ کو ژ ئاسنی یان داری هاتبتە چێکرن ـ چارچووڤێ کو بۆ کەپرا مێوێ دهێتە چێکرن.

**طارم اخضر(Taremê exzer):** درکەیە ژ ئەسمانی. هەروەسا (طارم اطلس، طارم فیروزە و طارم نیلگون) بۆ ڤێ مەبەستێ لکارن.

**طارمی(Taremî):** محەجەلێ کو ژ ئاسنی یان داری هاتبتە چێکرن ـ خەلکێ دەڤەرا «طارم» کو گوندەکە دکەڤتە ناڤبەرا قەزوین و زەنجان دا، و بۆ ڤێ مەبەستێ ئەڤ پەیڤە (Tarumî) ژی دهێتە بلێڤکرن.

**طاس(Tas):** ترارک ـ سەرێ بێ مووی، ئەسلەع، شامی ـ زار(د یاریا تاولێ دا دهێتە بکارئینان).

**طاعت پیشه(Ta'et pîşê):** کەسێ کو کارێ خوە بکەتە تاعەت و عیبادەت.

**طاعت ور(Ta'et ver):** بنێرە: (طاعت پیشه).

**طاق(Taq):** بانێ چەمیای، بانێ کڤانی ـ تاک، تەک، کت(بەرامبەری جۆت)ـ ئێکانە،

ب تنێ، بێ هەڤتا.

**طاق ابرو(Taqê ebrû)**: کـڤـانا برهێ.

**طاقباز(Taqbaz)**: لسەر پشتێ رازای یان نڤستی.

**طاقچە(Taqçê)**: کورتکریا پەیڤا (طاق)ـ تاقشک.

**طاقدیس(Taqdîs)**: وەکی تاقی ـ ناڤێ تەختێ خسرو پەرویزی یە کو ئێک ژ تشـتـێن سـەیرێن لسـەر دەمێ خــسـرو پەرویزی دهاتە هژمارتن ـ ناڤێ ئێک ژ هەر سیھ ئاوازێن باربەدی یە.

**طالبی(Talêbî)**: جۆرەکێ گوندۆری یە(هەمـان گوندۆرێن دێمـێن گەخ گەخ و گڕنیزی نە).

**طاووس پیکر(Tavus pêyker)**: بەژن جــوان و رەنگاورەنگ وەکی تاووسێ.

**طاووس فش(Tavus feş)**: وەکی تاووسێ.

**طاووسی(Tavusî)**: هەر تشـتـەک کو یێ تاووسێ یان وەکی تاووسێ بت ـ رەنگێ کەسکێ زێرین وەکی کــەسکاتی یا پەرێن تاووسێ ـ ناڤێ جلکەکێ رەنگینە ـ ناڤێ دارەکێ یە.

**طبل زن(Tebilzen)**: داهۆلقوت.

**طبلک(Teblek)**: داهۆلا بچویک.

**طراز(Teraz)**: فـەرمـانە ژ ژێدەرێ (طرازیدن)؛ ئانکو: بخـەملینە ـ جوان بکە ـ رێک بێخە، تەرتیف بکە.

**طرازندە(Terazendê)**: خەملێنەر، کـەسێ کـو ب کـارێ خـەمـلاندنێ رادبت ــ رێـکـخــــــەر(رێـک و پێککەر).

**طرازیدن(Terazîden)**: خەملاندن، رێکخستن، تەرتیف کرن و جوان کرن.

**طرازیدە(Terazîdê)**: خەملاندی ـ رێکخستی.

**طرب آباد(Tereb abad)**: جـهێ کەیف خوەشییێ.

**طربناک(Terebnak)**: خوەشـحال، کەیفخوەش.

**طرخان(Te-Turxan)**: سـەرۆک، سەروەر.

**طرف(Terf)**: چاڤ، کـوژییێ چاڤی، ل تشـتـەکی نێرین ب کوژییێ چاڤی ـ مفا، سوود، قازانج ـ دوماهیک یان کنار یان لێڤا هەر تشـتـەکی،

وەکی: لێڤا دەهمەنێ، لێڤا کولاڤی، کنارێت چیمەنزارێ و......هتد ـ کەمەربەند، قاییش(زێری یان زیڤی).

**طرفدار(Terefdar)**: لایەنگر.

**طرفداری(Terefdarî)**: لایەنگری.

**طرفگاه(Terfgah)**: دڕکەیە ژ دنیایێ، جیهان.

**طرفگیر(Terefgîr)**: لایەنگر ـ کەسێ کو خوە ژ خەلکی ڤەدەر دکەت، گۆشەگیر، خەلوەنشین.

**طرید(Terîd)**: ژ بلی ئانکوییێن خوە ییێن عەرەبی(دویر ئێخستی ـ فیراری ـ ئەو کەسێ کو لدویڤ یێ دی ڕا بێتە سەر دونیایێ ـ ڕۆژا درێژ)، د زمانێ فارسی دا ئانکوییێن: (هێرش برن یان یاریکرن د مەیدانێ دا ـ گەف، ئاخفتنا کو ترس و هەیبەتێ بێختە دلێ یێ بەرامبەر و ببتە سەبەبێ هندێ کو ژ نک برەڤت.) ددت.

**طزر(Tezer)**: بنیاتێ ڤێ پەیڤێ هەمان پەیڤا (تزر) یا فارسی یە کو واتایا خانی یان قەسرا زڤستانی ددت.

**طشت بلند(Teştê bulend)**: دڕکەیە ژ ئەسمانی.

**طفیل(Tufeyl)**: ناڤێ زەلامەکی یە ژ (بني امیة) کو بێ ی هاتبا داخوازکرن دا خوە ل خەلکی کەتە مێهڤان، هەروەسا ئەڤ کەسە یێ ناڤدار بوو ب(طفیل العرائس). د فارسی ژی دا ئەڤ پەیڤە هەر بۆ وی کەسی دهێتە گۆتن کو بێ ی بهێتە داخوازکرن ل خەلکی ببتە مێهڤان، ئەڤجا چ ئەو بخوە ب تنێ بچت یان ژی دگەل مێهڤانەکێ داخوازکری بچت.

**طلا(Têla-Tela)**: زێڕ.

**طلای سفید(Telayê sêfîd)**: پلاتین.

**طلب(Teleb)**: فەرمانە ب خواستنێ(بخوازە)ـ دەمێ دگەل هندەک پەیڤا دهێت، ئانکویا داخوازکەر ددت، وەکی: (آزادی طلب = ئازادیخواز، صلح طلب = ئاشتیخواز).

**طلبنده(Telebendê)**: داخوازکەر.

**طلبیدن(Telebîden)**: خواستن.

**طلبیده(Telebîdê)**: داخوازکری.

**طناب(Tenab)**: وەریس.

**طناب باز(Tenab baz)**: کەسێ

کو لسەر وەریسی دهێت و دچت و هونەرێ خـوە ب ڤی رەنگی دیار دکت.

**طنبوری(Tenbûrî):** تەمبویرژەن.

**طنبی(Tenebî):** تەلار، ژۆرا مەزن.

**طنزکـردن(Tenzkerden):** تەعن لێدان، ترانەکرن.

**طنفـسـه(Tunfuse-Tenfese):** بنیـاتێ ڤێ پەیڤێ هەمـان پەیڤا (تنبسـه) یا فـارسی یە و ئانکو: رائێخ، هەر تشـتێ کـو بهێـتـە رائێـخـستن، وەکی: حـێـسـیل، بەڕک، مەحفویر و......هتد.

**طواف(Tevvaf):** د فـارسی دا بۆ وی کـەسی دهێـتـە گـۆتن یێ کـو خـواردەمەنی و فـێـقی دگەل خوە ل کـۆلان و بازاری بگێـرینت ژ بۆ فرۆتنێ.

**طوسی(Tûsî):** هەر تشـتێ کـو یێ بازێرێ (طوس) بت، کـو بازێرەکێ کەڤنێ ئیرانێ یە و دکەڤتە دەڤەرا خـوراسـان و لدەمێ هێـرشـێن مـەغـولیـان وێران بوویە و مـەزارێ فـیـردەوسـیێ شـاعـرێ مـەزنێ ئیرانی(خودانێ شەهنامێ) یێ لڤی جـهـی ـ رەنگی خـوەلیکی، فـیـلی یانژی رسـاسـی(ئانکو کـەسکێ دناڤ سـپـی ڤـەدای)ـ جـۆرەکێ شالایە.

**طوطی(Tûtî):** تۆتی، بەبەغا.

**طوطیک(Tûtîk):** کـورتکریا پەیڤا (طـوطـی)؛ تـۆتـیـک، تـۆتـی یـا بچویک، بەبەغایا بچویک.

**طـوطـی وار(Tûtîvar):** وەکـی تۆتیکا، ب رەنگێ تۆتیکا.

**طـولانـی(Tûlanî):** درێـژ، ب ڤەکێش.

**طول دادن(Tûl daden):** ڤەهێلان، تەئخیر د کارەکی دا کرن.

**طیاف(Tiyaf):** رەشاتی و تاریاتیا شەڤێ ـ د زمانێ فارسی دا واتایا «کابوس» ژی ددت.

**طیـره(Tîre):** د فـارسی دا ئانکو: پەریشـانی، دلتەنگی ـ پەریشـان، دلتەنگ ـ شەرمینی ـ شەرمین.



**ظ(Za)**: ئەڤ تیپە د زمانێ فارسی دا نینە و هەر پەیڤەکا ئەڤ تیپە د ناڤ دا بکار هاتبت، ئەو پەیڤ یا عەرەبی یە یان ژی پەیڤەکا لێکدای یان دارشتی یە ژ هەردو زمانێن عەرەبی و فارسی. بلێڤکرنا ڤێ تیپێ د زمانێ فارسی دا هەروەکی بلێڤکرنا تیپا (ز)ە.

**ظاهربین(Zahêrbîn)**: کەسێ کو تشتی ب سەرڤەسەرڤە دبینت.

**ظاهر ساز(Zahêrsaz)**: ئەو کەسێ کو رویێ سەرڤەیێ تشتی بخەملینت و نیشا مرۆڤی بدەت ژ بۆ بسەردابرن و خاپاندنا خەلکی.

**ظل زمین(Zêllê zemîn)**: وەک پەیڤ ئانکو: سیبەرا ئەردی، کو دڕکەیە ژ شەڤێ.

**ظلمانی(Zulmanî)**: زولومات، تاریاتی.

**ظلم پیشە(Zulm pîşê)**: زالم، ستەمکار، زۆردار.

**ظلمتکدە(Zulmetkedê)**: وەک پەیڤ ئانکو: جهێ تاری، و دڕکەیە ژ دنیایێ.

# ع

**ع(Eyn):** ئەڤ تیپە د زمانێ فارسی دا نینە و ئەو پەیڤێن کو ئەڤ تیپە د ناڤ دا بن، یان عەرەبی نە یان ژی پەیڤێن لێکدای یان دارشتینە ژ عەرەبی و فارسی.

**عابدانە(Abêdanê):** وەکی عابدا.

**عابدفریب(Abêdferîb):** ئەو تشت یان ئەو کەسێ کو خودێپەرێسی بخاپینت و ژ عیبادەتێ خودێ دویر بێخت.

**عاجز آمدن(Acêz ameden):** بێ هێز بوون، وەستیان.

**عاجزانە(Acêzanê):** ب بێ هێزی، ب سستی.

**عاجز ماندن(Acêz manden):** بنێرە: (عاجز آمدن).

**عاجز نواز(Acêz nevaz):** ئەو کەسێ کو هاریکاریا بێ هێز و وەستیایا بکەت.

**عادت دادن(Adet daden):** فێرکرن، عەلماندن.

**عادت کردن(Adet kerden):** فێربوون، عەلمتن.

**عادت گرفتن(Adet gêrêften):** بنێرە: (عادت کردن).

**عادلانە(Adêlanê):** دادگەرانە، ب عەدالەت ـ وەکی عادلا، وەکی دادگەرا.

**عاذر(Azer):** ناڤێ زەلامەکی یە کو دبێژن بێ ئیمان مربوو و عیسا پێغەمبەری ئەو پشتی چل روژا ساخ کرەڤە و پشتی ساخ بووی ئیمان ئینا.

**عارفانە(Arêfanê):** وەکی عارفا، وەکی خودێناسا.

**عاریت سرا(Arîyet sera):** درکەیە ژ دنیایا کو هەر دویماهیکا وێ پویچبوونە.

**عـــاشـــقـــانه(Aşêqanê):** وەکی عاشقا، عاشقانه.

**عـاشق باره(Aşêqbarê):** عـاشق پەرێس، کـەسێ کـو حـەژ عـاشـقـا بکەت.

**عـاشق پیشـه(Aşêqpîşê):** کەسێ کو کارێ وی عەشق و ئەڤین بت.

**عاقبت اندیش(Aqêbet endîş):** دویربین(کەسێ دویربین).

**عـــالم آرا(Alem ara):** یێ کـــو جیهانێ بخەملینت.

**عالم آشوب(Alem aşûb):** ئەوێ یان ئەوا کو جیـهـانیـان ب جوانیا خوە بسەردا ببەت.

**عـــالم افـــروز(Alem efrûz):** روهنکەرێ جیهانێ.

**عـالمیـان(Alemîyan):** کـۆمـا جـیـهـانیـا، هەمی کـەسێن کـو د جیهانێ دا دژین.

**عـــــــالی آوازه(Alî avazê):** خـــوەشـــخـــوان، دەنـگ خـــوەش ـ ناڤدار، ب ناڤ و دەنگ.

**عالیجاه(Alîcah):** پایەبەرز.

**عالی گهر(Alî guher):** پاک نەژاد.

**عـامـیـان(Amîyan):** د زمـانێ فـارسی دا ئانکو: هەمی خەلک ـ خەلکێن نەزان.

**عامیانه(Amîyanê):** وەکی هەمیا و وەکی خـەلکێ نەخـوەندەڤـا ـ ئاخفتنا کۆلانکی.

**عـــبـــادتخـــانه(Êbadetxanê):** پەرسگەهـ.

**عبادتکار(Êbadetkar):** کەسێ کو کارێ وی عیبادەت و پەراستن بت.

**عـــــبـــــادتـگاه(Êbadetgah):** پەرسگەهـ.

**عـبادت نما(Êbadet nema):** ئەو کەسێ کو ل پێش چاڤێن خەلکی عـیـبـادەتی بکت و هەردەم بناڤ چاڤـێن خـەلکی ڤـە بت کـو ئەز عیبادەتی دکم.

**عبـاسی(Ebbasî):** پارێ سەردەمێ شـاهـ عـەبباسێ مـەزن بوو کـو هەر پێنجی (عباسی) بەرامبەرێ ئێک (تومـان)ی بوون. و لســەردەمێ قـــەجـەرا چار(شـــاهی) یان ژی دوســـەد(دینار) بەرامـــبـــەری (عباسی)یەکی و پێنج (عباسی) بەرامبەری (قران)ەکی بوون.

**عجولانه(Ecûlanê):** بلەز و بەز.

**عـــدالت پیـــشـــه(Edaletpîşê):** دادگەر، دادڤان ـ عادل.

**عـــدالتـــخـــانه(Edaletxanê):** دادگەهـ، دادمال، دادسەرا.

**عـدالت گسـتـر(Edaletguster):** دادگەر، دادڤان ـ عادل.

**عـــــذر آوردن(Uzr averden):** هێـجـەت گـرتن، مـهـانه ئینان ـ داخوازا لێبورینێ کرن.

**عــذر خـواستن(Uzr xwasten):** داخوازا لێبورینێ کرن.

**عـــربانه(Erebane):** عـــەرەبە، عەرەبانە.

**عربدەجو(Erbedêcû):** شەرخواز ـ فتنەچی.

**عـرقـچین(Ereqçîn):** کـولاڤێ کـو دبن دەرســوکێ یان شــاشکێ ڤـە دکەنە سەرێ خوە.

**عرق خور(Ereqxor):** مەی ڤەخۆر.

**عرق سوز(Ereqsûz):** زریانا لەشی ژ بەر زێدە خوەهـ دانێ.

**عـروبیت(Urûbîyet):** ب زمـانێ عەرەبی ئاخفتن.

**عـروسک(Erûsek):** مـەنجـەنیق ـ کـورتکریا پەیڤـا (عـروس) ئانکو بـوبـکا بـچــــویـک ـ بـوبـکێـت لاسـتیکی کـو وەک پێ یاریک بۆ بچویکا دهێنە چێکرن.

**عـزاء(Eza’):** د زمـانێ فـارسی دا ئانکو: تازی، شینی ـ مسیبەت.

**عــزاخـانه(Ezaxanê):** مــال یان جهێ کو تازی لێ هاتبتە دانان.

**عزب خانه(Ezebxanê):** مالا کـو چەند زەلامێن زگورد تێدا بن.

**عـزلت(Uzlet):** خـوە ژ خــەلکی ڤەدەرکرن، خەلوەتنشینی.

**عـزوبت(Uzûbet):** زگـورد بوون، تنێ بوون، زەلامێ بێ ژن یان ژنا بێ مێر.

**عـسلی(Eselî):** هەر تشـتێ وەکی هنگڤینی چ ب رەنگێ خوە بت یان ب تـامــا خـوە ـ پەروکێ زەر کــو جـوهیا لسـەر ملێن خـوە دادنان ژ بۆیی کـو ژ مـوسلمانا جیاواز بن ـ طەبلە(مێزکێن بچویکێن کـو لبەر سینگێ قەنەپا دادنن).

**عشاق(Uşşaq):** کۆما ئەڤـیندارا ـ ناڤێ ئێـک ژ هـەر دوازدە مـەقـامێن موزیکا ئیرانی یە.

**عـشق آفـرین(Êşq aferîn):** هەر تشت یان کەسێ کو ب جوانیا خوە ئەڤینێ بێختە دلێ خەلک.

**عـشـقـبـاز(Êşqbaz):** ئەڤـیندار، کەسێ کو کارێ وی ئەڤینداری بت.

**عـصـرانه(Esranê):** خـوارنا دانێ ئێڤاری.

**عطرآگين(Etragîn):** پڕ گـولاڤ، دناڤ گولاڤێ ڤەدای، بێهنخوەش.

**عطر آميز(Etramîz):** ب گولاڤ ـ بێهنخوەش.

**عطسه(Etsê):** بێهنشک.

**عطسـهء صـبح(Etsêyê subh):** دڕکەیە ژ دیاربوون یان دەرکەفتنا سپێدێ.

**عطوفت(Utûfet):** خوەشتڤیاتی، خوشەویستی ـ میهرەبانی.

**عـقب افـتـاده(Eqeb uftadê):** پاشڤەمای، پاشکەفتی.

**عـقب مـانده(Eqeb mandê):** پاشڤەمای، پاشکەفتی ـ نەهاتی، بچویکێ کو نەی ساخلەم بت و ژ لایێ لەشی و عـەقلی ڤە پاشڤە مابت.

**عـقب نشـينی(Eqeb nêşînî):** پاشەکشەکرن، خوە پاشڤە کێشان(زاراوێ لەشکەری یە).

**عقدەگشا(Uqdêguşa):** کەسێ کو گرێیەکێ ڤەدکت یان ئاریشەکێ چارە دکت.

**عقربک(Eqrebek):** دوپشک ـ برین یان وەرمتنا کو لسەرێ تبلا دیار دبت و زێدە ب ئێشە ـ کولبوون و ئەداڤگرتنا بن نینوکێ کو دبتە ئەگەرێ هاڤێتنا نینوکێ ـ میلێ دەمژمێرێ.

**عـقـربه(Eqrebe-ê):** میلێ دەمژمێرێ.

**عكاس(Ekkas):** وێنەگر(مصوّر).

**عكاسی(Ekkasî):** وێنەگری.

**عكس(Eks):** قولپاندن، ڤاژیکرن ـ وێنە(وێنێ کو ب کامیرا فوتوگرافی هاتبتە گرتن).

**عـكـس بـرداری(Eksberdarî):** وێنەگری.

**علالا(Elala):** دەنگ و دۆر، هوسە و قەرەبالغ. هەروەسا (عللا و علالوش) ژی لکارن.

**علامت(Elamet):** نیشان، هێما ـ ئالا، عەلەم.

**علامت گذاری(Elametguzarî):** هێمادانان لبەر لێڤێن جادا یان لسەر سنوران.

**علفخوار(Elefxar):** هەر گیانەوەرێ کو خوارنا وی گیا بت.

**علک خاييدن(Êlk xayîden):** علک جویتن ـ دڕکەیە ژ ئاخفتنێن

بێهوده کرن.

**علمدار(Elemdar)**: ئالاهەلگر.

**علم شدن(Elem şuden)**: ناڤدار بوون، ب ناڤ و دەنگ کەتن.

**علن(Elen)**: ئاشکرا.

**عـمـارت(Êmaret)**: ئاڤاکـرن ـ ئاڤەدانی ـ خانی و ئاڤاهییێن بلند.

**عـمـده(Umde-ê)**: پالگەه، هەر تشتێ کو مرۆڤ پالا خوه بدەتێ ـ د زمانێ فارسی دا ئانکوا (ب کۆم و زێده) ژی ددت، وەکی: (عـمـده فـروش: کـەسێ کـو مـتـایەکی ب بهایێ ب کۆم بفرۆشت.).

**عم زاده(Emzadê)**: کـــورمـــام، پسمام.

**عـملگی(Emelêgî)**: کـارگـەری، پالەتی.

**عمله(Emele)**: د زمانێ فارسی دا ئانکو؛ کارگەر، پالە.

**عنبـرچه(Enberçê)**: قـالکەک بوو کـــو ژ زێری یان گـــەوهەرا دهاتە چێکرن و عـەنبـەر دکـرنە تێـدا و ژنکا بسـتـوبێ خوەڤـە دهلاویستن. هەروەســا پـەیڤــا (عـنبــرینه) ژی لکارە.

**عنتـر(Enter)**: کـەرمـوز ـ د فـارسی دا ناڤێ جـــورەکێ مــەیموینکایە. هەروەسا (انتر) ژی لکارە.

**عوارض(Evarêz)**: د زمانێ فارسی دا ئانکو باج و خەراجا کو زێدەتر ژ وی ئاستێ هاتیە دەستنیشانکرن ژ خەلکی بهێتە وەرگرتن.

**عــور(Ûr)**: د زمـــانێ فـــارسی دا ئانکو؛ رویس، تازی.

**عوعو(Û Û)**: دەنگێ رەوینا سەی.

**عیـالدار(Êyaldar)**: زەلامێ ب ژن و زاروک.

**عــیــالمند(Êyalmend)**: بنێــڕە: (عیالدار).

**عیـالوار(Êyalvar)**: کەسێ کـو ژن هەبت و زاروک ژی گەلەک هەبن.

**عیب دار(Êyb dar)**: عـێـبـەلو، ب عێب.

**عیبناک(Êybnak)**: بنێڕە: (عیب دار).

**عیدگاه(Êydgah)**: جهێ جەژن لێ ـ رۆژا جـەژنێ ـ جـهێ کـو نڤـێـژا جەژنێ لێ بهێتە کرن.

**عینک(Ê-Eynek)**: بەرچاڤک.



**غ(Xeyn):** تیپا بیست و دووێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی. ئەڤ تیپە د هەردو زمانێن عەرەبی و فارسی دا هەیە و د زمانێ فارسی دا هندەک جارا دبیتە (گ)، وەکی (آغوش = آگوش: همبێز، یان؛ زغال = زگال: رەژی و.........هتد).
ژ بەر نەبوونا تیپەکا تایبەت د رێنڤیسا لاتینی دا کو دەنگێ (غ) بدەت، ژ نەچاری مە (X) بکارئینایە.. هەرچەندە د زمانێ فارسی دا بلێڤکرنا وێ تیپێ مینا بلێڤکرنا هەمان تیپێ یە د زمانێ عەرەبی دا.

**غارج(Xarêc- Xarec):** مەی، مەیا کو سپێدەهی یا ڤەدخون.

**غارغار(Xarxar):** دەنگێ قرێ، دەنگێ قەلێ.

**غاروغور(Xaro xûr):** دەنگ و دور و قەرەبالغ.

**غاز(Xaz):** قاز(فرندەکە) ـ ل سەردەمێن کەڤن و هەتا دەستپێکا سەردەمێ قاجاریا ناڤێ بچویکترین یانژی کێمترین پارەی بوو، کو ئێک «قران» دبوو بیست «شاهی»، و هەر «شاهی»یەک دبوو دو «پول» و هەر «پول»ەک دبوو دو «جندک» و هەر «جندک»ەک ژ نوی دبوو دو «غاز» ـ پنیکێت کو دبەنە جلکێن دریای.

**غازە(Xaze):** سۆراڤا کو ژنک ل رویێ خوە ددەن.

**غاش(Xaş):** عاشق، ئەڤیندار ـ ب سەرداچووی، خاپاندی، حیلە لێ بووی ـ بێ دەماغ، مەژی رەش، دەبەنگ.

**غال(Xal):** شکەفت ـ هەڤشیێ پەزی

ل چیای ـ کون یان هێلینا رویڤی و تویری و گیانەوەرێن مینا وان.

**غـالوک(Xalûk):** گلولکێت بەری یان تەقنێ.

**غـالیـدن(Xalîden):** گرێل بوون ـ خـوە قـەلپ دان ژ کـێلەکـەکێ بۆ یا دیتر ـ تێ هوسین.

**غـامی(Xamî):** لاواز، لاغـەر، بێ هێز.

**غاو(Xav):** بنێرە: (غال).

**غاوش(Xaveş- Xavuş):** خیارێ کو بۆ تۆڤی هاتبیتە هەلگرتن.

**غـاوشنگ(Xavşeng):** دارەکە کـو سیـخـەکـا ئاسنی ب سـەرەکێ وی ڤـەدکـەن و کـەر و چێل و گـۆلا پێ دهاژۆن.

**غباز(Xebaz):** دارێ کو شڤان کەر و چێل و گۆلا پێ دهاژۆت.

**غت(Xut- Xet):** نەزان، دەبەنگ، هەبلە ـ ئەحمەق.

**غتفر(Xutfer):** بنێرە: (غت).

**غـدغـد(Xudxud):** دەنگێ قـدقـدا مریشکێ.

**غدنگ(Xedeng):** بنێرە: (غت)ـ کـەسێ کـو ب رویێ خـوە یان ب بەژن و بالا خوەڤە ئی کرێت بت.

**غــر(Xur):** رطلوبی، زەلامێ کـــو ئێشا «فتق» لێ بت.

**غــر(Xer):** ژنکا دەهمـــەن پیس، قەحبە ـ مروڤێ نێرامێ.

**غر(Xur):** ئاخفتنا د بن لێڤانڤە ل دەمێ تورەبوونێ.

**غرابە(Xerabe):** شیشـە یان بطلێ مەزن و دەر تەنگ.

**غراره(Xerare):** غـەرغـەرا ئاڤێ د دەڤی دا ب ئنیەتا پاقـژکـرنا دەڤی یان گەورییێ.

**غــــراش(Xeraş):** کــــەلداچووی، سەلخی ـ تورە و خەمگین بووی.

**غراشیـدن(Xeraşîden):** سەلخین، کەلداچوون ـ تورە بوون ـ خەمگین بوون.

**غــربچـە(Xerbeçê):** خـەبەر یان جنێـوەکـە کـو د کـوردی دا دبیــتـە بەرامبەر: کورێ قەحبێ.

**غرت(Xurt):** قورچ(قورچا ئاڤێ).

**غـــرچە(Xerçe):** نـەزان، دەبەنـگ، هەبلە ـ ئەحمەق ـ مرۆڤێ نێرامێ.

**غرده(Xerde):** عەرەبانە، عەرەبە.

**غـرزدن(Xurzeden):** ئاخـفـتنێن د بن لێـڤـاڤنە ل دەمێ تورە بوونـێ ـ ب ســەردابرن یان خـاپاندنا ژنـکێ

یان کچکێ ب ئنیەتا هندێ کو زەلام کارێ گوهنێلییێ دگەل بکەت.

**غرزن(Xerzen):** ژنکا دەهمەن پیس، قەحبە ـ زەلامێ کو ژنکا وی قەحبە بت.

**غرس(Xers- Xeres):** قەهرین، تورەبوون.

**غرش(Xurrêş):** دەنگێن ترسناک، وەکی دەنگێ گیانەوەرێن درندە، یان دەنگێ عەورا.

**غرشت(Xurrêşt):** بنێرە: (غرش).

**غرشمار(Xêrêşmar):** قەرەچ، هوستا.

**غرغرە(Xerxere):** گەوری.

**غرغشە(Xerxeşe):** قەرقەشە، شەرەدەڤ، جرە، جەدەل، گنگاشە، دان و ستاندن.

**غرم(Xurm):** پەزکویڤی.

**غرمان(Xerman):** تورە، عێجز ـ خەمگین.

**غرمیدن(Xermîden):** تورەبوون، عێجزبوون ـ خەبەرگوتن، جنێودان.

**غرن(Xeren):** دەنگێ گری و زێماری.

**غرنبیدن(Xurunbîden):** قێری قەدان ـ دەنگێ بۆل بۆلێ ژ خوە دەرانین.

**غرند(Xerend):** کچا کو ل شەڤا بویکانییێ دیار ببیت کو نە کچە.

**غرنگ(Xereng):** بنێرە: (غرن).

**غرنگیدن(Xerengîden):** گرین، زێمارکرن.

**غرو(Xerv):** لەڤەن.

**غرە(Xurre):** دەنگێن ب ترس، نرڕێنا گیانەوەرێن درندە ـ دەنگێ عەورا.

**غریدن(Xurrîden):** لێ خورین ب دەنگێ ترسناک ـ نرڕین.

**غریو(Xerîv):** بنێرە: (غرە).

**غریویدن(Xerîvîden):** بنێرە: (غریدن).

**غزە(Xeze):** بنێ کوریا گیانەوەرێن ب کوری.

**غژب(Xujb):** تلیا تری.

**غژک(Xejek- Xêjek):** جورەکێ کەمانچێ یە.

**غژم(Xujm):** تلیا تری ـ قەهر، غەزەب ـ هێرش.

**غژیدن(Xejîden):** خوشکین، ل سەر زکی برێڤە چوون.

**غشاک(Xeşak):** بێهنا پیس، بێهنا گەنی، بێهنا پیسا کو ژ

دەڤی دهێت.

**غـشـغـرغ(Xêşxêrêx)**: هەوار و قێڕی ـ جڕە و جەدەل.

**غفج(Xefc- Xufc)**: حەود، چال، هەر تشتێ کو ئاڤ تێدا خڕڤە بیت ـ سندانێ ئاسنگەرا.

**غک(Xek- Xuk)**: قوت، کورتک ـ قەلەو ـ کەسێ کورتک و قەلەو و بەژن و بال کرێت.

**غـلـبـکـن(Xelbeken)**: دەروکـێ کونکونیشک.

**غلپ(Xulup)**: قـورچ(قـورچەکـا ئاڤێ).

**غلت(Xelt)**: خـــوە قـــەلپ دان ژ کێلەکەکێ بو یا دیتر.

**غلت(Xêllet)**: ستویراتی.

**غلتـــاندن(Xeltanden)**: گـــرێل کرن، قەلپ دان سەر کێلەکێ.

**غلتـبـان(Xeltban)**: باگــوردان ـ زەلامێ بێ غیرەت کو بندەستی ژنا خوە بت.

**غلتک(Xeltek)**: باگوردان.

**غلتیدن(Xeltîden)**: گرێل بوون.

**غـلـج(Xelc)**: گــــرێ، گـــــرێ حشک(گرێیا ئاسێ کو ب ساناهی نەڤەبیت).

**غلچـە(Xelçe)**: گـوندی، مــرۆڤێ گوندی.

**غـلـغـل(Xulxul)**: دەنـگ و دور، قـیژقـیـژا فـڕندا ـ دەنگێ کـەلینا ئاڤێ یان هەر تشتەکێ وەکی وێ ـ بلقـبلق(دەنگێ کــو ژ ئاڤێ دهێت دەمێ ژ گوزکی ڤالە دکەن).

**غلغلک(Xulxulek)**: گـــوزکێ بچـویک کــو لویلیــا وی زراڤ و درێژ بت.

**غلغلک(Xêlxêlek)**: گلیزانک.

**غلغـونە(Xulxunê)**: سـۆراڤـا کـو ژنک ل رویێ خوە ددەن.

**غلفج(Xelfec)**: زرکـــێـــتـک، ستێنک، مێشا هنگڤینی.

**غلک(Xullek)**: قـاسـا بچـویک بۆ پارا.

**غلندوش(Xelendûş)**: قلیقدانک.

**غلیــز(Xe-Xêlîz)**: گلیــز، ئاڤــا دەڤی.

**غلیزبند(Xelîzbend)**: بەرگلیزکێ بچویکا.

**غـنـبـە(Xunbe)**: لێ خــورین، لێ حەیتاندن ژ قەهر ڤە.

**غـنپـــز(Xunpuz)**: ئاخـــفـــتنێن بێهودە.

**غنج(Xenc):** جـهـال ـ سـۆراف ـ تێشکێت پێشکا کو هێشتا وەکی کـرمکانە ـ ئاتافـەکێ سـێڤ و باجانسورک و پەمبی یە.

**غنج(Xunc):** غونچە، بشکوژ.

**غنجار(Xencar):** سۆراف.

**غنجال(Xencal):** فـێـقـیێ کـاڵ و نەگەهشـتی کو هێـشـتـا تام ترش بیت.

**غنجر(Xencer):** سۆراف.

**غنجموش(Xencmûş):** بەق.

**غنچە(Xunçe):** غـونچە، بـشکوژ، گولا کو هێشتا باش نەڤەبووی.

**غنچە پیشانی(Xunçe pîşanî):** دڕکـەیە ژ مـرۆڤێ ئەنی گـرێ و برە تێکچۆی.

**غنچە خسب(Xunçe xesb):** کەسێ کـو ل دەمێ نـڤـستنێ خـوە بکەتە تێکرا ژ بەر سرێ و نەبوونا نڤینکا.

**غنچەدل(Xunçe dêl):** دلتـەنگ، پەریشان، مەلویل.

**غنچــە دهان(Xunçe dehan):** دڕکەیە ژ دلبەرا جوان کـو دەڤێ وێ مینا بشکوژێن گولا بت.

**غنچــەء کــبک دری(Xunçeyê kebk derî):** ناڤێ ئاوازەکێ یە ژ سیهـ ئاوازێن باربەدی.

**غندرود(Xundrûd):** زڕنا، بۆق.

**غندە(Xunde):** تەڤنپــیــرک، داپیــروشک ـ گلولک، بۆ ڤێ ئانکویێ پەیڤێن (باغندە، باغند، پاغندە، پاغـند، غـندش، کـندش، پنجک، بندک، بندش و بنجش) ژی لکارن.

**غنو(Xunû):** نـڤـسـتی، د خـەو (بەروڤاژی هشیاریێ).

**غنودن(Xunûden):** دخـەوچوون، نڤستن.

**غنوند(Xunvend):** پەیمان، سوز ـ مەرج(شرط).

**غنویدن(Xunevîden):** بنێــرە: (غنودن).

**غنینە(Xenîne):** شـان(شـانا زرکێتکێ یان مێشا هنگڤینی).

**غـو(Xev):** قـیـژی، قـێـری، فـریاد، دەنگ یان ئاوازێن بلند.

**غورباغە(Xurbaxê):** بەق.

**غـورمگس(Xurmeges):** مـێـشـا کەسک.

**غـورە(Xure-ê):** تریێ بێـسـیـرە، تریێ نەگەهشتی.

**غوری(Xurî):** قوریک، چاپەز.

**غـوز(Xûz):** قلۆز، قـۆز(پشت قلوز، پشت قۆز).

**غوزک(Xûzek):** گوزەکا پێی.

**غوزە(Xûze):** پەمبیێ کو هێشتا ژ ناڤ قەلپیشکی نەئینابنەدەر.

**غـوش(Xûş):** هەسـپێ شـاهی کـو زینکری و ئامـادە بیت ل بەر دەرێ بارەگەهێ شاهی ـ دارەکێ رەقە کو تیـروک و تەشـیکا ژێ چێدکـەن ـ پشـکل(کـوشـپل)ێن گـیـانەوەرا ـ گوهـ ـ رویس، تازی.

**غـوشـا(Xûşa):** پشـکل یـان ریخـا هشـک بووی ـ ئویشـــیێ هشـک بوویێ گەنم یان جەهی.

**غوشت(Xûşt):** رویس، تازی.

**غوشە(Xûşe-ê):** ئویشی.

**غوک(Xûk):** بەق.

**غـــوک چوپ(Xûk çûb):** هەر دو دارکـێن کـو بچـویـک بۆ خـوە یـاریا «ترانێ» پێ دکەن.

**غـولە(Xûle):** خـاڤ، نەگـەهشـتی ـ بێ عاقل، دەبەنگ.

**غولین(Xûlîn):** جێرکێ دو چمبلک، گوزکێ دەر فرەهـ.

**غیشە(Xîşe):** قەرەم، گیاحێسیل.

# ف

**ف(Fa):** ئەڤ تیپە، تیپا بیست و سێیێ یە ژ ئەلفابێ یا زمانێ فارسی. ل هندەک جهان دبیتە (پ)، وەکی: (فرمان = پرمان: فەرمان، ئەمر) یان (سفید = سپید: سپی) و ل هندەک جهێن دی دبیتە (و)، وەکی: (افکندن = اوکندن: ئێخستن) یان (یافە = یاوە: بێهودە، بێ مەعنە).

**فا(Fa):** تیپا کو ل شوینا (با، بە) دهێت و ئانکویا (دگەل ـ ڤێ) ددەت، بۆ نموونە: (فا او رەفت = با او رفت: دگەل وی چو) یان ؛(فا او(فاو)داد = بە او داد: دا ڤێ، دا ڤ وی). ل شوینا پێشگرێ (وا) ژی دهێت، وەکی: (فاداشتن = واداشتن: مەجبورکرن کو ب ئەنجامدانا کارەکی رابیت).

**فاتوریدن(Fatûrîden):** دویربوون، خوە دویرکرن، وەلاچوون، خوە دانە پاش، رەڤین.

**فاجە(Face):** باوشکێن خەوێ، نوقرسکێن خەوێ.

**فاخیدن(Faxîden):** چنین و ژێڤەکرن.

**فادوسیدن(Fadûsîden):** پێڤەنویسیان.

**فاریدن(Farîden):** داعویران، دابلعاندن.

**فاژ(Faj):** باوشکێن خەوێ، نوقرسکێن خەوێ.

**فافا(Fafa):** دەلال، جوان، کەشخە.

**فام(Fam):** پاشگرەکە ل دویماهیا هندەک پەیڤا دهێت و ئانکویا (رەنگ) ددەت، وەکی: (سیەفام: رەنگ رەش) ـ دەین، قەر.

**فانە(Fane):** سپێنە.

**فاوا(Fawa)**: رسوا.

**فتاليدن(Fetalîden)**: كەلاشتن ـ دراندن ـ پەلاتەكرن، بەلاڤكرن.

**فتەردن(Feterden)**: بنێرە: (فتاليدن).

**فتە(Fete)**: پێهێل، بليت(كارتا چوونەژۆرێ).

**فچفچە(Fuçfuçe)**: پست پست، نم نم.

**فخفرە(Fexfere)**: سڤى ئار ـ پينە ـ هويركە نان.

**فخميدن(Fexmîden)**: داڤوتانا پەمبى.

**فخن(Fexn)**: ناڤا بيستانى.

**فدرنجک(Fedrencek)**: كابويس.

**فدرە(Fedre)**: حێسيل(حێسيلا كو لسەر بانى رادئێخن).

**فر(Fer)**: مەزناهى ـ پايەبلند، پايەبەرز ـ جوانى ـ هێژايى ـ رۆناكى.

**فرا(Fera)**: پێشگرە كو لسەرێ هندەک پەيڤا دهێت و ئانكوبێن (رەخ، ئالى ـ نک، جەم، نێزيک ـ لسەر، سلال) ددەت.

**فرابر(Feraber)**: ئەو جە ژ ڤيتڤى كو بەرک تێدا بيت.

**فرابردن(Feraburden)**: پێشدابرن، پێشڤەبرن.

**فراپايە(Ferapayê)**: پايەبەرز، پايەبلند.

**فراپوش(Ferapûş)**: بێ هش.

**فراتر(Ferater)**: پێشتر ـ نێزيكتر ـ بلندتر ـ سلال تر.

**فراچنگ(Feraçeng)**: د ناڤ دەستان دا.

**فراخ(Ferax)**: فرەھ ـ بەرفرەھ، پەحن، بەرين.

**فراخور(Feraxor)**: ژ هەژى، بسەرڤە، لايق.

**فراخە(Feraxe)**: لەرزين، هەژيان.

**فراخيدن(Feraxîden)**: سيخ بوونا مووى د لەشى را ـ ژ هەڤ جودابوون ـ فرەھ بوون.

**فرارسيدن(Ferarêsîden)**: گەهشتن، نێزيک بوون.

**فرارفتن(Ferareften)**: چۆن، پێشڤەچۆن.

**فرارون(Ferarûn)**: باش، قەنج ـ بلند ـ راست، بێ چەپ و چوير ـ دەهمەن پاک ـ قەنجى كار ـ راستگو.

**فراز(Feraz)**: ئەڤرازى.

**فـــــرازانيـــــدن(Ferazanîden)**: هلدان، بلندكـــــرن ـ هلكرنا روناهيێ، هلكرنا ئاگرى.

**فـــــرازيدن(Ferazîden)**: هلدان، بلندكرن ـ ڤـەكرن(بەروڤاژى پەيڤا «گرتن»).

**فـراشـتـوک(Feraştok)**: حـاجى رەشک(فرندەكە).

**فراشيدن(Ferașîden)**: رەجفكێن بەرى تا بهێتە مرۆڤى.

**فـراک(Furak)**: ل پشت، ل پاش ـ سەرژنک ـ پيس.

**فراموش(Feramûş)**: ژ بير كرى.

**فـرامـوشـيـدن(Feramûşîden)**: ژ بيركرن، ژ بير برن.

**فرامون(Feramûn)**: دورماندور.

**فـراوان(Feravan)**: فـراوان، زێدە، گەلەک، مشە.

**فـراورده(Feraverdê)**: كـۆمكرى، خرڤەكرى.

**فـــــراهم(Ferahem)**: ئامـــــادە، بەرهەڤ.

**فـراهيـختن(Ferahîxten)**: ئەدەب كرن، تەربيەتكرن.

**فربه(Ferbêh)**: قەلەو، بخوەڤە، ب گۆشت.

**فرت فرت(Fêrt fêrt)**: حێل حێل، توند توند، زوى زوى، بلەز.

**فـرتوت(Fertût)**: گـەلەک پيـر، كـەڤنار، بناڤ سـالڤـە چووى و ژ كار كەفتى.

**فرجاد(Fercad)**: زانا.

**فــرجـــام(Fercam)**: ئەنجـــام، دويماهيک، عقوبەت.

**فـرجمند(Fercmend)**: ب قـەدر، بەرێز.

**فرچه(Fêrçe)**: فرچێ ريها.

**فرخ(Ferrux)**: پيـروز، مـوبارەک ـ روى دەلال.

**فـرخـار(Ferxar)**: دێر ـ پەرسگەهـ، بوتخـــانە ـ ناڤێ باژێرەكى يە ل «تبت» كــــو بوتخـــانێن وێ د ناڤدارن.

**فـرخـاگ(Ferxag)**: قـەلى هێک. هەروەسا (فرخواگ) ژى دنڤيسن.

**فرخج(Ferexc)**: كرێت، پيس.

**فـــرخنج(Ferxenc)**: كــەيف و خـوەشى ـ شـەنس، بەخت، باهر، نەصيب.

**فـــرخنده(Ferxundê)**: بنێــــرە: (فرخ).

**فرخو(Ferxû)**: كەزاخە.

**فـــــرخـــــــویدن(Ferxevîden)**: کەزاختن.

**فردا(Ferda)**: سوباهی، سوبە.

**فرز(Fêrz)**: چست، چالاک، سرت.

**فرزام(Ferzam)**: هێژا، بسەرڤە، شایستە، لایق.

**فرزان(Ferzan)**: زانا، ب ژیر.

**فـرزانە(Ferzanê)**: زانا، عـاقل، ب ژیر ـ شـەریف ـ رەسـەن، پاک نەژاد.

**فـرزند(Ferzend)**: عـەیال، کـوڕ و کچێن مرۆڤی.

**فرزین(Ferzîn)**: د یاریا شەترەنجێ دا موهرکا وەزیری یە.

**فرسپ(Feresp)**: کاریتە.

**فرستادن(Fêrêstaden)**: هنارتن، رەوانەکرن.

**فـرستە(Fêrêste)**: هنێـر، هنارتی، پێغەمبەر ـ بالیوز، سەفیر.

**فـرسنگ(Ferseng)**: بۆ پیـڤـانێ بکار دهێت و بەرامبـەری نێـزیکی شەش کیلومەترایە.

**فرسودن(Fersûden)**: ڤێک کەفتن و پویچ بوون ـ کەڤن بوون ـ پێـتی بوون.

**فرشتە(Fêrêştê)**: فریشتە.

**فرشە(Furşe)**: فری(فریێ شیری).

**فـرغــار(Ferxar)**: تەڕبـووی، شل بووی ـ تێڤەدای.

**فرغاریدن(Ferxarîden)**: تەڕکرن، شل کرن ـ تێڤەدان ـ هەڤیرکرن.

**فـرغــانج(Ferxanec)**: چێـل یان ماکەر یان هێسترا قەلەو.

**فرغر(Ferxer)**: جۆکا ئاڤێ ـ چالا ئاڤێ ـ هشکەرۆ.

**فــرغــردن(Ferxerden)**: بنێــرە: (فرغاریدن).

**فرغند(Ferxend)**: گـیـایەکـە خـوە لـدور دارا دئـالـیـنـیـت، ب ڤـێ ئانکویێ (عـشـقـە) ژێ لکارە ـ پیس، گەنی، بێهن نەخوەش.

**فـرغـول(Ferxûl)**: درەنگ کـرن د کـاری دا، خـوە ڤـەهێـلان ژ کـاری، تشت پشت گوه ئاڤێتن.

**فــرغــیش(Ferxîş)**: کـەڤن، پـویچ بووی.

**فرفر(Fêrfêr)**: کـارێن بلەز و بەز وەکی خواندن و نڤیسینێ.

**فرفرە(Fêrfêrê)**: بنێرە: (فـرفـر)ـ فـرفـرۆک، پەروانە، هەر تشـتـەکێ سـڤک و پەڕدار کـو ب هێـزا بای لدور خوە بزڤریت.

**فرکن(Ferken):** کارێز.

**فرگرد(Fergerd):** پشکەک ژ پەرتوکێ ـ هەر ئێک ژ پشکێن ڤەندیدادێ(بنێرە: وندیداد).

**فرم(Ferem):** خەم، کوڤان ـ دلتەنگی، پەریشانی.

**فرمان(Ferman):** فەرمان، دەستوور ـ ستێرنێ ترومبێلێ.

**فرمگن(Feremgên):** خەمگین، کوڤاندار.

**فرمودن(Fermûden):** فەرمان دان، دەستووردان، ئەمرکرن، ئاخفتن.

**فرموشیدن(Fermûşîden):** ژ بیرکرن.

**فرناد(Fernad):** پەیاڤ، جهێن کێم ئاڤ یان نەی کویر ل رووبار و دەریایا.

**فرناس(Fernas):** نەزان ـ خەوتە.

**فرنج(Furunc):** دورماندوری دەڤی.

**فرنج(Ferenc):** کویشەکرن.

**فرنگ(Fereng):** ئەورووپا، ب تایبەتی وەلاتێ فرەنسا.

**فرو(Furû):** پێشگرەکە کو لسەرێ هندەک پەیڤا دهێت و ئانکوێن (نشیڤ، خوار) ددەت، وەکی: (فروآمدن: ژۆردا هاتنە خوار ـ فروبردن: برنە خوارێ یان داعویران).

**فروار(Fervar):** خانی یێن هاڤینی.

**فروپوشیدن(Furûpûşîden):** ڤەشارتن.

**فروتر(Furûter):** نشیڤ تر، خوارتر.

**فروخت(Furûxt):** فرۆت.

**فروختار(Furûxtar):** کەسێ کو تشتا دفروشیت، فرۆشەر.

**فروختن(Furûxten):** فرۆتن.

**فرود(Furûd):** بن، ژێر ـ نشیڤ، خوار ـ د زاراوێ فیزیکێ دا ئانکو جەمسەرێ نێگەتیڤ یێ کەهرەبێ.

**فرودگاه(Furûdgah):** جهێ هاتنە خوارێ، فرۆکخانە.

**فرودین(Furûdîn):** ژێرین ـ نشیڤتر، خوارتر.

**فروردگان(Ferverdgan):** وەرزێ بهارێ ـ جەژنا کو ئیرانیا ل پێنج روژێن دویماهیا سالێ یان پێنج روژێن سەرێ(دەستپێکا) سالێ دگێران ـ هەروەسا جەژنا کو ل رۆژا

نوزده‌ی فه‌رڤه‌ردینێ دگێڕان.

**فـــروردین(Ferverdîn):** هه‌یڤـــا ئێکێ یه ژ سالا هه‌تاڤی ـ هه‌یڤا ئێکێ یه ژ وه‌رزێ بهـــارێ ـ رۆژا نوزدێ یه ژ هه‌می هه‌یڤـێن ســالا هه‌تاڤی.

**فــروز(Furûz):** رۆناهی، رۆناکی، گه‌شاتی.

**فــروزاندن(Furûzanden):** رۆهن کرن، گه‌شکرن.

**فــــروزیدن(Furûzîden):** رۆهن بوون، رۆناکبوون، گه‌شبوون.

**فـروزینه(Furûzînê):** هه‌ر تشـتێ کـو ئاگر پێ بهێـته هه‌لکرن وه‌کی پویش و په‌له‌خی.

**فروستردن(Furûsuturden):** پاک کرن، پاقژکرن.

**فــروشک(Furûşek):** دانقــوت ـ ساڤار.

**فروشگاه(Furûşgah):** فرۆشگه‌ه.

**فروشیدن(Furûşîden):** فرۆتن.

**فــروغ(Furûx):** رۆناهی، شــه‌وقــا تاڤێ یان ئاگری.

**فــــرومــــاندن(Furûmanden):** بێــچـاره بوون، وه‌ســتـیـــان، بێ هێزبوون.

**فــرومـــایه(Furûmayê):** پویچ، نه‌زان، طبــعـــه‌ت پیس، زه‌لیل، خه‌سیس.

**فــــرومــــــردن(Furûmorden):** ته‌مـرین، ڤـه‌مـرین(وه‌کی ته‌مـرینا ئاگری یان ڤه‌مراندنا چراکا).

**فروند(Fervend):** که‌لـه ـ مه‌یدان ـ دارێ کـو دادنته پشت ده‌روکی دا نه‌ڤـه‌بیت ـ یه‌کـا هژمـارتنێ یه بۆ که‌شتی یا یان فرۆکا.

**فــرونشــاندن(Furûnêşanden):** ئینانه‌خوار ـ ته‌مراندن، ڤه‌مراندن ـ کـێم کرنا گـه‌رمهێ یان دژواریێ ـ هێدی کرن، ئارام کرن.

**فــروهر(Ferevehr - Furûher):** د ئایینێ زه‌رده‌شــتی دا هویرکــێن بچـویکن ژ نویرها ئاهورامه‌زدای و د هه‌بوونا هه‌ر کـه‌ســه‌کی دا هاتیـه دانـان و کــــــارێ وێ به‌لاڤـکرنـا نویرهێ و نیشـادانا رێکا راسته و پشتی مرۆڤ دمرت، که‌له‌خ دمینت د جه دا و ئه‌و روناهی رێکا سلال دگــرته بـه‌ر و خــوه دگــه‌هینتــه سـه‌روکـانیـا خوه یا سـه‌ره‌کی و ل ڤێره ته‌نها گیان یان روح دمینیت کـو دگه‌هتـه سزایێ کردارێن خوه

پێن باش و خراب. ئەڤ (فروهر)ە سالێ جارەکێ دهێنە سەر ئەردی و ئەو ژی دکەڤتە د وێ روژێ دا یا کو جەژنا (فروردینگان) تێدا دهێتە گێران، کو ئەڤ جەژنە دهێتە گێران ژ بەر بیرئینانەڤا گیانێن وان کەسێن کو مرین.

**فروهیده(Fervehîde)**: عاقل، ب ژیر، زانا.

**فرویش(Fervîş)**: ڤەهێلان یان ئیهمال د کاری دا ـ گیرۆکرن.

**فره(Fêrêh)**: زێدە، فراوان، گەلەک، مشە ـ باش، قەنج، پەسەندکری.

**فره(Ferre)**: مەزناهی ـ هێز، زاخ.

**فرهختن(Ferhexten)**: تەربیەت کرن، ئەدەب کرن.

**فرهست(Ferhest)**: زێدە، گەلەک، مشە ـ جادوو، سێحر.

**فرهنجه(Ferhence)**: ب ئەدەب، ب تورە، طبعەت باش.

**فرهنجیدن(Ferhencîden)**: بنێرە: (فرهختن).

**فرهنگ(Ferheng)**: زانست ـ تۆرە ـ پەروەردە و فێرکرن ـ فولکلور ـ کەلتور ـ شوین مایێن زانستی یان تۆرەیی یێن هەر مللەتەکی ـ قاموس، فەرهەنگ.

**فرهنگستان(Ferhengêstan)**: قوتابخانە، جهێ کو لێ فێری زانستا بن و بهێنە پەروەردەکرن ـ ئێکەتی یان کومەلا زانا و نڤیسەرێن مەزن.

**فرهنگ نویس(Ferheng nêvîs)**: قاموس دانەر.

**فرەوش(Fereveş)**: بنێرە: (فروهر).

**فری(Ferî)**: ئافەرین.

**فریاد(Feryad)**: فریاد، ئاوازێن بلند، دەنگێن بلند.

**فریب(Ferîb)**: فێل، حیلە.

**فریبا(Ferîba)**: فێلباز، حیلەکەر ـ هەروەسا یا کو فێل لێ هاتبیتە کرن، ب سەرداچووی، خاپاندی.

**فریبانیدن(Ferîbanîden)**: حیلەکرن، ب سەردابرن، خاپاندن.

**فریبرز(Ferîburz)**: خوەش بەژن و بال، بالابلند، بالابەرز.

**فریز(Fêrîz)**: فریز.

**فریش(Ferîş)**: بنێرە: (فری)ـ پەریشان ـ بژالە ـ بسەرداگرتن و تالان کرن.

**فـــــریش(Fêrîş):** رائیّخ، وەکی: (بەرکـا و مـەحـفـویرا و جـهـێ نقستنێ و...... هتد).

**فـریفـتـار(Ferîftar):** فـێلبـاز، حیلەکەر.

**فریفتن(Ferîften):** حـیلەکـرن، ب سـەردابرن، خـاپاندن ـ ترانە پێ کرن، یاری پێ کرن.

**فـریە(Ferye- Ferîh):** نفـرین، دوعایێن خراب، نەعلەت(لعنت).

**فزایش(Fezayêş):** زێدەهی.

**فزاییدن(Fezayîden):** زێدەکرن.

**فزون(Fuzûn):** زێدە، گەلەک.

**فژ(Fej):** کێم، عەداڤ.

**فژ(Fuj):** موێێن پاتکا هەسپی.

**فـسان(Fesan):** هەسـان، بەرێ کـو کێر و شیرا پێ خوەش دکەن(تیژ دکەن ئان سەقا دکەن).

**فـــســـانە(Fesane):** ئەفـســـانە، چیڤانوک، چیروک، داستان.

**فسانیدن(Fesanîden):** هوسین، تیژکرن، سەقاکرن، خوەشکرن.

**فــــســـرانیـــدن(Fusuranîden):** قەرساندن، جەمداندن.

**فــــــســــــردن(Fe-Fusurden):** قــەرسین، جــەمــدین، بەستن ـ قورمچین، تێکچوون.

**فسوس(Fusûs):** مخابن، بەداخەوە ـ خـەم و کـوڤـان ـ پێ کـەنین ب ئنیەتا یاری پێکرنێ(استهزاء).

**فـســون(Fusûn):** حـیلە، فـێـل ـ قـەلپ، سـەختـە ـ ئەو پەیڤێن کـو جـادوگـەر دبێـژن ل دەمێ کـو ب کارێ جادوگەریێ رادبن.

**فـسـونگر(Fusûnger):** جادوگـەر، سێحرەبەند.

**فش(Feş):** پاشگرەکـــە و ئانکوا (وەک، وەکـــی) ددت، وەکـــی: (شیرفش: وەکی شێری).

**فش(Fuş):** مویێ پاتکا هەسپی.

**فـشار(Fêşar):** فـشـار، گرانیـا کـو دکەڤتە سەر تشتەکی.

**فـشـست(Fêşşest):** دەنگێ کـو ژ ماری دهێت ل دەمێ هێرشکرنێ.

**فشنگ(Fêşeng):** فیشەک، گوللە.

**فغ(Fe-Fux):** بوت، صــــەنەم ـ دلبەر، مەعشوق.

**فغاک(Fe-Fuxak):** نەزان، هەبلە ـ ئەحمەق ـ بیژە، حەرامزادە.

**فغان(Fexan):** ئاخینک ـ زێمار ـ هەوار، فریاد.

**فغفور(Fexfûr):** کورێ خودێ(ئەڤە

نازناڤـەک بوو کـو ل سـەردەمـێن کەڤن دادنانە سەر شاهێن چینێ).

**فـغـند(Fexend):** سـەمـا، رەقس، خوە هلاڤێتن.

**فـغـيـاز(Fexyaz):** بەخـشـيش، پارەکێ زێدە کـو خـودانێ کـاری ژ بلی حـەقێ کـارکـەرێ بدەتە کارکەری ـ مزگینی.

**فكور(Fekûr):** زەلامێ کـو گـەلەک هزرا بکەت، هزرڤان.

**فگار(Fegar):** وەستیای ـ پەریشان ـ بریندار. هەروەسـا (فگال) ژی لکارە.

**فلات(Felat):** بیابان، دەشتا بەرین و بێ ئاڤ و گیا.

**فلاحت(Felahet):** جۆتیاری.

**فـلاخن(Felaxen):** بەردەقـانی. هەروەسـا پەیڤـێن: (دسـتـاسنگ، دست سنـگ، قـــلاب سنـگ، قـلاسنگ، قلباسنگ، قلماسنگ، کـلاسنگ، کلماسنگ و فـلاسنگ) ژی لکارن.

**فلادە(Felade):** بێهودە، بێ سود ـ ئاخفتنێن بێ مفا.

**فـلاكت(Felaket):** بێـچـارەیی، بەدبەختی ـ نەداری، موعیزی.

**فلج(Felc):** قـفـل، کـێلونا دەروکی. هەروەسا (فلجم) ژی لکارە.

**فلخ(Felx- Felex):** دەستپێک.

**فلغند(Felxend):** پێژان.

**فله(Fele- Fulle):** فـری(فـریێ شیری).

**فليـو(Felîv- Felîvê):** بێـهـودە، بێ مفا.

**فنج(Fe-Func):** کـەسێ کـو ئێـشـا فتق هەبت ـ مەزن.

**فنجـا(Fenca):** رەجـفـینا کـو بەری تایێ دهێتە مرۆڤی.

**فنجـیـدن(Fencîden):** باوشک ڤەدان، نوقرسکێن خەوێ.

**فند(Fend):** فـێـل، فـەند، حـیلە ـ درەو ـ خاپاندن.

**فندک(Fendek):** چەقماق، مەکینا ئاگر هلکرنێ.

**فـوت(Fût):** پف(بایێ کـــو ژ بو تەمـــراندنا چراکــا یان هلکرن و گـــــەشکرنا ئاگـــــری ژ دەڤـی دەردکەڤت).

**فوز(Fûz):** دورماندوری دەڤی.

**فـــوژان(Fûjan):** نرپین، دەنگـێن بلند، هەوار، فریاد.

**فولاد(Fûlad):** پیلا.

**فهل(Fehl):** فرەه.

**فیار(Fiyar):** کار، شول، پیشه.

**فـیـال(Fe-Fêyal):** دەسـتـپـێـک، سەرەتا.

**فیاوار(Feyavar):** بنێڕە: (فیار).

**فیر(Fîr):** مخابن، بەداخەوه ـ تڕانه.

**فـیـروزه(Fîrûzê):** بەرەکێ پڕبهـایێ رەنگ شینه.

**فـیـریدن(Fîrîden):** ب نازداری و دفنبلندی برێڤەچوون ـ تڕانەکرن.

**فیس(Fîs):** ناز ـ دفنبلندی(غرور).

**فیل(Fîl):** فیل.

**فـیلک(Feylek- Feyelk):** تیـرا دوسەر یان سەر پەهن.

**فینه(Fîne):** فێس(کولاڤێ سۆر یان سپی).



**ق(Qaf):** ئەڤ تیپە د زمانێ فارسی دا نینە و ئەو پەیڤێن کو ئەڤ تیپە د ناڤ دا بت، یان پەیڤێن عەرەبی نە یان ژی پەیڤێن تورکی نە، یان ژی پەیڤێن لێکدای یان دارشتی نە ژ هەر سێ زمانان. د هندەک پەیڤێن فارسی دا شوینا تیپێن (غ ـ ک) دگرت.

**قاآن(Qaan):** پەیڤەکا بنیات مەغولی یە، ئانکو: شاهینشاه، شاهێ مەزن، شاهێ شاهان.

**قاب(Qab):** پەیڤەکا بنیات تورکی یە، ئانکو: سێنیک ـ کالوخک ـ چارچووڤێ(ایطار)ێ وێنا و خودیکا.

**قاب بالان(Qab balan):** دەستەیەکە ژ مورێن فرندە کو ب دو رەنگە پەرانن و پەرەک ژ وان بۆ یێ دی دبتە نخێفک، وەکی: (خالخالۆک و سیسرک)ا.

**قابلمە(Qablemê):** قازان.

**قاپندە(Qapendê):** کەسێ کو تشتەکی ژ دەستێ کەسەکی یان ژ جهەکی ب شارەزایی بدزت و کەس پێ نەحەسیێت.

**قاپیدن(Qapîden):** دزین(تشتەک دزین ب شارەزایی و بلەز).

**قاچ(Qaç):** کویزی یان توزیێ زەبەش و گوندورا ـ شکەن، دەرز. هەروەسا (قاش) ژی لکارە.

**قارچ(Qarç):** کڤارک.

**قارقار(Qarqar):** دەنگێ قغ قغا قەلێ.

**قازغان(Qazxan):** مەنجەلا مەزن. هەروەسا پەیڤێن (قزغان، غازغان، غزغان و غزغن) ژی لکارن.

**قاشق(Qaşuq):** کەڤچک، کاچک.

**قاطر(Qatêr)**: هێستر(دەمێ کەر گوهنێلیێ دگەل ماهینێ بکت، هێستر ژێ پەیدا دبت). هەروەسا (چمنا و ستر) ژی لکارن.

**قاعدگی(Qa'êdêgî)**: بێ نڤێژاهی، عادا هەیڤانە یا ژنکا.

**قاف(Qaf)**: ناڤێ چیایەکێ چیڤانۆکی یە کو دبێژن سیمەرخێ لسەرێ وی هێلین هەبوویە.

**قافلەسالار(Qafêlêsalar)**: سەرۆک و سەرپەرشتێ کاروانی.

**قالوس(Qalûs)**: قالووس یان ژی قالووسی ناڤێ ئاوازەکێ یە ژ موزیکا کەڤنا ئیرانی.

**قالی(Qalî)**: مەحفویر.

**قالی باف(Qalî baf)**: کەسێ یان کەسا کو مەحفویرا چێدکت.

**قایق(Qayêq)**: قایک، بەلەما بچویک.

**قایم باز(Qayêmbaz)**: یاریکەرێ شارەزا و بێ هەڤتا د یاریێن طاولە و شەترنجێ دا.

**قایم باشک(Qayêmbaşek)**: چینگانێ(یاریەکا بچویکایە کو ئێک چاڤێ خوە دنقینت و هەڤالێن وی خوە لێ ڤەدشێرن و لسەر پێدڤی یە کو وان ڤەبینتەڤەو......).

**قبرستان(Qebrêstan)**: گۆڕستان.

**قبلەگاە(Qêblêgah)**: قیبلەگەهـ، جهێ قیبلێ، ئەو جهێ کو ل دەمێ نڤێژکرنێ مرۆڤ بەرێ خوە ددەتێ.

**قپان(Qepan)**: قەپان، ترازیا مەزن. هەروەسا (کپان) ژی لکارە.

**قحطی(Qehtî)**: هشکسالی، خەلا.

**قدرانداز(Qeder endaz)**: کەڤانداریێ کو تیرا وی خەلەت نەچت، سەگڤان.

**قدم گشادن(Qedem guşaden)**: دڕکەیە ژ رێڤەچۆنێ.

**قدم نهادن(Qedem nehaden)**: رێڤەچۆن و گاڤ هاڤێتن د جهەکی ڤە.

**قرائتخانە(Qêraetxanê)**: ژۆرەکە د پەرتووکخانێن گشتی ڤە کو خەلک تێڤە پەرتووک یان رۆژناما دخوینن.

**قرارداد(Qerardad)**: پەیمان ـ پەیماننامە، هەڤبەست.

**قرارگاە(Qerargah)**: جهێ بێهن ڤەدانێ، مال، خانی.

**قرص(Qurs)**: د زمانێ فارسی دا ئانکو: رەق و موکوم.

**قرضدار(Qerzdar)**: قەردار، دەیندار.

**قرمز(Qêrmêz)**: سۆر، قورمز، رەنگێ سۆر یان قورمز.

**قرەنی(Qereney)**: نەیا رەش، ئێک ژ ئالاڤێن موزیکێ یە وەکی بلوولێ کو ژ داری و کەرەستێت ئاسنی دهێتە چێکرن.

**قزل آلا(Qêzêl ala)**: جۆرەکێ ماسی یێ رەنگ سۆر و تام خوەشە کو د ئاڤێن شرین دا دژیت و د رویباران دا ژی پەیدا دبت.

**قزلباش(Qêzêlbaş)**: سەر سۆر (هندەک ژ سوپایێ شاه ئسماعیلێ ئێکێ بوون کو پێکهاتبوون ژ لایەنگرێن مەزهەبێ شیعە پارێزڤانێن دەستهەلاتا صەفەوی، و ژ بەر کولاڤێ رەنگ سۆرێ کو لسەرێ وان ب ڤی ناڤی دهاتە نیاسین کو پاشان هەمی لەشکەرێ صەفەوی ب ڤی ناڤی هاتە ناڤکرن).

**قشلاق(Qêşlaq)**: گەرمیان.

**قشنگ(Qeşeng)**: خشکوک، دەلال، جوان.

**قشون(Quşûn)**: کۆما سوپایێن وەلاتەکی.

**قصب انجیر(Qeseb encîr)**: گەلوازێ کتکێن هێژیرا.

**قصەپرداز(Qêsseperdaz)**: چیرۆک بێژ.

**قصیدەسرا(Qesîdesera)**: چامەبێژ.

**قطعنامە(Qet'namê)**: بەیاننامە.

**قطور(Qetûr)**: ئەورێ پڕ باران ــ د فارسی دا بۆ هەر تشتەکێ زەخم و ستویر بکار دهێت.

**قفل رومی(Quflê romî)**: ناڤێ ئێک ژ هەر سیە ئاوازێن باربەدی.

**قفل گر(Quflger)**: قفل چێکەر، کلیلساز.

**قڤنوس(Quqnûs)**: بالندەکێ چیڤانۆکی یە کو دگۆتن نکلێ وی گەلەک کون لێ بوون و ئاوازێن سەیر ژێ دەردکەتن، و هزار سالا ڤی بالندەی عەمر دبر و دەمێ کو ژیێ وی دگەهشتە دویماهیێ، دا هندەک پویش و پەلەخی کۆم کت و دا ل سەر روینت و دا دەست ب پەرلێدانێ کت هەتا ئاگر بەربیا

وی پویش و پەلەخی و دا هوسا خوه سۆژت و دویاهییێ ب ژیانا خوه ئینت.

**قلان(Qelan)**: پەیڤەکا بنیات مەغولی یە و ئانکو: باج و خەراجێن کو لسەردەمێ ئیلخانیان ژ خەلکی دهاتنە وەرگرتن.

**قلاووز(Qelavûz)**: پێشرەوێ لەشکەری ـ رێبەر ـ رێ نیشاندەر.

**قلب(Qelb)**: د زمانێ فارسی دا ئانکو زێڕ و زیڤێن قەلپ و سەختە.

**قلمدوش(Qelemdûş)**: قلیقدانک.

**قلم زدن(Qelem zeden)**: نقیسین ـ نەخشکرن، کێشان، وێنەکرن.

**قلمزن(Qelemzen)**: نڤیسەر ـ نەخشکێش، وێنەکێش.

**قلم کردن(Qelemkerden)**: بڕین، قەدکرن.

**قلندر(Qelender)**: قەلەندەر، دەروێش.

**قلندرانه(Qelenderanê)**: وەکی دەروێشا.

**قمارباز(Qumarbaz)**: قومارچی.

**قمه(Qeme)**: قەمە، ئالاڤەکێ شەرکرنێ یە کو ژ شیری کورتترە و هەردو لێڤێن وی برەکن.

**قناری(Qenarî)**: کناری(فرندەکێ خوەش ئاوازە).

**قناویز(Qenavîz)**: جۆرەکێ پەرۆکێ ئارمویشی یێ سادەیە کو پتر ب رەنگێ سۆرە.

**قنداق(Qundaq)**: قونداخێ تڤەنگێ ـ قوماتک.

**قنداغ(Qenddax)**: قەنداڤ.

**قنق(Qunuq)**: مێهڤان ـ رێڤنگ.

**قورباغه(Qûrbaxê)**: بەق.

**قوقو(Qûqû)**: قومچا قەمیسی یان کولاڤی ـ دەنگێ دیکلی.

**قولنج(Qolenc)**: ئێشا قولنج.

**قوی دل(Qevî dêl)**: ب دل ـ دلێر.

**قهرکردن(Qehirkerden)**: سلبوون.

**قهرمان(Qehreman)**: قارەمان، دلێر، پەلەوان.

**قهندز(Quhendêz)**: پەیڤا بنیات فارسی یە کو ژ پەیڤا (کهن دژ) هاتیە و ئانکو: کەلها کەڤن.

**قهوەجوش(Qehvêcûş)**: جەزوێ قەهوێ.

**قهوەچی(Qehvêçî)**: قەهوەچی.

**قهوه‌ء قجری(Qehvêyê qecerî):** قــه‌هوا ژه‌هرکــری کــو لســه‌رده‌مــێن ســولتــانێن قــه‌جــه‌را ددانه هنده‌ک که‌سان.

**قیچی(Qîçî):** مقه‌س.

**قــیــرگــون(Qîrgûn):** ب ره‌نگێ قیرێ.

**قیسی(Qeysî):** جۆره‌کێ مژمژێ یه ـ مـژمـژا هشـک کـری یه(قـه‌یسی)، و توی یا هشک کری.

**قـیصـران(Qeyseran):** ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن که‌ڤنێن موزیکێ یه.

**قیصریه(Qeyserîye):** قه‌یسه‌ری، بازارێ مه‌زن.

**قیف(Qîf):** کۆڤک.

**قیماق(Qeymaq):** قه‌یماغ.

# ک

**ک(Kaf):** تیپا بیست و پێنجێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی.

**کابلج(Kablêc- Kablîc):** تبلا قلیچێ.

**کابنە(Kabêne):** چاڤ.

**کابوک(Kabûk):** کۆلکێ مریشکێ ـ زەمبیلکا هلاویستی ب بانێ خانی ڤە کو کوترک هێلینکا خوە تێدا چێکەت.

**کابیلە(Kabîle):** هاون.

**کابین(Kabîn):** مەهر(مەهرا ژنکێ ل دەمێ دانەشویێ).

**کاتورە(Katûre):** سەرگەردان، گێژ، حەیران.

**کاتوزی(Katûzî):** خودێ پەرست، د بنیات دا ئەڤ پەیڤە (آتوری) بوو، ئانکو زێرەڤانێ ئاگرێ پەرستگەها زەردەشتی یان.

**کاج(Kac):** کاژ(دارا کاژێ) ـ شەق، زللەھ ـ چاڤ ویر ـ خوەزی.

**کاچار(Kaçar):** ئالاڤ، ئامیر ـ ناڤمالی.

**کاچک(Kaçek):** راستکا سەری.

**کاچە(Kaçe):** ئەرزنک ـ خوەشی و شادمانی.

**کاخ(Kax):** قەسر، خانیێ مەزن کو چەندین ژۆر تێدا بن.

**کار(Kar):** کار، شول، پیشە ـ شەڕ، جەنگ ـ چاندن، جوتیاری ـ وەک پاشگر ل داوییا هندەک پەیڤا دهێت، کو ئەڤ رەنگە پاشگرە دبنە دو جۆر؛ ئێک ژ وان ژ کارێ (کردن: کرن) دهێت، وەکی: (تباهکار: خرابکەر ـ ستمکار: ستەمکەر و......هتد)، و یێ دی ژ ژێدەرێ (کاشتن: چاندن) دهێت و ئانکوا بکەرێ کاری دگەهینیت، وەکی: (برنج کار: کەسێ کو برنج

چاندی ـ گندمکار: کەسێ کو گەنم چاندی و......هتد).

**کارپیچ(Karpîç)**: لفاف، ریتالەکا پەڕۆکی کو لدور تشتەکی بهێتە ئالاندن.

**کارتن(Karten)**: تەڤنپیرک، داپیروشک. هەروەسا بۆ تەڤنێ تەڤنپیرکێ ژی لکارە.

**کارد(Kard)**: کێرکا مەزن، ساتور، چەقو(بۆ وان رەنگە کێرکا دهێتە بکار ئینان یێن کو تا نەبن«نەچەمیێن»).

**کارزار(Karzar)**: شەڕ، جەنگ ـ مەیدانا شەڕی.

**کارگر(Karger)**: کارگەر، پالە ـ کاریگەر(مؤثر).

**کارمەند(Karmend)**: کارمەند، کەسێ کو ل بنگەهەکێ یان ل رێڤەبەریەکێ کار بکەت.

**کارنامە(Karnamê)**: ژیاننامە کەسەکی ـ پەڕەک یان دەفتەرەک کو تەفاصیلێن کارێ کارکەرەکی تێدا هاتبیتە تۆمارکرن ـ باوەرنامە، کارتا قوتابخانێ کو پلەیێن کت کتا وانەیان تێدا هاتبیتە تومارکرن.

**کاروان(Karvan)**: کاروانی.

**کاریز(Karîz)**: کارێز.

**کاس(Kas)**: داهول ـ کوبر.

**کاست(Kast)**: کێمی، کاستی، کێم و کاسی.

**کاستن(Kasten)**: کێم بوون ـ کێم کرن.

**کاسج(Kasuc)**: سیخور.

**کاسە(Kasê)**: ترارک.

**کاسە پشت(Kasê puşt)**: کوبسەلە.

**کاش(Kaş)**: خوەزی.

**کاشانە(Kaşanê)**: خانی، خانیکێ بچویک، هێلین.

**کاشت(Kaşt)**: چاند، چاندن.

**کاشتن(Kaşten)**: چاندن.

**کاشە(Kaşe)**: جەمەدا تەنک کو بسەر ئاڤێ دبەستیێت، قەڕاسە.

**کاغە(Kaxe)**: هەبلە، ئەحمەق.

**کاف(Kaf)**: شکەن، دەرز، کەلشت.

**کافتن(Kaften)**: کەلاشتن، ترکرن.

**کاک(Kak)**: مێر، زەلام ـ بیبیکا چاڤی ـ هەر تشتەکێ هشک و زراڤ و لاواز کو نیڤا وی ڤالە بت ـ سەرێ ئەزمانی.

**کاکا(Kaka)**: برا، برایێ مەزنتر.

**کـاکل(Kakul):** مـوبێ سـەری ـ کوفی، کوفیک.

**کاکو(Kakû):** خال، برایێ دەیکێ.

**کاگل(Kagel):** ئەو پشک ژ لەڤەنی کو دناڤ ئاڤێ دا شین دبت.

**کـال(Kal):** چالا مـەزن ـ ئەردێ کەلشتی ـ ئەردێ کو ئاڤێ خواربت و کویر کربت ـ خوەهر، چەمیای ـ فێقیێ نەگەهشتی، کالٚ.

**کالا(Kala):** متـا ـ جل و بەرگ ـ کەل و پەلێن ناڤمالێ.

**کـالار(Kalar):** فـەرشێ پەحن و تەنک.

**کالبد(Kalbud):** لەش، کەلەخ.

**کـالفتن(Kaluften):** پەریشـان بوون.

**کـالم(Kalum):** بیـژن، ژنا کـو هاتبـیتـە بەردان یان مێـرێ وێ مڕبت.

**کـالنجـار(Kalêncar):** شـەر، جەنگ. هەروەسا پەیڤێن(کلنجار، کالیجـار، کالجار و کارزار) ژی لکارن.

**کـالوج(Kalûc):** تبـلا قلیچێ(خنصر) ـ کوتر ـ کەو.

**کـالوس(Kalûs):** هەبلە، نەزان ـ مەلویل ـ بێ بزاڤ.

**کالوش(Kalûş):** مەنجەلا زادی.

**کـالە(Kale):** مـتـا ـ فـێـقـیـێ نەگـەهشـتی ـ ترارکێ کـو ژ داری یان ئاخا جێرکا هاتبیتە چێکرن ـ زەڤیا کو هاتبیتە چاندن.

**کـالیـدن(Kalîden):** تێکچـوون، پـەریشـان بـوون ـ رەڤـین، دویرکەفتن.

**کالیو(Kalîv):** حەیران، سەرگەردان ـ هەبلە، دەبەنگ.

**کـام(Kam):** دەڤ، هوندرێ دەڤی، پەحنکا دەڤی ـ مراد و مەخسەد، ئارەزو.

**کـامروا(Kamreva):** کـەسێ کـو گـەهشـتـبـیـتـە مـرادا خـوە، خوەشبەخت. هەروەسا (کامکار، کـامگار، کـامـران، کـامـیـاب، کامیار، خوشبخت و نیک بخت) ژی لکارن.

**کام ناکام(Kam nakam):** بڤێت نەڤێت.

**کـانا(Kana):** هەبلە، نەزان ـ ئەحمەق.

**کـاواک(Kavak):** پووچ، خـرش، ناڤک ڤالە.

**کاویدن(Kavîden)**: لێـڤـەکـولین، لێگەریان.
**کاه(Kah)**: کا (بۆ نموونە کایا گەنمی).
**کـاهانیـدن(Kahanîden)**: کـێم کرن.
**کاهدان(Kahdan)**: عنبارا کای.
**کـاەدریغ(Kahdêrîx)**: هەسـپێ لەغـەر و تەمبەل و بێ هێزبووی کو خـودان ب مـخـابنی دبینت کـای و جەهی بدەتێ.
**کاهو(Kahû)**: خەس(گیایەکە کو ب خاڤی دهێتە خوارن).
**کاهیدن(Kahîden)**: کێم بوون ـ ل کێمی یا دان ـ لەغەربوون.
**کب(Kub)**: دەڤ، ژناڤدای دەڤی.
**کـبت(Kebt)**: زرکـێـتـک ـ مـێـشـا هنگڤینی.
**کبتر(Kebter)**: کوتر.
**کـبج(Kebc)**: کـەف ـ تفـا دەڤی ـ کەرێ کوری بری ـ هەر چارپێیەکێ کو بنێ دەڤێ وی وەرمتی بت.
**کبد(Kebd)**: لەحـیم(هەر تشـتـەکێ کــو دو تشــتــێن دی پێکڤــە بنویسینت یان لەحیم بکەت).
**کبره(Kebre)**: پەقیشکێن هشـک و رەق بوویـێن کــــو ژ ئـەگـــەرێ زێدەکارکرنێ لدەستێ مرۆڤی دیار دبن.
**کـبـک(Kebk)**: کــەو (فــرندەکێ خوەشخوان و دەلالە).
**کبوتر(Kebûter)**: کوتر.
**کــــبـــــود(Kebûd)**: رەش و شــین(رەنــگــێ رەش و شــین دناڤێکدا، بۆ نموونە ئەو رەنگێ کو ژ درب ڤێکەفتنێ لسەر ئەندامەکێ لەشی دیاردبت).
**کـبـودر(Kebûder)**: کـرمکێن بچـویک کـو دناڤ ئاڤـێـدا پەیدا دبن.
**کبـوده(Kebûde)**: دارێن راست و بلند و بێ بەر، وەکی: سپـیندار و چنارا.
**کبوس(Kebûs)**: خوەهر، چەمیای.
**کبیتک(Kubeytek)**: ئالاڤێ کو بەرێن ئاشا پێ خوەش دکەن.
**کپ(Kup)**: ئامانەکێ شویشەیی یێ مـەزن و دەر تەنگە کـو سیـهکێ و مەیێ دکەنێ.
**کپنک(Kepenek)**: کەپەنە.
**کپیدن(Kepîden)**: نقستن، خەوتن ـ ژێ ڤەدزین.
**کت(Ket)**: مل، شــان ـ تەخــتێ

شاهاتییێ ـ کاریز.
**کتام(Ketam):** خانیکێن هاڤینی کو ژ داری دهێنه چێکرن.
**کتخ(Ketex):** کەشک.
**کتره(Ketre):** دریای ـ ئاخفتنا بێهوده.
**کتری(Kêtrî):** قوریێ سفری.
**کتک(Kutek):** داریێ قوتانێ، گوپال. ژ ڤێ پەیڤێ یە؛ کتک زدن: قوتان، ئەڤجا ئەڤ قوتانا ب داری بت یان ب دەستی یان هەر تشتەکێ دی.
**کتک(Ketek):** میها بچویک کو دەست و پێن وێ دکورت بن.
**کتکار(Ketkar):** دارتاش، نەججار.
**کتل(Kutel):** پشتی ـ تەل ـ گرێ بلند.
**کتنبر(Ketenber):** ب خواره (یێ کو گەلەک بخوت) ـ تەنبەل.
**کتو(Kutû):** قەلپیشکێ پەمبی.
**کته(Kete):** برنجێ کو بێ دوهن هاتبیتە کەلاندن.
**کج(Kec):** خوەهر، چەمیای ـ ئارمویشێ خاڤ و نەبادای.
**کجا(Kuca):** پەیڤا پرسیاریێ یە ئانکو؛ کویڤە، کویدرێ ـ هەروەسا ئانکو؛ کەنگی ـ چەوا.
**کچل(Keçel):** کەچەل.
**کچه(Keçe):** گوستیرکا بێ موهرک ـ ئەرزنک.
**کچیر(Keçîr):** وەزیر ـ پێشەوا، سەرکردە.
**کخ(Kux):** کرم ـ هەر ئادی یەکێ هویر.
**کد(Ked):** خانی ـ گوند ـ تاخ.
**کدام(Kudam):** کیشک، کیژان.
**کدبانو(Kedbanû):** ژنا بەرمالێ (ربة البیت).
**کدخدا(Kedxuda):** مەزنێ گوندی، خودانێ گوندی ـ خودانێ مالێ ـ میر، مالخۆ.
**کدفت(Keduft):** سەر، ترارکێ سەری، قافێ سەری.
**کدو(Kedû):** کولند، باجانیک.
**کدواده(Kedvade):** دیوار، شەنگستێ دیواری.
**کدوخ(Kedox):** حەمام، گەرماڤ.
**کده(Kede-ê):** پاشگرێ جهی، وەکی: (آتشکده: پەرستگەه، جهێ کو ئاگر لێ دهێتە هلکرن ـ بتکده: پەرستگەه، جهێ کو

صەنەم لێ، و......هتد.
**کدە(Kude):** ئەزمانکێ بچویک کو دکەڤتە سەرێ گەورییێ.
**کدیور(Kedîver):** جوتیار ـ بنێرە: (کدخدا).
**کر(Ker):** کەر، کەسێ کو گوه ل دەنگا نەبیت ـ هێز ـ زاخ ـ شیان ـ مراد و مەخسەد.
**کراتن(Kerraten):** تەڤنپیرک، داپیروشک.
**کراجیدن(Keracîden):** دەنگێ (قد قد)ا مریشکێ لدەمێ هێک کرنێ.
**کراد ـ کرادە(Kurad-Kurade):** جل و بەرگێن کەڤن و درپای.
**کرار(Kurar):** دەرازینک.
**کراشیدن(Keraşîden):** پەریشان بوون ـ ژناڤچوون یان پویچبوونا کاری.
**کراکر(Keraker):** قڕ، قەل.
**کران(Keran):** کنار، کنارێ دەریایێ.
**کرباسە(Kerbase):** مارگیسە ـ قوربەشک. هەروەسا ناڤێن: (چلپاسە، کلپاسە، کلباسە، کربسو، کرباشە، کربش و کربشە)
ژی د زمانێ فارسی دا لکارن.
**کربز، کربزە(Kurbuze):** خیارێن درێژ. پەیڤێن نێزیکی ڤان د فارسی و تورکی دا هەنە کو بۆ گوندەری دهێنە بکار ئینان، ئەو ژی (خربزە)یا فارسی و (گارپز)ا تورکی نە، دویر نابینم پەیوەندی یەک دگەلێک هەبن.
**کرپان(Kerepan):** زاراوەکە کو زەردەشتیا بۆ وی کەسی بکار دئینا یێ کو گوه هەبوون، لێ پەیڤا حەقییێ گوه لێ نەدبوو. یان چێتر بێژین ئەو کەسێن کو گوهداریا تەعلیماتێن زەردەشتی نەدکرن و دژی وی رادبوون. هەروەسا پەیڤا (کاوی) ژی هەر بۆ ڤێ مەبەستێ دهاتە بکارئینان.
**کرج(Kerc):** مەهیک، قومچە، قولپک.
**کرجی(Kerecî):** بەلەما بچویک، قایک(زورق).
**کرچ(Kêrç):** توبزی، کویزی(بۆ گوندور و زەبەش و باجانیک و......هتد، لکارە).
**کرچ(Kurç):** کورک، مریشکا کو ژ هێک کرنێ بدوماهی هاتبیت و

ئێدی لسەر هێکێن خوە بنڤیت تاکو وان هێکا بکەتە چوبچەلوک.

**کرخ (Kerex)**: سست، بێ هەست(ئەندامەکێ لەشی کو بێ هەست و سست و خاڤ ببیت).

**کرخت(Kerext)**: بنێرە: (کرخ).

**کردار(Kêrdar)**: کردار، کار ـ شێواز، تەرز ـ شەنگستە، بنواش.

**کردر(Kerder)**: دۆل، نهال ـ ئەردێ گرک گرک ـ بیابان.

**کردک(Kerdek)**: پشکەک ژ پەرتوکێ(قسم).

**کردگار(Kêrdgar)**: ئێک ژ ناڤێن خودێ مەزنە.

**کردمند(Kerdmend)**: چست و چالاک، توند، سرت.

**کردن(Kerden)**: چێکرن ـ مەزاختن ـ ئەنجامدان ـ کرن.

**کردنگ(Kerdeng)**: هەبلە، ئەحمەق، گورێخ ـ کرێت. هەروەسا پەیڤێن: (گردنگ، کردنگل، دنگل و دنگ) ژی لکارن.

**کردەکار(Kerdekar)**: کارکری، جێرباندی، کارزان.

**کرس(Kurs)**: کێم و عەداف ـ قرێژ و قیڤار(هەم یا جلکی و هەم یا لەشی).

**کرسب(Keresb)**: کەرەفس(گیایەکە).

**کرستون(Kereston)**: قەپان. هەروەسا پەیڤێن (قپان، کپان، قرسطون، فرستون، فرسطون) ژی لکارن.

**کرش(Kereş)**: فێل، حیلە، بسەردابرن ـ مەللاقی، دەڤخوشی.

**کرشمە(Kêrêşmê)**: ناز، غەمزە، ئیشارەتدان ب چاڤ و برها.

**کرشیدن(Kereşîden)**: فێلکرن، حیلەکرن، بسەردابرن ـ مەللاقی کرن، دەڤخوشی کرن، خوشخوەشک گوتن. هەروەسا (کرسیدن و کریسیدن) ژی لکارن.

**کرفت(Kêrêft)**: پیس، قرێژی.

**کرفە(Kerfe)**: کارێ باش، بەروڤاژی گونەهێ یان کارێ خراب.

**کرفەگر(Kerfeger)**: قەنجیکار، کەسێ کو کارێن باش دکەت.

**کرک(Kurk)**: هری، یانژی گەلەک نەرم(مەبەست ژێ پەرزومویێ یێن بزنێ نە کو ب شەی دهێنە جوداکرن و پشتی دهێتە رستن،

دکـــەنە پەروک و ئەو پەروک ژی هەر ب کــورکی بیێ ناڤـــدارە.)، هەروەسا پەیڤێن (گلغز، تفتیک، پت، تبت و تبد) ژی لکارن.

**کرکر(Kurkur):** جورەکێ پەروکێ ئارمـویشی یە کو بو پەردە و رویێ قەنەپا دهێتە بکارئینان.

**کــــرکــــرانک(Kerkerank):** کـرکـڕوک، کـرکـڕک، هەسـتـییێ نەرم(غضروف). هەروەسا (کرجن، کرکرک و کرکری) ژی لکارن.

**کرکس(Kerkes):** تەیرێ کەلەخا.

**کـرکم(Kerkem):** کـەسکوسـور، کەسکوئالا (قوس قزح).

**کرگدن(Kergeden):** کەرکەدان.

**کـرم(Kêrêm):** رەنگێ سپی بناڤ زەری ڤـــــــە، وەکـی رەنـگـێ نوکا (تبنی).

**کرم(Kêrm):** کرم.

**کـرنا(Kerna):** زڕنایا کــو د ناڤ لەشکەری و لدەمێ شـەڕا دهێـتـە بکارئینان.

**کــرو ـ کــروە(Kerv, Kervê):** ددانێ کرمی، ددانێ رزی.

**کـروت(Kurût):** قـەلەو، بخـوەڤـە، بەروڤاژی لەغەری.

**کـروتنە(Kerûtene):** تەڤنپـیـرک، داپیروشک.

**کـروز ـ کـروژ(Kurûz-j):** شـادی، کەیف، خوەشی.

**کروک(Kurûk):** سیهوانا عـەرەبە و ترومبێلا.

**کـروە(Kurûh):** مـەسـافـەتەکـە نێـزیکی سـێکا فـەرسـەخێ، دو کیلومەتر ـ هێلین ـ گورستان.

**کرە(Kere-rê):** نیڤشک.

**کرە(Kurrê):** جانیکێ هەسپی یان کەری.

**کـریزی(Kurîzî):** پیـر، داکـەتی، دانسـال، بناڤـسـالڤەچووی، پشت چەمیای ـ فرندێ پەڕ وەریای.

**کریشک(Kêrîşek):** چوبچەلوک ـ زەلامێ شەڕی.

**کــــــریـشـک(Kerîşek):** چـال، کویراتی.

**کــزاد(Kezad):** جلکێ کـــەڤن و دڕیای.

**کــزبود(Kezbûd):** کــەدخـــودا، سەروک و مەزنێ هوزێ.

**کزم(Kezm):** شـینکاتیـا کـو لبـەر لێڤێن جۆک و برکا شین دبیت.

**کژار(Kujar):** بەرچێلکا مریشکێ.

**کژدم(Kejdum)**: دوپشک.
**کس(Kes)**: کــــەس، مــــروڤ، (شخص، ذات).
**کــســپــرج(Kesperec)**: لولو، مراری.
**کستل(Kustel)**: کێزگلولک.
**کــستی(Kustî)**: کـەمـەربەند یان شـالا پیـروزا زەردەشـتی یا کـو ژ هریا مـیـهێ دهێـتـە چێکرن و ژ (٧٢)داڤا پێک دهێت.
**کش(Keş)**: بەرسـینگ، هەمـبێـز ـ سینگ، هەر دو کێلەکێن راست و چەپێ یێن زکی ـ خـوەش ـ باش، قەنج ـ دەلال، جوان.
**کش(Kêş-Kîş)**: پەیڤــەکــە بو هاژوتنا مـریشکێ یانژی د یاریا شـەترەنجێ دا بو کـشکرنا شـاهی دهێتە گوتن.
**کــشــالە(Keşale)**: بەردەوامی، درێژاهی(امتداد).
**کشان(Keşan)**: خیڤەتا کو لسەر ستوینەکێ بهێتە دانان.
**کشاندن(Keşanden)**: کـێـشـان، کـێـشـانا تشـتـەکی ژ ئالیـەکی بۆ ئالیێ دی.
**کشاورز(Kêşaverz)**: جوتیار.
**کــشــت(Kêşt)**: چاندن ـ دەرامــەت یان داهاتیێ چاندنێ.
**کشت(Kuşt)**: کوشت، کوشتن.
**کشـتـار(Kuştar)**: گەلەک کـوشتن، کوشتنەکا ب مشەیی.
**کشتبان(Kêştban)**: جوتیار.
**کشتزار(Kêştzar)**: ئەردەکێ پان و بەرین کو کارێ چاندنێ لێ بهێتە کرن.
**کێشـتـمان(Kêştman)**: ئەردێ کو هاتبیتە چاندن.
**کێشتن(Kêşten)**: چاندن، تۆڤێ کو هاتبیتە بن ئەردکرن.
**کــشــتن(Kuşten)**: کــوشـتن، بێ گیـانکرن ـ ڤەمراندن یان تەمراندنا چراکی.
**کــشــتـە(Kêşte)**: فـێـقـیێ هشک کری.
**کــــــشــــــــــتی(Kuştî)**: خـوەلێکدان(وەرزشــەکــە ژ بۆیی بزانن کا کیژان بهێزترە).
**کشتی(Keştî)**: بەلەم.
**کشـتیـبان(Keştîban)**: شـوفێـرێ بەلەمێ(کاپیتان).
**کــشـخ(Keşex)**: وەریسێ کـــو ئویشـێـن تری پێـڤـە دهلاویسن دا

هشک بین.

**کشخان(Keşxan)**: زەلامێ بێ غیرەت، دەیوس.

**کشف(Keşef)**: کویسەلە ـ بورجا چوارێ ژ هەر دوازدە بورجێن فەلەکی کو ناڤێ وێ کێڤژاله(سرطان)ە ـ گوزکێ مەزنێ دەرفرەه.

**کشفتن(Keşeften)**: کەلاشتن ـ ڤەکرن ـ بژالەکرن، بەلاڤکرن ـ چرمساندن.

**کشک(Keşk)**: کەشک. هەروەسا پەیڤێن (قروت، پینو، پینوک، رخبین، ریخبین، کتخ و کتغ) ژی لکارن.

**کشکک(Keşkek)**: کاسکێ چۆکی.

**کشکله(Keşkele)**: جورەکێ پێلاڤایە.

**کشمان(Kêşman)**: زەڤیێن دورماندوری گوندی کو بهێنە چاندن.

**کشمش(Kêşmêş)**: مێویژ، کشمش، خاتینوک.

**کشمکش(Keşmekeş)**: بگرە و ڤەکێش، گفتوگۆ، جەڕ و بەحس، دانوستاندن.

**کشن(Keşen)**: پڕ، گەلەک، زێدە.

**کشو(Keşû)**: چەکمەچە.

**کشور(Kêşver)**: وەلات، هەرێم، مەملەکەت، ئەردەکێ بەرفرەه کو چەند پارێزگەهـ لێ بن و خەلکێ وێ گوهـ ب فەرمانێن دەولەتەکێ بن.

**کشی(Keşî)**: باشی و خوەشی.

**کشیدن(Keşîden)**: درێژکرن، ژێک راکێشان ـ کێشان(جذب کرن) ـ کێشان(وزن کرن) ـ بار برن، بار ڤەگوهاستن ـ رسم کرن ـ هلکێشان(وەکی دویکێلێ جگارێ) ـ تەحەمل کرن، خوە لبەر گرتن.

**کشیده(Keşîdê)**: زللەه، شەق.

**کشیش(Keşîş)**: قەشە، پێشەوایێ ئۆلی.

**کف(Kef)**: کەف(وەکی کەفا سابوینێ، یان کەفا کو بسەر ئاڤا کەلاندی دکەڤت).

**کفا(Kefa)**: زەحمەت، رەنج، وەستیان ـ دلتەنگی، پەریشانی.

**کفانیدن(Kefanîden)**: کەلاشتن، دەرزاندن.

**کفت(Keft):** مل، شان(کتف).

**کفتار(Keftar):** حێفتیار(گیانەوەرەکێ دڕندەیە).

**کفتر(Kefter):** کوتر، کوترک.

**کفتن(Keften):** کەلشتن، دەرزتن.

**کفچ(Kefç):** کەف(کەفا ئاڤێ و سابوینێ) ـ تف، گلیز.

**کفچە(Kefçe):** کەفگیر، مفسک، هسکیف. هەروەسا ناڤێن(چمچە، کبچە، کپچە و کفچ) ژی لکارن.

**کفش(Kefş):** پێلاڤ. هەروەسا ناڤێن (پاپوش، پا افزار، لالکا، لکا و لخا) ژی لکارن.

**کفک(Kefek):** بنێرە: (کف) ـ کیفکو، کیفکویی.

**کفیدن(Kefîden):** بنێرە: (کفتن).

**کل(Kel):** کورتکری یا (کچل: کەچەل) ـ بزنێ نێر ـ گیانەوەرێ نێر ـ میها بێ شاخ.

**کل(Kul):** چەمیای، خوەهر.

**کلا(Kela):** بەق.

**کلات(Kelat):** کەل، کەلھ(قلعە).

**کلاجو(Kelacû):** فنجانکا قەهوێ ـ جاما مەیێ.

**کلاژ(Kelaj):** چاڤ ویر.

**کلاش(Kelaş):** تەڤنپیرک، داپیروشک.

**کلاش(Kellaş):** کۆلانی، فەلیتە.

**کلاغ(Kelax):** قەل، قڕ.

**کلاف(Kelaf):** بوکرکا دەزی یان بەنکا.

**کلاک(Kelak):** راستکا سەری ـ دەشت، بیابان.

**کلاک(Kulak):** ڤالە، خالی ـ پێلێن مەزنێن دەریایێ.

**کلال(Kelal):** راستکا سەری.

**کلال(Kelal):** گوزک چێکەر، جەرک چێکەر، ئامان چێکەر.

**کلان(Kelan):** مەزن، مەطوط، زەخم، ترخان، کەسێ کو ب کەلەخێ خوەڤە مەزن بت ـ ب هێز.

**کلاوە(Kelave):** گێژ، مەندەهۆش.

**کلاه(Kulah):** کولاڤ.

**کلاهخود(Kulahxod):** کومزری(کولاڤکێ ئاسنی کو ل شەرا دا دهێتە بکارئینان).

**کلب(Keleb):** دەڤ، دورماندوری دەڤی ـ دمکێ مریشکێ، نکلێ مریشکێ.

**کلبە(Kulbe):** کۆلک.

**کلتە(Kelte):** گیانەوەرێ ئازاکری(گیانەوەرێ کو ژ بەر پیری

و بێ هێزیێ چ کار پێ نەقەتیێن)
ـ گیانەوەرێ کوری قوت ـ لالۆتە.

**کلجان(Kelcan)**: گـویفک، جـهێ کو گلێشی دکەنێ.

**کلچ(Kelç)**: کێم، عەداش ـ قرێژ.

**کلچنگ(Kulçeng)**: کێڤژالە.

**کلخج(Kelexc)**: بنێرە: (کلچ).

**کلفت(Kuluft)**: ستویر.

**کلفت(Kulfet)**: خودام، خزمەتکارا ژن.

**کلفـــهـــشـنـگ(Kelfehşeng)**: لویلاق(لویلاقێن جەمەدێ).

**کلک(Kêlk)**: قەلەمێ کو ژ لەڤەنی هاتبتە چێکرن.

**کلک(Kelek)**: نشـتـەر ـ مـەنقـەل، ئاگردانک ـ کەچەلۆک ـ بوم، تۆک ـ بێ ئیـفلەح، بەش، پێ برەشک ـ گـامـێشێ نێرێ گـەنج ـ کـەلەک ـ فێل، حیلە.

**کلکم(Kelkem)**: مـــەنجـــەنیق ـ کەسکوسۆر، کەسکوعالا.

**کلم(Kelem)**: کەلەمی.

**کلن(Kulen)**: گلۆلکا پەمبی.

**کلنج(Kêlenc)**: کـێم و عــەداش ـ دفنبلندی، خوەمەزنکرن.

**کلنجار(Kêlêncar)**: کێڤژالە.

**کلنجـــار(Kelencar)**: شــــەڕ و جەدەل.

**کلند(Kulend)**: قـەزمـە ـ کـێلـونە، قفلا کو ژ داری هاتبتە چێکرن.

**کلندر(Kelender)**: زەلامێ ترخانە و ب هێز ـ دارێ نە سپیکری.

**کلندیدن(Kelendîden)**: کـولانا ئەردی ب قەزمەی.

**کلنگ(Kuleng)**: قـــەزمــــە ـ قولنگ(فڕندەکە).

**کلوچە(Kulûçê)**: کـــولیـــچــە، کادە،کەسمە.

**کلوخ(Kulûx)**: گـومـتلکێت ئاخێ، قەنتلکێت ئاخێ.

**کلوک(Kelûk)**: کـەرێ کەرپیـچی ـ بچویک، زاروک.

**کلون(Kulûn)**: کێلۆنە یان قفلا کو ژ داری هاتبتە چێکرن.

**کلوند(Kelvend)**: خـیـار، خـیـارێ کـو بۆ تۆڤی هاتبـیـتـە هەلگرتـن ـ گـوندورێ نەگـەهشـتی ـ کـتکێت هێـژیرا یان خـورمێ کـو ب بـەنکی ڤە دکەنە گەلواز.

**کله(Kuleh)**: کولاڤ.

**کله(Kelle-ê)**: سەر، سەرێ مرۆڤی یان گیانەوەری.

**کله(Kulle)**: کوفیکا سەری.

**کلی(Kulî)**: گوندی، خەلکێ گوندا - دەف(ئامیرەکێ موزیکێ یە) - بازنە(دایرە) - خوریک.

**کلیاوە(Kelyave)**: کەڕ، کەسێ کو گوه لێ نەبت - گێژ، مەندەهۆش.

**کلیچە(Kulîçê)**: کولیچە، کادە، کەسمە.

**کلید(Kelîd- Kêlîd)**: کلیل.

**کلیز(Kelîz)**: زرکێتک.

**کلیسا(Kêlîsa)**: دێر، پەرستگەها فەلا.

**کلشک(Kelîk)**: چاڤ ویر.

**کلیک(Kêlîk)**: قلیچ، تبـــلا قلیچێ.

**کلیک(Kelîk)**: بوم، تۆک.

**کلیون(Kulyûn)**: پەرۆکێ هەفت رەنگ.

**کم(Kem)**: کێم، پچەک.

**کمابیش(Kemabîş)**: کێم و زێدە.

**کماس(Kemas)**: گوزکێ دەر فرەه - کـــــۆد، ترارکێ داری - کەشکولک.

**کماله(Kumalê)**: خوەهر.

**کمان(Keman)**: کڤان.

**کمانچه(Kemançe)**: کڤانا بچویک - کەمانچە(ئێک ژ ئالاڤێن موزیکێ یە).

**کمبود(Kembûd)**: کێم بوون، کێماتی.

**کمبیزه(Kumbîzê)**: خیارێ زەر و مەزن - گوندورێ نەگەهشتی.

**کمپیر(Kempîr)**: پیر، ب ناڤسالڤەچووی - پیرەژن.

**کمتر(Kemter)**: کێمتر، پچەکتر - هویرتر.

**کمر(Kemer)**: کەمەر، دورماندوری زک و پشتێ .

**کمزن(Kemzen)**: بێ شەنس، بێ ئیقبال، کەسێ کو هەردەم د یاریا قومارێ دا ددوڕینت.

**کمسک(Kemesk)**: تەڕەماست.

**کمند(Kemend)**: کنف.

**کمیاب(Kemyab)**: هەر تشتێ کو کێم بت و ب ساناهی بدەست نەکەڤت.

**کمیچه(Kemîçê)**: ستێرستێروک - کەمانچە.

**کمین(Kemîn)**: کێمترین - کێم بها، بێ قیمەت.

**کن(Kên)**: قەیتک(ل دوربارا جل و بەرگــا و دوربارا برینێ بکار

دهێت).

**کنا(Kena)**: ئەرد ـ سنوور ـ کنار.

**کنا(Kuna)**: بکەر، کەسێ کو ب ئەنجامدانا کارەکی رادبیت.

**کنار(Kenar)**: کنار، کێلەک، ئالیەکێ تشتی.

**کنارنگ(Kenareng)**: حاکم، والی، پارێزگەر.

**کنارە(Kenarê)**: کنار، کێلەک، کنارێ دەریایێ(ساحل).

**کناغ(Kunax)**: تەڤنێ ئارمویشی ـ تەڤنێ تەڤنپیرکێ ـ کرمێ ئارمویشی.

**کناک(Kenak)**: زک ئێشی.

**کنام(Kunam)**: جهێ گیانەوەرێن درندە و گیانەوەرێن کو دچەرن ـ چەروان ـ هێلین.

**کنانە(Kenane)**: کەڤن، بەروڤاژی نوی.

**کنبورە(Kenbûrê)**: فێل، حیلە.

**کنج(Kunc)**: کونج، کوژی، قورنەت ـ کوریشک و قورمچک.

**کنج(Kenc)**: ئەزمانکێ بچویک کو ل دویماهیا گەورییێ یە ـ هەر تشتێ کو ب کەلەخێ خوەڤە ئی مەزن بت و ب هێز بت و ب تایبەتی بۆ فیلی لکارە.

**کنجار(Kuncar)**: تیڤکلێ کونجی یا پشتی کو دوهنێ وان ژێ هاتبیتە گرتن.

**کنجد(Kuncêd)**: کونجی.

**کنجک(Kuncek)**: نوی(جدید).

**کنجکاو(Kunckav)**: لێگەر، پشکێنەر.

**کنجل(Kuncul)**: مچای، قورمچی، تێکچووی، هەر تشتێ کو ژ حالەتێ خوە یێ دروست دەرکەڤیت و بچیێت وەکی: (نانێ کو دکەڤیتە بنێ تەنویرێ دا و دبیتە گلولکەکا بکێر نەهاتی، یان دەست و پێیێن کو دسوژن و ئاثارێن وان یێن سەرەکی لێ نەمینن و......هتد).

**کنجە(Kuncê)**: کەرێ کو بنێ دەڤێ وی وەرمتبیت ـ کەرێ کوری بری.

**کند(Kund)**: هێدی، کەسێ کو لدەمێ رێڤەچوونێ ب هێدی رێڤە بچیت ـ دەڤک یان شیر یان هەر تشتەکێ برەک کو نەخوەش ببیت و ب زەحمەت تشتان ببریت ـ دلێر، ئازا، پەلەوان.

**کندا(Kunda)**: زانا ـ فەیلەسووف ـ حەکیم ـ ستێرناس ـ جادووگەر ـ دلێری، پەلەوانی.

**کندامـویە(Kundamûyê)**: مـویێ کو هەر ل دەستپێکا ژ دایکبوونێ لسەر لەشێ نوبزادی هەبیت.

**کندر(Kender)**: باژێر، شار.

**کندز(Kundêz)**: کورتکریا (کهن دز) ئانکو کەلها کەڤن.

**کندش(Kundêş)**: گلولکا پەمبی کو ئامادە بیت بۆ ڕێسانێ.

**کندک(Kundek)**: چنییێت نانی، هویرکە نان.

**کندلان(Kendulan)**: خیـڤـەتا مەزن.

**کندمند(Kendmend)**: پەریشان ـ وێران، خراب، ئاڤاهییێ کو وێران و سەرابن ببیت.

**کندن(Kenden)**: جوداکرن ـ کولانا ئەردی ب ئنیەتا کویر کرنێ.

**کندو(Kendû)**: شانا زرکێتکێ.

**کندواله(Kundvalê)**: گـەنجێ ب هێز ـ کەسێ کو ب کەلەخێ خوەڤە ئی ماقویل بت.

**کنسـک(Kênêsk)**: قـــــەلس، دەخەس، بەخیل، خەسیس.

**کنش(Kunêş)**: کار و کردار.

**کنشت(Kunêşt)**: پەرستگەه، دێر، کنیشت.

**کنشتو(Keneştû)**: شوینک.

**کنفت(Kênêft)**: هەرمی، پیس.

**کنـگ(Keng)**: چـەنـگ، چـەنـگێ فرندەی ـ چەقێ دارێ.

**کنگر(Kungur)**: گەدایێ بێ شەرم ـ بوم، کوند.

**کنگر(Kenger)**: کەنگر.

**کنون(Kunûn)**: نۆکە. نهۆ.

**کنیـــز(Kenîz)**: خـــودام، ژنکا خزمـەتچی، ب تایبـەتی ژنکا کـو هاتبیتە کڕین.

**کنیزک(Kenîzek)**: خوداما کچ کو تەمەنێ وێ بچویک بت.

**کـــو(Kû)**: بۆ پرســیـــارێ دهێت، ئانکو: کا، کانێ، ل کیڤەیە.

**کوار(Kevar)**: سەلکەکا مەزنە کو فێقی پێ ڤەدگوهێزن.

**کواژ(Kevaj)**: تەعن ـ ترانە.

**کـــواش(Kuvaş)**: جـــۆر، تەرز، رەنگ، شێوە. هەروەسا (کواشە، گواش، گـواشـە، کـواس، کـواسـە) ژی لکارن.

**کـــوب(Kûb)**: درب، دربێ کـــو ژ

ئەگەرێ ڤێکەتنا بەری یان داری بگەهتە لەشی ـ ئالاڤێ کو فیلڤان فیلێن خوە پێ دهاژۆن.

**کوبل(Kûbel):** بشکوژ، بشکوفک، غونچە.

**کوبن(Kûben):** چەکویچ، چاکوچ.

**کوبیدن(Kûbîden):** قوتان، لێدان، نەرمژاندن.

**کوتار(Kûtar):** کولانکا تەنگ کو سەرێ وێ گرتی بت.

**کوتاه(Kûtah):** کورت، کن.

**کوتوله(Kûtûlê):** بالا کورت، بەژن کورت، قەزم.

**کوته(Kûteh):** کورت، کن.

**کوچ(Kûç):** بوم، تۆک ـ کۆچکرن ژ ئەردەکی بۆ ئەردەکێ دی ـ ئێل، بنەمال ـ ناڤێ ئێلەکێ یە ل نێزیک ئێلا (بەلوچی)یا.

**کوچک(Kûçek):** هویر ـ بچویک ـ د زاراوێ دەروێشان دا ئەو مریدە یێ کو ژ هەمیان بچویکتر بت ب تەمەنێ خوەڤە یان ژی نوبکار بت و ژ نوی دەست ب مریداتیێ کربت.

**کوچکین(Kûçekîn):** هویرترین ـ بچویکترین.

**کوچولو(Kûçûlû):** زێدە بچویک، کوچوچ ـ زاروک.

**کوچه(Kûçê):** کۆلان.

**کوچیدن(Kûçîden):** کۆچکرن، بارکرن ژ جهەکێ بۆ جهەک دی.

**کود(Kûd):** بێدەر ـ سەرگینا دەوارا و چێل و گولا کو ب ئەردی وەرکەن ژ بۆ ب قوەت کەتنا ئەردی ژ بۆ چاندنێ(زبل) ـ کیمیا.

**کودک(Kûdek):** زاروک، بچویک.

**کودن(Koden):** بێ فەهم، کێم عاقل، ئەحمەق، تەمبەل.

**کور(Kûr):** کورە.

**کورس(Kevers):** موی یێن خەلەک ـ قرێژ و قیڤارا لەش و جلکا.

**کوره(Kûrê):** کویرهە، ئێتوین ـ پشک، بەش، پارچەیەک ژ جهەکی.

**کوزه(Kûzê):** گوزک.

**کوژ ـ کوز(Kûj-z):** قوز، قلۆز، چەمیای، خوەهر.

**کوژپشت(Kûjpuşt):** پشت چەمیای، پشت قوز ـ درکەیە ژ ئەسمانی.

**کوژه(Kûjê):** کەرێ رەنگ سپی.

**کوس(Kûs):** درب ڤێکەتن.

**کوستن(Kûsten)**: قوتان ـ لێدان ـ ئێشاندن.

**کوسە(Kosê)**: زەلامێ کوسە کو بەس ئەرزنکا وی موی لێ هەبن و روی بێن وی د حولی بن.

**کوشک(Kûşk)**: کوشک، قەسر، ئاڤاهیێ بلند، خانیەکێ خوەش ل ژدەرڤەی باژێری و دناڤ باغ و بیستانا دا.

**کوشیدن(Kûşîden)**: پێکولکرن، سەعی کرن، خوە وەستاندن ژ بۆ بدەستڤەئینانا تشتەکی.

**کوفتن(Kûften)**: قوتان، لێدان ب ئنیەتا هەرشاندن و هویرکرنێ ـ درب ڤ تشتەکی ئێخستن.

**کوفجان(Kûfcan)**: قەفەس، جهێ تەنگ.

**کوک(Kûk)**: دریارا ژێک فرپ ـ خەس(گیایەکە).

**کوکن(Kûken)**: بوم، تۆک.

**کول(Kûl)**: مل، شان(کتف) ـ حەود، جهەک کو پچەک ئاڤ لێ خرڤە ببیت.

**کولاب(Kûlab)**: حەود ـ مەلەڤانگەھ.

**کولاک(Kûlak)**: توفان ـ پێلێن دەریایێ.

**کولخ(Kûlex)**: ئاگردانک ـ مەنقەل.

**کولیدن(Kolîden)**: کویرکرن ـ کۆلان ـ قلێب کرنا ئەردی.

**کوم(Kom)**: شینکاتیا کو لبەر لێڤێن کانی و حەود و رۆوا شین دبن.

**کومش(Komêş)**: کەسێ کو بیرا دکۆلت.

**کوندە(Kevende)**: تۆرا کو ب رەنگێ جهالی دهێتە چێکرن ژ بۆ ڤەگوهاستنا کای بکار دئینن ـ گوندۆرێ نەگەهشتی.

**کوە(Kûh)**: چیا.

**کوهان(Koham)**: کۆپار، پشتا حێشترێ.

**کوهپایە(Kûhpayê)**: دەهمەنا چیای.

**کوهسار(Kûhsar)**: جهێ کو گەلەک چیا لێ بن.

**کوهە(Kûhê)**: تەل، کۆم ـ سەمەر، ئەو بلنداهیا لسەر و بنێن زینێ هەسپی یان کورتانێ دەوارا ـ پێلێن ئاڤێ ـ هێرش کرن، هێرش برن.

**کوی(Kûy)**: تاخ ـ شاهرێ، رێکێن فرەهـ.

**کەوير(Kevîr)**: ئەردێ زێدە کەرەستێن (ئەزوت، ئوکسیژن و پتاسیوم) لێ هەبن، لەورایە ژێ چو گیا لێ شین نابن ـ سەراب.

**کويش(Kevîş)**: زەرکا شیری.

**کە(Kuh)**: چیا.

**کە(Keh)**: کا.

**کە(Kêh)**: بچویک، هویر.

**کها(Keha)**: شەرمین، شەرمەندە.

**کەهبل(Kehbel)**: نەزان، هەبلە، ئەحمەق.

**کهتر(Kêhter)**: بچویکتر.

**کهر(Keher)**: هەسپێ کو رەنگێ وی سورێ بناف رەشی ڤە بت، هەسپێ قەهوایی.

**کەهکشان(Kehkeşan)**: رێکا کادزا(مجرة).

**کهن(Kuhen)**: کەڤن ـ کەڤنار ـ دێرین.

**کهنە(Kuhnê)**: کەڤن ـ کەڤنار ـ دێرین ـ ژ کارکەفتی.

**کی(Key-Kêy)**: کەنگی، چ دەم، چ وەخت.

**کی(Kî)**: کی، چ کەس، کیژان.

**کی(Key)**: ناڤێ شاهێن کەیانی یا، وەکی کەیقوباد، کەیکاووس، کەیخوسرەو ـ شاهێ مەزن، شاهینشاهـ ـ نازناڤێ مەزنترین شاهی.

**کیا(Kiya)**: مەزن ـ خودان ـ خوداوەند ـ شاهـ ـ حاکم ـ پارێزگەر ـ پەهلەوان.

**کیاخن(Kiyaxen)**: نەرمی، نەرماتی، ئارامی.

**کیادە(Kiyade)**: رسوا، هەتک لێ چووی، بێ ناڤ بووی.

**کیار(Kiyar)**: تەمبەلی، سستی.

**کیارا(Keyara)**: خەم، نیگەرانی.

**کیان(Keyan)**: کۆما (کی) کو ئانکوا وێ دبیتە شاهێن مەزن ـ ناڤێ سنسلەکا شاهنشاهی یا ئیرانێ یە پشتی سنسلا پێشدادی یان.

**کیان(Kuyan)**: خیڤەت، رەشمال ـ ستێر ـ سەنتەرێ بازنەی(مرکز دائرة).

**کیانا(Kiyana)**: سروشت ـ ئەصلێ هەر تشتەکی ـ هەر ئێک ژ هەر چوار عونصورێن چوارگانە.

**کیبانیدن(Kîbanîden)**: لادان، ژ

رێ لادان، خوەهر چوون.

**کـیـبـیـدن(Kîbîden)**: بنێـرە: (کیبانیدن).

**کیپ(Kîp)**: پڕ، تژی، لێڤولێڤ.

**کیچ(Kîç)**: بژاله ـ پەریشـان ـ کێم، پچەک ـ هویر، بچویک ـ هێدی.

**کیس(Kîs)**: کوریشک.

**کـیـسنە(Kîsene)**: بەنکێ کـو ب تەشیێ هاتبیتە رێسان.

**کـیـسـە(Kîsê)**: کـیـسـک، تـویرک ـ بەریک.

**کیش(Kîş)**: دین، ئایین، مەزهەب ـ جـورەکێ پەروکی کـو ژ کـتـانی دهێتە چێکرن ـ کیسکێ کو تیرێن کـڤـانێ دکـەنە تێـدا ـ کش(بۆ هاژۆتنا مریشکێ یان لادانا شاهی د یاریا شەترەنجێ دا لکارە).

**کیف(Kîf)**: چانتە ـ چزدانک.

**کیفر(Keyfer)**: سزا، سزادان ـ ئەو بەرێ کو لسەردەمێن کەڤن دادنانە سـەر دیوارێ کـەلهێ و چ گـاڤـا دوژمنا هێـرش کربانە سەر کەلهێ دا بـەری بـەردەنـە نـاڤ دوژمـنـی ـ زەرکـا شـیـری یان مـەنجـەلوکـا ماستی.

**کیک(Keyk)**: بیبیکا چاڤی.

**کیل(Kîl)**: خوەهر، چەمیای.

**کیماک(Keymak)**: قەیاغ.

**کیماک(Kîmak)**: تەنگا دەوارا.

**کین(Kîn)**: کـینە، دوژمنی، نەیاری ـ عینات و نەیارتی یا کو مرۆڤ د دل دا ژ کەسەکی هلگریت.

**کینە(Kînê)**: بنێرە: (کین).

**کـیـوان(Keyvan)**: ناڤێ سـتـێـرا (زوحەل)ە.

**کیهان(Keyhan)**: جیهـان، دنیـا ـ کـۆمـا سـەییـارێن کـو ب سـەر مەنظوما شەمسی ڤەنە ـ بیاڤێ کو ستێر دناڤ دا.

# گ

**گ(Gaf):** تیپا بیست و شەشێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی و ئەڤ تیپە دناڤ زمانێ عەرەبی دا نینە.

**گـــابارە(Gabarê):** گـــاڕان ـ شکەفت.

**گات(Gat):** کەڤنترین و پیروزترین پشکا ئاڤێستایێ یە ـ سروودێن زەردەشتی.

**گـار(Gar):** پاشگرە و نیـــشــانا بکەرناڤی یە، وەکی: (آفریدگار: ئافـڕندە، آمـوزگـار: فـێـرکـەر، مـامـۆسـتـا). د زمانێ فـارسی دا ئەڤ پاشگرە ل گەلەک جهان دگەل پەیڤێن عەرەبی ژی هاتیە.

**گاری(Garî):** عەرەبانە ـ هەر تشتێ نە موکوم و بێ دەوام.

**گاز(Gaz):** ددان ـ گاز، کـێلبتـان ـ سپێنە.

**گازر(Gazur):** جلکشـۆ، کەسێ کو کارێ وی جلک شویشتن بت.

**گـــاشتن(Gaşten):** زڤـــراندن ـ چاندن.

**گال(Gal):** رینگلێن پەزێ سپی کو ب دینگێن وان ڤـە هشک دبت ـ گـارس ـ طۆری، تویری ـ فـێل، حیلە، خاپاندن.

**گـالە(Gale):** جـــهـــال ـ گلولکا پەمبی.

**گـــالیـــدن(Galîden):** رەڤین، هەلاتن، فیرارکرن، دویر کەتن.

**گام(Gam):** گاڤ، پێنگاڤ.

**گاو(Gav):** چێل و گا (د فارسی دا بۆ چێلێ «گـاو مـادە» دهێت و بۆ گای ژی دبێژن «گاو نر» و هەگەر کۆمەکا هەردووان پێکڤە دگەلێک بن دبێژن «گاوها») ـ زەلامێ دلێر و ب هێز.

**گاورس(Gavers):** گارس.

**گاوميش(Gavmîş)**: گاميّش.

**گـاه(Gah)**:وەخت، دەم، زەمـان ـ جـهـ، گـەهـ ـ تەختێ پاشـاتيێ، كـورسـيكا دەسـتـهـەلاتداريێ ـ ئامانێ كو زێر و زيڤا تێدا دحەليێن ـ ئەڤ پاشگرە ل دويماهيا دو جۆرە نـاڤـــــان دهێت، يـێ ئـێـكـێ دەمناڤ(اسم زمـان) ژێ چێـدبت، وەكى: (سـحرگـاه: دەمێ سپـێدە، شـامگـاه: دەمێ شـەڤێ) و يێ دووێ جـــهناڤ(اسم مكان) ژێ چێـدبت، وەكى: (پرسـتـشـگـاه: پەرسگەهـ، جهێ پەراستنێ).

**گاهنبار(Gahenbar)**: ناڤێ شەش جـەژنانە كـو هەر ئێـك ل دەمـەكى سـالێ ژ لايێ ئيـرانيـان ڤە دهاتنە كـرن ـ ناڤێ وان شـەش دەم يان شـەش رۆژانە كـو خـودێ مـەزن جيـهـان چێكرى. هەروەسا پەيڤێن (گـهنبـار، گـاهانبـار، گـاهبـار، گهبار) ژى لكارن.

**گـــــاهواره(Gahvarê)**: لاندك، لەهندك.

**گبر(Gebr)**: زەردەشتى، كەسێ كو بدويڤ ئـايينێ زەردەشـــتـــيێ كـــەتى(ئەڤ نـاڤـــە پشـــتى مــوسلمـــانەتيێ يێ مـــايە ب زەردەشتياڤە).

**گبر(Geber)**: جۆرەكێ بەرى يە كو ترارك و مـــەنجـــەلۆك و ديز ژێ دهێنە چێكرن.

**گـبـرگـه(Geburge)**: جـۆرەكێ وەرزشا كەڤنا ئيرانى يە.

**گبز(Gebz)**: مەزن، ب كەلەخ ـ ب هێز.

**گت(Get)**: مەزن(عظيم، كبير).

**گـجـســتـه(Guceste)**: پيس و نەپيروز، خەبيس، مەلعون.

**گچ(Geç)**: گـێچ(كـەرەستـەكـە كـو بۆ ئاڤـاهيـا و پەيكەرسـازيێ بكار دهێت).

**گـــدا(Geda-Gêda)**: گـــەدا، سوالكەر، خازخازۆك.

**گداختن(Gudaxten)**: حەلاندن.

**گدار(Gudar)**: كـويراتيـا بنێ دۆلێ ـ رێك، جهێ تێڕا بۆرينێ.

**گدازيدن(Gudazîden)**: حەلاندن.

**گـدوك(Gedûk)**: ئەو در ژ چيـاى كو پرى بەفر بت و ئەو بەفر ببيتە كـــوسپ د رێيـــا هاتن و چۆنێ لوێرێ.

**گذار(Guzar)**: بۆرين د جـهـەكى ڕا

ـ جهێ تێرا بۆرینێ.

**گـــــــذاردن(Guzarden):** دانان، دەیناتن(تشــتــەک ل جــهـــەکی دەیناتن یان دانان).

**گذر(Guzer):** بنێرە: (گذار).

**گــذرا ـ گــذران(Guzera- an):** چۆوەک، وەکی: (آب گـذرا: ئاڤـا کو بچیت).

**گذراندن(Guzeranden):** تشتەک د جهەکی را بۆراندن ـ کارەک بجه ئینان.

**گذشت(Guzeşt):** بۆری(د جهـەکێ را بۆری) ـ لێبۆری، عەفویکر.

**گـــذشتن(Guzeşten):** بۆرین(د جـهـــەکێ را بۆرین) ـ لێــبــۆرین، عــەفــویکرن ـ بدویاهیک هاتنا وەختی.

**گر(Ger):** هەگەر ـ پاشگرێ بکەر و بکـەرناڤـی یە، وەکـی: (آهنـگر: ئاسنگر، زرگر: زێرنگر و ستمگر: زالم) ـ گـورپاتی(ئێک ژ ئێشـێن پوبستی یە).

**گر(Gur):** گوڕیا ئاگری.

**گرا(Gerra):** عەبد، بەنی، خولام.

**گـراز(Guraz):** بەراز ـ بێـرکـەکـا مــەزن و پەحنە کــو دو کــەس ب هەڤـرە بکار دئینن ژ بۆ راسـتکرنا ئەردێ قلێب کری ـ گوزک.

**گـــــــرازیدن(Gurazîden):** ب نازداری و دفنبلندی برێڤەچوون.

**گرامی(Gêramî):** عـەزیز، هێـژا، بەرێز.

**گـــران(Geran):** گـــران(هەم بۆ سەنگێ و هەم ژی بۆ بهای).

**گران(Guran):** کەفەکا گەنمی یان جەهی کو هاتبیتە دروین.

**گــراییــدن(Gerayîden):** دل ب تشتەکی دان ـ هێرش برن.

**گـربز(Gurbuz):** زیرەک ـ دلێــر ـ فێلباز.

**گربە(Gurbê):** پشیک، کێتک.

**گــرد(Gerd):** توزک، ئاخــا نەرم، غوبار.

**گرد(Gêrd):** گروڤر، خڕ ـ دەوروبەر، چان و رەخ.

**گرد(Gurd):** دلێر، پەلەوان.

**گرداب(Gêrdab):** زڤرۆکا ئاڤێ.

**گــرداس(Gurdas):** ســتــەمگەر، زالم.

**گرداندن(Gerdanden):** زڤراندن، بادان.

**گردباد(Gêrdbad):** بابەلیسک.

**گردن(Gerden)**: ستۆ، گەردەن.

**گردنە(Gerdenê)**: ڕێکێن تەنگ و پڕ ئاستەنگ ل چیای.

**گردو(Gêrdû)**: گویز.

**گـــــردون(Gerdûn)**: چەرخ، هەر تشـــتێ کـــو لدور خـــوە یان لدور تەوەرەکی بزڤرت ـ ئەسمان.

**گـردیدن(Gerdîden)**: گـەڕیان ـ زڤڕین ـ گوهاڕتن ـ بوون، چێبوون.

**گرز(Gurz)**: گورز(ئالاڤەکێ شەڕی یە کـو ل سـەردەمـێن کـەڤن دهاتە بکارئینان).

**گـرزش(Gerzêş)**: گلە و گـازندە، دالەهی.

**گرزمان(Gerzuman)**: ئەسـمـان، عەرش.

**گرزن(Gerzen)**: تانج.

**گــرزە(Gerze)**: مــارێ مــەزن، جـورەکێ مـاری یە کـو سـەرێ وی مەزنە.

**گرزیدن(Gerzîden)**: زێمـار کـرن، گرین ـ تەوبەکرن.

**گرسنە(Gurêsnê)**: برسی.

**گرفت(Gêrêft)**: وەرگرت ـ غەرامە ـ تەعن.

**گرفتار(Gêrêftar)**: دیل، ئێخسیر، بەندکری.

**گـرفتن(Gêrêften)**: سـتـانـدن، وەرگرتن ـ تێکهەل بوون.

**گرگ(Gorg)**: گورگ.

**گرگین(Gergîn)**: گـیـانـەوەرێ کـو تووشی ئێشا گوریاتیێ بووبت.

**گرم(Germ)**: گەرم.

**گرم(Gurm)**: خەم ـ برین(جرح).

**گرما(Germa)**: گـەرمـە، بەروڤاژی سەرمایێ.

**گـرمـابە(Germabê)**: حـەمـام، گەرماڤ.

**گرمسیر(Germsîr)**: گەرمیان.

**گرنج(Gurênc)**: کوریشک ـ گرێ ـ کونج، کوژی ـ برنج.

**گـــــــرو(Gêrev- Gêruw)**: مەرج(شرط) ـ ڕەهینە، گرەو.

**گروە(Gurûh)**: دەستەک، کۆمەڵ.

**گروهە(Gurûhê)**: گلولک، وەکی: (گلولکا پەمبی) ـ گرگێن هەڤیری ـ دەستەک، کۆمەلە.

**گــرویدن(Gêrevîden)**: باوەری ئینان ب کەسەکێ یان تشـتـەکی، گــــــــــەهـشـتن ب ڕیـزێـن دەستەکەکێ(التحاق).

**گرە(Gêrêh)**: گرێ، گرێک(گرێیا

بەنکی یان گرێکا دارێ) ـ ئێک ژ یەکێن پیڤانێ یە کو بەرامبەری ١/١٦ گەزێ یە.

**گـــریاندن(Gê-Geryanden):** گرياندن، کەسەک مەجبورکرن کو بکەتە گری.

**گـــریانندە(Gêryanendê):** ئەو کەسێ کو کەسەک دی بگرينت.

**گریبان(Gêrîban):** یاخە، پستۆک.

**گـــریختن(Gurîxten):** رەڤین، هەلاتن، فیرارکرن.

**گریز(Gurîz):** فیرار، رەڤ.

**گـــــریزاندن(Gurîzanden):** رەڤاندن، فیراریدان.

**گریستن(Gêrîsten):** گرین، روندک رێتن. هەروەسا بۆ کەسێ کو دکەتە گری، پەیڤێن (گرینده و گریان) لکارن، لێ جیاوازیا دناڤبەرا هەردوان دا ئەوە کو (گرینده) بکەرناڤە و (گریان) صیفەتە.

**گریغ(Gurîx):** بنێرە: (گریز).

**گـــریوارە(Gêrîvarê):** رستک، گەردەنی.

**گـــریوان(Gêrîvan):** بنێرە: (گریبان).

**گریون(Gerîven):** ئێشا گورپاتی.

**گریوە(Gerîvê):** تەل، گر.

**گریە(Gêrye):** گری، رۆندک رێژی.

**گز(Gez):** گەز(یەکەیەکا پیڤانێ یە بەرامبەری ١٦(گرە)انە، و ب عەرەبی دبێژنێ «ذرع» ـ ناڤێ دارەکێ یە ـ گەزۆ(جورەکێ شریناهیێ یە).

**گـزاردن(Guzarden):** ئەداکرن، بجهـ ئینان، ئەنجامدان.

**گـزارش(Guzarêş):** ریپورتاژ، شرۆڤەکرنا خەبەرەکی یان کارەکی کو هاتبیتە ئەنجامدان.

**گـزاریدن(Guzarîden):** بنێرە: (گزاردن).

**گزاف(Gêzaf):** زێدە، گەلەک، بێ سینور ـ بێهودە، پویچ، ئاخفتنێن پویچ و بێ مفا.

**گزاک(Gezak):** هەر گیانەوەر یان مورەکێ کو ژەهردار بیت و مرۆڤی بگەزیت(ب مرۆڤی ڤەدەت).

**گزاییدن(Gezayîden):** پێڤەدان، لەق لێدان و ئازار گەهاندن.

**گزر(Gezer):** گێزەر.

**گـــزر(Guzêr):** چارە، چارەرێ، عیلاج.

**گـزک(Gezek):** گـەزەک، دەڤگر،

هەر تشــتێ كــو تامــا ســەرەكى بگوهوريت و تامـا دەڤى نەخـوەش كـەت ـ دەليـڤـا باش و هلكەتى بۆ ئەنجـامــدانا كـارەكى ـ سـەرمـا و سرێ برى.

**گزمە(Gezme):** زێرەڤان، حەرەس.

**گــزند(Gezend):** درب ـ ئازار ـ ئاتاف ـ رێنج و زەحمەت.

**گــزيدن(Gezîden):** لەق دانان ـ پێڤەدان.

**گــزيدن(Guzîden):** هەلبــژارتـن، پەسەندكرن و ڤاڤێركرن.

**گـــــزير(Guzîr):** چارە، چارەرێ، عيلاج.

**گـزيردن(Guzîrden):** چارەكـرن، عيلاج كرن، چارەرێ ژێرا ڤەديتن.

**گزينە(Guzînê):** هەلبژارتى.

**گژار(Gujar):** بەرچێلكا مريشكێ.

**گس(Ges):** تاما كـو دبيتـە ئەگەرێ دەڤگريێ، وەكى: تـامـا فـێـڤـيێ نەگـــەهشـــتى، يان كــارى يا نەخەساى.

**گـــــســـــــاردن(Gusarden):** خـوارن(بگرە ژ نـان خـوارن، مـەى ڤەخوارن، خەم خوارن و......هتد).

**گست(Gest):** كرێت، نەجوان.

**گـستاخ(Gustax):** نەترس، دلێر ـ بێ ئەدەب، ئەدەب سـز. هەروەسـا پەيڤێن (وستاخ، بستاخ، استاخ، اوستاخ و بيستاخ) ژى لكارن.

**گـسـتـرانيـدن(Gusteranîden):** پەحن كرن، رائێخستن.

**گـــســـتـــردن(Gusterden):** پەحن كرن، رائێخستن.

**گستە(Geste):** هەر تشتەكێ كرێت و نەجوان ـ سەرگێن.

**گـستن(Gusêten):** برين ـ ژ هەڤ جوداكرن.

**گسلاندن(Gusêlanden):** دراندن ـ برين.

**گـسـيل(Gusîl):** رەوانە. گـســيل كـــــردن: رەوانەكـــــرن، وەكـى: (رەوانەكرنا كەسەكى بۆ جهەكى، يان رەوانەكــرنا هاريكاريەكێ بۆ كەسانێن لێ قەوماى و......هتد).

**گـشـاد(Guşad):** ڤـەكـر ـ بەردا، رەهاكـر ـ بەردانا تيـرێ ژ كڤـانێ ـ فرەه ـ پەحن، پان.

**گـشـادن(Guşaden):** ڤـەكـرن ـ بەردان، رەهاكرن.

**گـشـت(Geşt):** گـەشت و گـوزار، گەريان.

**گشت(Gêşt)**: هەمی بهەڤرە، پێکڤە، ب گشتی.

**گشتا(Guşta)**: بەهەشت، فردوس.

**گشتن(Geşten)**: گەریان ـ دەور لێدان، لدور زڤرین ـ بوون، چێبوون.

**گشتی(Geştî)**: زێرەڤانێ کول جهەکێ دیارکری ڕا بهێت و بچت ژ بۆ بجهـ ئینانا ئەرکێ خوە یێ زێرەڤانییێ.

**گشسب(Guşesb)**: هەسپ.

**گشن(Geşn)**: گەلەک، مشە، زێدە، پڕ، تژی.

**گشن(Guşn)**: گەنج ـ مێرانە ـ نێر ـ دارا خورمێ یا نێر.

**گشنی(Guşnî)**: گوهنێلی(عملية جنسي ـ تلقيح).

**گشودن(Guşûden)**: ڤەکرن ـ رەهاکرن، بەردان.

**گفتار(Guftar)**: گۆتار ـ ئاخفتن.

**گفتگو(Guftugû)**: گفتوگو، دان و ستاندن.

**گفتن(Guften)**: گۆتن، ئاخفتن.

**گل(Gul)**: گول.

**گل(Gêl)**: تەقن، هەری.

**گل(Gel)**: حەفک ـ ستۆ، گەردەن.

**گلاب(Gulab)**: گولاڤ.

**گلابی(Gulabî)**: هرمیک.

**گلاندن(Gelanden)**: هەژاندن، داقوتان(داقوتانا دارا ب بار کو فێقیێ وێ ژێ بکەڤت).

**گلاندن(Gellanden)**: گرێلکرن.

**گلاویز(Gelavîz)**: هلاویستی.

**گلاویز شدن(Gelavîz şuden)**: هەڤپیشی هەڤ بوون، دبن چەنگێن هەڤرا چۆن.

**گلایه(Gêlayê)**: گلە و گازندە، دالەهی.

**گلخن(Gulxen)**: ئاگردانکا حەمامێ، جهژنەما حەمامێ.

**گلزار(Gulzar)**: گولزار، گولستان.

**گلست(Gelest)**: گەلەک سەرخوەش، زێدە مەست.

**گلو(Gelû)**: حەفک، گەلالیشک.

**گلوله(Gulûlê)**: گلولکا پەمبی یان بەنکا ـ گولله، تەلقە، فیشەک.

**گلوند(Gelvend)**: خەلات، هەدیە ـ گەلوازێ خواردەمەنی یێن وەکی هێژیرا.

**گله(Gêlê)**: گلە و گازندە، دالەهی.

**گله(Gele)**: گارانا حێوان و دەوارا، برا پەزی.

**گلەبان(Geleban)**: شڤان.

**گليــز(Gêlîz)**: گليــز، ئاڤــا دەڤێ مرۆڤ و گيانەوەرا.

**گليزە(Gêlîzê)**: گوزک.

**گليم(Gelîm)**: بەرک، جــورەکێ رائێــخێ يە کــو ژ بەنکێن پەمــبی يان هريێ دهێنە چێکرن.

**گلين(Gêlîn)**: تشــتێن کــو ژ ئاخ و تەڤنێ دهێنە چێکرن.

**گم(Gum)**: هندا، بەرزە، نەديار.

**گـمــاردن(Gumarden)**: دانان، دامەزراندن، تەعين کرن.

**گـمــاشتن(Gumaşten)**: بنێــرە: (گماردن).

**گمان(Guman)**: گومان، شک.

**گمـانيدن(Gumanîden)**: گومان کرن، هزرکرن، بۆچوون، شک برن.

**گــمـــراه(Gumrah)**: رێ بەرزە ـ کـەسێ کـو لســەر رێ يا راست دا چۆيت(سەر رێدا چۆی).

**گـمـيـختن(Gumîxten)**: ناڤـێک هەلکرن، تێکهەلکرن ـ ميزتن.

**گميز(Gumîz)**: ميز.

**گميزيدن(Gumîzîden)**: ميزتن.

**گناه(Gunah)**: گــونەه، کــارێ خراب، بێ ئەمری.

**گنبد(Gunbed)**: گونبەد، قوبە.

**گنج(Genc)**: خزينە.

**گنجار(Guncar)**: سۆراڤ.

**گـنـجـــــاندن(Guncanden)**: گونجاندن(جهێ تشتەکی ل جهەکی يان د تشتەکێ دی دا کرن.

**گنجـشک(Guncêşk)**: چويچک، سڤيانک.

**گنجــور(Gencûr-Gencver)**: خودانێ خەزينێ.

**گنجـيـدن(Guncîden)**: گـونجين، گونجان(جهێ تشتەکی ل جهەکێ دی يان لناڤ تشــتــــەکێ ديدا بوون).

**گنجـينه(Gencînê)**: گـەنجــينە، جهێ گەنج لێ، جهێ خەزينە لێ.

**گند(Gend)**: بێهن پيس، گەنی.

**گند(Gund)**: گـون، رطل ـ سـوپا، لەشکەر.

**گنداندن(Gendanden)**: گـــەنی کرن.

**گندم(Gendum)**: گەنم.

**گـنـدمـگـون(Gendumgûn)**: گەنمۆکی، روی گەنمۆکی.

**گنده(Gundê-e)**: مەزن، ب کەلەخ ـ گلولکا پەمبی ـ گرکا هەڤيری.

**گنده(Gende)**: گەنی، بێهن پیس.

**گندیدن(Gendîden)**: گەنی بوون، پوبچ بوون، پیس بوون.

**گنگ(Gung)**: کەسێ کو نەشێت باخڤت، بێ ئەزمان ـ بۆری یێت کو ژ تەقنێ دهاتنە چێکرن ژ بۆ ڤەگوهاستنا ئاڤا بن ئەرد ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی.

**گنگار(Gungar)**: مارێ کو ژ نوی تیڤلێ خوە ئاڤێتی.

**گنگلاج(Gunglac)**: لالوتە، تورتوری.

**گو(Gev)**: دلێر، پەلەوان ـ باشتر، مەزن.

**گو(Gû)**: گۆ، هەر تشتێ خڕ و گروڤر.

**گواچو(Guvaçû)**: هێزک.

**گوارا(Guvara)**: هەر تشتێ خوارنێ یان ڤەخوارنێ کو ب تام بت و زوی (هضم) ببیت.

**گوارش(Guvarêş)**: کریارا کو ئاشک و ریڤیک پێ رادبن. دستگاه گوارش: جهاز هضمی، کو ژ دەڤ، گەوری، مەری، ئاشک و ریڤیکا پێک دهێت.

**گواره(Gevarê)**: گاڕانا حێوانا.

**گواره(Gevare-ê)**: لاندک، لەهندک.

**گواز(Gevaz)**: چویڤ، دارێ کو گا و کەرا پێ دهاژۆن.

**گواژ(Gevaj-jê)**: تەعن لێدان، یاریپێکرن، ترانە.

**گوال(Geval)**: جهال.

**گوالیدن(Guvalîden)**: نەموکرن، شین بوون و مەزن بوون ـ خڕڤەکرن، کۆمکرن.

**گواه(Guvah)**: شاهد، دیدەڤان.

**گوجەفرنگی(Gocê ferengî)**: تەماتە، باجان سۆرک.

**گود(God)**: کویر.

**گودال(Godal)**: چال، جهێ کویر.

**گور(Gûr)**: گۆڕ، قەبر، زیارەت ـ بیابان ـ کەرێ وەحشی.

**گوراب(Gûrab)**: گۆرە ـ سەراب ـ قوبا کو لهنداڤ گۆڕی دهێتە ئاڤاکرن.

**گورستان(Gûrêstan)**: گۆڕستان.

**گوز(Goz)**: گویز.

**گوزن(Gevezn)**: شڤر.

**گوساله(Gûsalê)**: گۆلک.

**گوسفند(Gûsfend)**: پەزێ سپی، میە.

**گوش(Gûş)**: گوهـ.

**گـوش(Guvêş)**: ئاخـفتن، ئاخـفتن کرن.

**گوش(Goş)**: د ئايينێ زەردەشتى دا خوداڤـەندێ زێرەڤانێ گيـانەوەرێن چارپێ يە. هەروەسـا ناڤێ رۆژا چواردێ يە ژ هەر هەيڤـەکـا سـالا هەتاڤى.

**گوشـاسب(Gûşasb)**: خـەو، خـەوا خوەش.

**گوشت(Gûşt)**: گۆشت.

**گـوشـزد(Gûşzed)**: بيـرئيـنانەڤـە، ئاگەهدارکرنەڤە.

**گـوشـمـالى(Gûşmalî)**: درکـەيە ژ تەنبيهـ کرن و ئەدەب کرنێ.

**گـوشـوار(Gûşvar)**: گـوهارک ـ وەکى گـوهى ـ کـونجـا ژۆرێ، قولاچکا مەزەلکێ.

**گـوشـه(Gûşê)**: کـوژى، کـونج، قولاچک، قورنەت.

**گـوشـيـدن(Gûşîden)**: گـوهدان، گوهداريکرن.

**گوگار(Gûgar)**: کێزگلولک.

**گوگرد(Gûgêrd)**: کبريت(سولفور).

**گول(Gûl)**: هەبله، نەزان ـ ئەحمەق ـ فێل، حيله.

**گـون(Gûn)**: رەنگ، جـور(نوع) ـ وەک پاشگر ل دويماهيکا هندەک پەيڤـان دهێت و ئانکوێن (وەکى و جۆر) دگەهينت، وەکى: (آذرگون: وەکى ئاگرى ـ نيلگون: ب رەنگێ نيلى).

**گوناگون(Gûnagûn)**: جوراوجور، رەنگاورەنگ.

**گـــونه(Gûnê)**: روى، ئـالەک ـ رەنگ، جور، تەرز، شێواز.

**گـونى(Gûnî)**: تەليس، تەليـسێ کورکى.

**گـــونيـــا(Gûnya)**: دەپکـەکێ سێگوشەيە کو ئێک ژ کوژيێن وێ نوت دەرەجــەيە و هەردووێن دى، هەر ئێک چل و پێنج دەرەجەنە و د زانستێ هەندەسێ دا گەلەک بکار دهێت.

**گـوهر(Goher)**: جـەهوەر، نەژاد، ئەصل ـ گەوهەر(بەرەکێ گرانبهايە وەکى زەمريد و ياقوتێ).

**گويا(Gûya)**: بێژەر، ئاخفتنکەر ـ هەروەسـا بەرامـبـەرى پەيڤـێن (دبێژت، سەکو)يێن کوردى يە.

**گويش(Gûyêş)**: گۆتن، ئاخفتن ـ گۆتار.

**گهبد(Gehbud):** خەزینەدار.
**گـەگـاه(Gehgah):** جـارجـار، هندەجارا.
**گـهـواره(Gehvarê):** لاندک، لەهندک.
**گیـاه(Giyah):** گـیـا، شـینکاتی. هەروەسا پەیڤـێن (گـیـا، گـیـاغ، کیاغ) ژی لکارن.
**گیتی(Gîtî):** گێتی، جیهان، دنیا ـ رۆژگار.
**گیج(Gîc):** گێژ ـ حەیران.
**گیرا(Gîra):** دلراکێش.
**گـیـراندن(Gîranden):** ئاگـر هەلکرن، ڤێخستن.
**گـیـس(Gîs):** مـوی یێن درێژ، ب تایبـەت یێن ژنکا کـو ژ پشت ڤـە گەلەک درێژ بیت.
**گـین(Gîn):** ئـێـک ژ پـاشـگـرێـن وەکـهـەڤی و سـالوخـدانێ یە، و ئانکوییێن (پڕ و تێـڤـەدای) ددەت، وەکی: (شـرمگین: پڕ شـەرم، شـەرمین ـ اندوهگین: د خـەمێ ڤەدای، خەمگین) ددەت.
**گیهان(Geyhan):** جیهان، دنیا.



**ل(Lam):** تیپا بیست و حەفتێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی.
**لا(La):** دناڤرا، دناڤدا.
**لابە(Labe):** بێ هێـزی ـ زێمـار ـ هیڤی و داخوازی ـ مەللاقی.
**لابیدن(Labîden):** بێ هێز بوون، زێمارکرن ـ هیڤی کرن، داخوازکرن ـ مەللاقی کرن.
**لات(Lat):** فەلیتە، کۆلانی ـ مرۆڤێ هەژار و زەعیف حال، دەستکورت.
**لاتو(Latû):** پێـسـتـرک، دەرەجک، پەبیسک.
**لاج(Lac):** رویس، تازی ـ دێهل.
**لاخ(Lax):** ئێک ژ پاشگرێن جـهی یە و نیـشـانا گـەلەکی و زێدەهیـا تشـتەکی ل جهەکی ددەت، وەکی: (سنگلاخ: جهێ گەلەک بەر لێ ـ نمـک لاخ: ئـەردێ پـڕ خـــــوێ و......هتد) ـ کۆمەکا تشتێن زراف و درێژ، وەکی مـوی یانژی شـاکێن مێوێ و چەقێن دارێ و......هتد.
**لاخە(Laxe):** پنی.
**لاخەدوز(Laxedûz):** پنی دۆز.
**لاد(Lad):** حـــەریر، ئـارمـــویش، پەڕۆکێ نەرم ـ دیوار، دیوارێ کو ژ لبن و تەقنێ هاتبـیـتـە چێکرن ـ ئاساس، شەنگستە.
**لادە(Lade):** بێ عـــاقل، هەبلە، دەبەنگ ـ ئەحمەق.
**لاس(Las):** جورەکێ ئارمـویشێ ب کـــێـــر نەهاتی یە ـ مێ یا هەر گـیـانەوەرەکی و بتـایبـەتی بو (دێهل)ێ لکارە.
**لاسـیـدن(Lasîden):** لاسـیـدن، یانـژی لاس زدن، ئانـکو: لـدویڤ کـەفـتنا گیـانەوەرێ نێـر ل پەی یا مێ ـ هەروەســا دەست ب رویێ کچێ یان ژنێ دا ئینانەخوار.

**لاش(Laş):** کەلەخ، کەلواش، کەلەخێ گیانەوەرێ مرار ـ پویچ و ب کێر نەهاتی ـ لەغەر ـ بسەرداگرتن و دزی و تالان.

**لاشبەرگ(Laşberg):** بەلگێ ژ دارێ کەفتی کو ب کێر چو تشتەکی نەهێت.

**لاشخور(Laşxor):** قورت، تەیرێ کەلەخا.

**لاشە(Laşe-ê):** بنێرە: (لاش).

**لاغ(Lax):** یاری، ترانە.

**لاغر(Laxer):** لەغەر، لاواز، مرۆڤ یان گیانەوەرێ زەعیف و بێ گوشت.

**لاف(Laf):** ئاخفتنێن پویچ و بێ مەعنا ـ زێدە پەسنا خوەکرن ـ خوەپەرێسی.

**لافیدن(Lafîden):** خوەپەراستن ـ زرتێ خوە دان، پەسنێن بێ بنیات ژ خوەکرن ـ ئاخفتنێن بێهودە بەردان.

**لاک(Lak):** ترارکێ داری، کۆد.

**لاک پشت(Lak puşt):** کوبسەلە. هەروەسا ناڤێن دی یێن وی: (سنگ پشت، خشک پشت، کاسە پشت، کشف، کشتوک، کشو و باخە)نە.

**لال(Lal):** لال، لالوتە ـ سۆر، رەنگێ سۆر.

**لالس(Lales):** جورەکێ پەرۆکێ ئارمویشی یێ رەنگ سۆرە.

**لالک(Lalek):** پێلاڤ ـ کومرکا دیکلی.

**لالکا(Laleka):** کالە، پێلاڤا کو گوندی دکەنە پێ خوە. هەروەسا ناڤێن (لکا، لخا و لالک) ژی بۆ دهێتە گۆتن.

**لالنگ(Laleng):** نانێ کو ژ گەداییێ ڤە بدەست دکەڤیت ـ خوارنا کو خەلکێ هەژار بۆ خوە ژ سەر سفرێن مێهڤاندارا ڕاکەن و ببەن.

**لالە(Lale-ê):** پشکەک ژ چراکی کو شەمالک دکەڤیتە تێدا ـ جورەکێ گولێ یە ژی کو لدەڤ مە دبێژنێ بیتانوک.

**لالەزار(Lalêzar):** جهێ کو مشە گولێن بیتانوک لێ هەبن ـ ناڤێ جادەکا ناڤدارە ل تەهرانا پایتەختێ ئیرانێ.

**لام(Lam):** گیایەکێ ب ناڤێ «اسپند» یانژی مسک یان عەنبەر

دهێتـه سوتاندن و بجی مـایا وێ وەک دەرمـان دهێـتە بکارئینان بۆ چاڤ کولییێ، کو شێویێ بکارئینانا وێ ژی ئەوە کـو، ئەڤ دەرمـانە ب رەنگێ تیـپـا (ل) لسـەر ئەنی یان بنێ گوهێ بچویکا دهێتە چێکرن، و خەلک یێ ل وێ باوەرێ کو بڤی رەنگی دێ چاڤ کولیا زاروکێ وان بەرەڤ چێـبـوونێ چیت ـ جلکێ دەروێـشـــا ـ زیڤ و زینـەت و کـەمــەربەند ـ ئاخـڤـتنێن پویچ و بێهودە.

**لامان(Laman):** فریو، حیلە، فێل ـ درەو، نەوەیی ـ ئاخفتنێن بێهودە و بێ مەعنا ـ ترانە و یاری پێکرن ـ چست و چەلەنگ.

**لامـــانی(Lamanî):** مـــەللاق و مـەللاقی ـ پڕ بێـژ و پڕ بێـژی ـ بێ باوەری ـ درەو، نەوەیی.

**لامە(Lame):** دەرسوک یان شاشکا کـو لســەر دەرسـوک یـان کـولاڤی دهێتە ئالاندن.

**لان(Lan):** چال ـ نیـشـانە ژ جـهێ زێدەهیـا تشـتـەکی، وەکی: (ئمک لان: جهێ کو زێدە خوێ لێ هەی) ـ بێ وەفایی.

**لانجین(Lancîn):** ترارکێ مەزن.

**لانـــدن(Landen):** هـــەژانـــدن، لڤاندن.

**لانە(Lane-ê):** هێلین ـ خـــانی ـ شانا زرکێتکێ ـ کەدوەر، تەمبەل.

**لاو(Lav):** ئاخ سپـیکا کـو دیوارێن خــانـی پێ دهێنە ســپـــیکرن ـ مـــــەللاقی ـ ژ دەست چوویی، نەمای.

**لاوک(Lavek):** ترارکێ مـــەزن ـ لەگەن، تەست(تەسـتا بچـویک یا کو هەڤیری تێدا دکەن).

**لاوە(Lave):** بنێرە: (لابە).

**لاە(Lah):** بنێرە: (لاس).

**لاهورە(Lahûrê):** کـــــویزی یـان تویزی یێ گوندوری یان زەبەشی.

**لایە(Layê):** هەر تشـتێ کو بهێـتە دانان ل ناڤ تشتەکێ دی ڕا.

**لاییــــــدن(Layîden):** نـالـین، زێمارکرن ـ لوبرین ـ ژ بەر ئاخفتن.

**لب(Leb):** کناڕێ هەر تشـتــەکی، وەکی: (لب دریا: کناڕێ دەریایێ، بەر لێــڤــا دەریایێ) ـ لێڤ. هەروەســا پەیڤــێن (لو ـ لفچ ـ لفچە) ژی لکارن.

**لباچە(Lebaçê):** کەپەنە ـ جبە.

**لبالب(Lebaleb)**: لێڤولێڤ، دلێڤارا، تژی، پڕ.

**لبخند(Lebxend)**: گرنژین، بشکورین.

**لبریز(Lebrîz)**: بنێره: (لبالب).

**لب شکری(Leb şêkerî)**: لێڤ کەم(کەسێ کو ئێک ژ لێڤێن وی بری یان کەم بیت). هەروەسا پەیڤێن (سەلنج و سلنج) ژی لکارن.

**لبو(Lebû)**: سلکێن کەلاندی. (لبلبو) ژی لکاره.

**لبه(Lebê)**: وەکی لێڤا ـ کنار و لێڤا هەر تشتەکی.

**لبیدن(Lebîden)**: ئاخفتنێن بێهوده کرن ـ ژ بەر ئاخفتن.

**لبینا(Lebîna)**: ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن کەڤنێن موزیکی یە.

**لپ(Lup)**: هوندرێ دەڤی ـ هەردو ئالیێن ژناڤدا یێن ئالەکا.

**لپه(Leppe-ê)**: پرتەک یان ئالیەک ژ لبەکێ یان دندکەکێ، وەکی: (لبا نوکێ دبیته دو پرت، د زمانێ فارسی دا بۆ هەر پرتەکێ دهێته گۆتن «لپه»).

**لت(Let)**: شەق، زللەه ـ پرت و ریتالەک ژ هەر تشتەکی وەکو کاغەز و پەرۆکی.

**لت انبار(Letenbar)**: ب خواره، پڕ خوەر. هەروەسا (لتنبار، لتنبیر و لت انبان) ژی لکارن.

**لتره(Letre)**: کەڤن ـ دڕیای.

**لتره(Lutre)**: جوره زمانەک کو چەند کەسەک بۆ خوه پێک بینن و پێ باخڤن، کو ژ بلی وان کەسەک تێ نەگەهیت، وەکی: (چزاڤزی و سەیدێ مەیدێ).

**لته(Lette-ê)**: ریتالا پەرۆکێ کەڤن.

**لج(Lec)**: پێهن، پەحین.

**لجن(Lecen)**: کوربەقک. هەروەسا پەیڤێن: (لجم، لژن، لژم، بژن، لوش، لش و کیوغ) ژی لکارن.

**لچ(Leç)**: روی، روخسار.

**لچ(Luç-Lûç)**: رویس، تازی.

**لچر(Leçer)**: مرۆڤێ پویچ و شویشتی ـ پیس، قرێژی.

**لچک(Leçek)**: دەرسوکا سێ گۆشە یا کو ژنک دکەنە سەرێ خوه.

**لخت(Luxt)**: رویس، تازی.

**لخت(Lext)**: پشک، باهر، پرتەک ژ هەر تشتەکی.

**لختە(Lextê)**: بنێرە: (لخت).

**لخچە(Lexçê)**: گوڕیا ئاگری.

**لخشک(Lexşek)**: حولیسانک، تەحیسانک ـ جورەکێ خوارنێ یە.

**لخشیدن(Lexşîden)**: حولسین، تەحسین.

**لخلخ(Lexlex)**: زەعیف، بێ هێز، لەغەر، لاواز.

**لخم(Luxm)**: گوشتێ نەرمە(گوشتێ بێ بەز و دینگ و هەستی).

**لر(Lur)**: مەخسەد، مراد، ئامانج، داخواز ـ بەرخکا میهێ ـ ناڤێ ئێلەکا مەزنە کو ل لورستانێ دژین.

**لر(Ler)**: جۆ، جۆوا ئاڤێ ـ هەمبێز ـ لاواز، لەغەر.

**لرد(Lerd)**: بیابان ـ مەیدان، مەیدانا بەزاندنا هەسپا.

**لرزاندن(Lerzanden)**: لەرزاندن ـ هەژاندن ـ لڤاندن.

**لرزیدن(Lerzîden)**: لەرزین ـ هەژیان ـ لڤین.

**لزیر(Lezîr)**: زیرەک، زانا، ب ژیر، عاقل ـ موئمن، قەنجیکار، کەسێ کو خوە ژ کارێن خراب بدەتە پاش و باشی ژێ چێ ببن.

**لس(Les)**: سست، تەمبەل ـ پەریشان، پێکداچووی، چرمسی.

**لست(Lest)**: ب هێز، ب زاخ ـ ستویر، زەخم ـ موکوم.

**لش(Leş)**: کەلواش ـ کەلەخ ـ تەمبەل، کەدوەر ـ سست و بێ هێز.

**لشاب(Luşab)**: شێل(ئەردێ کو ئاڤ لێ براوەستیت و گیا و قەڕام لێ شین ببیت).

**لشک(Leşk)**: خوبسار. هەروەسا (بشک و پشک) ژی لکارن ـ پرت، بۆ ڤێ ئانکوبێ پتر ئەڤ پەیڤە دوجارکی دهێت، ئانکو: (لشک لشک: پرت پرت).

**لشکر(Leşker)**: لەشکەر، زاراوەکێ لەشکەری یە و پشکەکە ژ ئەرتشی کو لدویڤ یاسایێن ئیرانیان هژمارا وان دگەهتە نێزیکی دوازدە هزار کەسا.

**لشن(Leşn)**: نەرم ـ لێچ ـ سادە و بێ نەخش و نیگار.

**لغ(Lex)**: سەرێ بێ موی، حوچ، حوت ـ بیابانا هشک و بێ شینکاتی ـ لەقلەقوک، نە موکوم ـ

هەروەسا دگەل هندەک پەیڤا دهێت و ئانکوێن ژێک جیـــاواز ددەت، وەکی: (تخم لغ: هێکا مریشکێ کو زەرک و سپیک هەردو دناڤێک هل بووبن ـ دهان لغ: دەڤ دریای، کەسێ کو دەڤێ وی بێ بەرسڤ بت، کەسێ کو ئاخفتن و نهێنی خوە د دەڤی دا نەگرن و......هتد).

**لغزاندن(Lexzandn)**: تەحساندن، حولساندن، خوشاندن.

**لغـزیدن(Lexzîden)**: تەحسین، حولسین، خوشین ـ بسەر رێداچوون، ڤارێ بوون.

**لغسر(Lexser)**: کەسێ کو موی ل سەری نەبن، حوچ، حوت.

**لفـتره(Lefterê)**: پویچە مرۆڤ، مرۆڤەکی چونە و بکێرنەهاتی، رەزیل.

**لفج(Lefc)**: لێڤ، لێڤ مەزن وەکی لێڤێن حێشترێ.

**لک(Lek)**: ئاخفتنا بێهودە و بێ مەعنا ـ ژ بەر ئاخفتن ـ خەسیس ـ هەبلە، دەبەنگ ـ ئەحمەق ـ مرۆڤەکی چوونە و بکێرنەهاتی ـ ستورک کو کەرەستەکێ چرە و دهێتە بکارئینان بۆ پێکڤە نویساندنا دو یان چەند تشتا پێکڤە ـ لەککە، خال.

**لک(Luk)**: مەزن، زەخم.

**لکات(Lekat)**: هەر تشتەکێ پویچ و بکێرنەهاتی ـ ژنکا دەهمەن پیس.

**لکام(Lukam)**: بێ ئەدەب، بێ شەرم، بێ حەیا ـ گەنج یان سنێلێ کو ب کەلەخ و ب هێز بیت.

**لکانه(Lekane-ê)**: رێڤیکا پەز و چێلا کو ژ دانی و گوشتی هاتبیتە داگرتن و کەلاندن(خوارنەکە) ـ ئامیرێ گوهنێلیێ زەلامی، کیر.

**لکک(Lêkek)**: حولی ترش، حولیکا ترش.

**لکل(Lêkel)**: هرمیک، گرسک.

**لکلک(Leklek)**: ئاخفتنێن بێهودە و بێ مەعنا.

**لک لک(Lek lek)**: لەگ لەگە(فرندەکە).

**لکین(Lukîn)**: تەحتی، تەحتییێ کو ژ هریا میهێ دهێتە چێکرن.

**لگ(Leg)**: رێنج، زەحمەت، وەستیان ـ قوتان، حوتک ـ زیندان، بەندیخانە، گرتیگەه، حەبس.

**لگام(Lêgam)**: لغاڤ.

**لگد(Leged)**: پێهن، پەحین.

**لگن(Legen)**: لەگەن، تەستا بچویک.

**لله(Lele)**: دادۆک، زەلامێ کو چاڤدێر و پەروەردەکەرێ زارۆکان بت. هەروەسا (لالا) ژی لکارە.

**لم(Lem)**: جورەکێ روینشتنێ و خوە درێژکرنێ بهەڤرەیە(دەمێ پشتا خوە ددەنە بالیفکی و پێن خوە درێژ دکەن)، بۆ نموونە: (لم دادن = پالڤەدان).

**لم(Lêm)**: فێل و فەن و شارەزاییی د کارەکی دا.

**لمالم(Lemalem)**: لێڤولێڤ، پڕ، تژی.

**لمتر(Lemtur)**: قەلەو، ب کەلەخ، پڕ گوشت ـ ب هێز ـ تەمبەل.

**لمس(Lems)**: نەرم، سست، خاڤ، شل، بێحال.

**لمشک(Lêmêşk)**: تەڕەماست.

**لمیدن(Lemîden)**: پالڤەدان.

**لنبان(Lenban)**: ژنکا دەهمەن پیس کو ژ بەر پیریێ نەشێت ئەو بخوە ب کارێن خراب رابیت و بهێت و ژنکێن جوان و جەحێل فێری دەهمەن پیسیێ بکەت.

**لنبر(Lenber)**: بنێرە: (لمتر) ـ رەهن، ران.

**لنبوس(Lunbûs)**: هوندری دەڤی.

**لنج(Lunc)**: لێڤ، دۆرماندۆری دەڤی.

**لنج(Lênc)**: ئویشیێ تری کو ترێ وی هاتبیتە خوارن، یان ژێڤەکرن(ئویشێ رەپ و رویت).

**لنج(Lenc)**: ناز، نازداری، ب نازداری رێڤەچوون.

**لنجه(Lence)**: ناز، نازداری، ب نازداری رێڤەچوون، لار و لەنجە.

**لنجه(Lunce)**: لێڤ، دۆرماندۆری دەڤی ـ ئەرزنک.

**لنجیدن(Lencîden)**: ئینانەدەر، هلکێشان، دەرئێخستنا تشتەکی ژ جهەکی ـ ب نازداری رێڤەچوون.

**لند(Lend)**: کوڕ(یێ بەرامبەری کچێ)ـ کیر، ئالاڤێ گوهنێلیێ زەلامی.

**لند(Lund)**: ئاخفتنێن د بن لێڤانڤە ب تایبەتی لدەمێ تۆرەبوونێ.

**لندهور(Lendehûr)**: مرۆڤێ بالا بلند و ب هێز.

**لندیدن(Lundîden)**: برم برم کرن،

د بن لێڤانڤە ئاخفتن.

**لنگ(Leng):** لەنگ، سەقەت ـ وەستیای ـ ڤەمای.

**لنگ(Lêng):** لنگ(پێیەکێ مرۆڤی هەر ژ بنێ رەهنی تا سەرێ تبلا)ـ کتەکێ باری و کتەکا پێلاڤێ.

**لنگاک(Lengak):** ئاخفتنێن کرێت.

**لنگر(Lenger):** وەزنا ئاسنی یا گەلەک ب سەنگ و زنجیرا پێڤە کو بەلەمێ پێ رادوەستینن ـ جهەکێ بەرفرەهـ کو لوێرێ مێهڤانداریا خەلکی بهێتەکرن ـ خانەقاه ـ سێنیا مەزن کو سێنیێن خوارنێ بکەنە تێدا(مەجمەعە، فەرخە سێنی).

**لنگە(Lêngê):** کت(بەرۆڤاژی جوت)، وەکی: کتەکێ باری، کتەکا پێلاڤێ و......هتد.

**لنگیدن(Lengîden):** نجمین (رێڤەچوونا سەقەتا).

**لو(Luw):** لێڤ.

**لوبیا(Lûbîya):** لۆبیک.

**لوت(Lût):** خوارن، خواردەمەنی، پاریکێ مەزن ـ رویس، تازی، رویت.

**لوترا(Lotera):** زمانێ کو چەند کەسەک د ناڤ خوەدا بۆ خوە پێک بینن و کەسەک ژ بلی وان تێ نەگەهیت، وەکی: (چزاڤزی و سەیدێ مەیدێ).

**لوچ(Lûç):** چاڤ ویر.

**لوخ(Lûx):** قەرام.

**لور(Lor):** لۆرک ـ تەرەماست ـ ئاڤ رابوون(فیضان).

**لورانەک(Loranek):** ئامانێ کو دوهنی بکەنێ.

**لوری(Lorî):** خوریک.

**لوس(Lûs):** مەللاق، جەمباز.

**لوسیدن(Lûsîden):** مەللاقی کرن، خوە جەمبازکرن.

**لوشانە(Loşanê):** ئاخفتنا خوەش و شرین ـ پاریکێ خوەش و ب تام.

**لوغیدن(Lûxîden):** ڤەخوارن.

**لوک(Lok):** حێشترێ ب هێز و بار هلگر ـ مرۆڤێ چوننە و بێ قیمەت، گەلەک جاران مرۆڤێت مەزن و جوامێر ژی ڤێ پەیڤێ د دەرحەقا خوە دا بکار دئینن ژ بۆ خوە کێمکرنێ بەرامبەر خەلکەکی ـ کەسێ کو دەستێ وی سەقەت بت ـ کەسێ کو لسەر دەست و

چۆکا برێڤە بچیت.

**لوکیدن(Lokîden)**: لسەر دەست و پێ یا برێڤەچوون ـ لۆق رێڤەچوونا هەسپی یان حێشترێ.

**لول(Lûl)**: کەیف خوەش ـ بێ شەرم، زرِ شەرم.

**لوله(Lûlê)**: لوبلە، بۆرِی.

**لوید(Levîd)**: مەنجەلا سفری یا مەزن.

**له(Lêh)**: پەرچقی.

**له(Leh)**: مەیا تری.

**لهاشم(Lehaşum)**: چوننە، پویچ، بێ قیمەت ـ کرێت، پیس.

**لهر(Leher)**: مەیخانە ـ قەحبەخانە.

**لهنه(Lehene)**: هەبلە، دەبەنگ ـ ئەحمەق ـ بێ ئەدەب ـ بەر، کەڤر.

**لهیدن(Lêhîden)**: پەرچقین.

**لیتک(Lîtek)**: مفلس، بەریک ڤالە ـ فەلیتە، کۆلانی ـ خولام و خودام.

**لیچ(Lîç)**: تەرِ، شل.

**لیز(Lîz)**: هەر تشتێ کو تەرِ و نمدار بت و تەحسین و حولسین ب ساناهی لسەر روی بدەت.

**لیزیدن(Lîzîden)**: تەحسین، حولسین.

**لیسیدن(Lîsîden)**: ئالیستن.

**لیف(Lîf)**: لیفک.

**لیو(Lîv)**: هەتاڤ.

**لیوان(Lîvan)**: پەرداغ، گلاس.

**لیوک(Lîvek)**: کورکێ کو ژنوی موی لێ بهێن بەس بۆ کەلەخێ خوە، تەمەت زەلامەکی بت.

**لیوه(Lîve)**: فیلباز ـ جەمباز، مەللاق ـ ئەحمەق ـ نەزان ـ پرِ بێژ.



**م(Mîm)**: تیپا بیست و هەشتێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی.

**ما(Ma)**: مە، ئەم(جیناڤێ کۆمێ یە بەرامبەر: من، ئەز)، وەکی: (ما گفتیم = مە گۆت. یان ژی؛ ما میرویم = ئەم دێ چین.).

**مات(Mat)**: سەرگەردان، حەیران - د یاریا شەترەنجێ دا، ئانکو مرنا شاهی و ب وێ، یاری ب دویماهی دهێت.

**ماترنگ(Matureng)**: جۆرەکێ چەپچەپیسکایە.

**ماتم(Matem)**: تازی، بەهی، شینی.

**ماچ(Maç)**: ماچ، راموسان.

**ماچە(Maçê)**: مێ، بۆ مێکرنا ناڤێ هندەک گیانەوەرا بکار دهێت، وەکی: (ماچە سگ = سەیێ مێ، دێهل. یان ژی؛ ماچە خر = کەرێ مێ، ماکەر).

**ماخ(Max)**: زێر و زیڤێ قەلپ - مرۆڤێ رەزیل و قەلس.

**ماخچی(Maxçî)**: دوقۆر، هەسپێ کو ژ دو نەژادا بت.

**ماخور(Maxor)**: مەیخانە، قومارخانە.

**مادر(Mader)**: دەیک.

**مادر اندر(Madr ender)**: ژن باب. هەروەسا (مادندر، مارندر، مایندر) ژی لکارن.

**مادگی(Madêgî)**: مێیاتی - جهێ کون ژ جلکی کو قولپک دکەڤیتێ.

**مادە(Madê)**: مێ(مرۆڤ یان گیانەوەرێ مێ کو بچویکا بزێت یان هێکا بکەت).

**مادیان(Madîyan)**: ماهین.

**مار(Mar)**: مار.

**ماراسپند(Marêspend)**: ناڤێ

رۆژا بیـــــست و نەهێ یە ژ هەر هەیڤـەکـا سـالا هەتاڤی ـ ناڤێ فریشتەکێ یە.

**مـــاز(Maz):** کــوریشـک ـ دەرز، شکەن، کەلشت.

**مازو(Mazû):** مازی.

**مـازە(Maze):** سـتـوینا مـوهرکـێن پشتێ.

**ماژ(Maj):** خوەشی، مرتاحی.

**ماست(Mast):** ماست.

**مـاسـە(Masê):** خـیـز(ب تایبـەتی رەمل).

**ماسیدن(Masîden):** هشک بوون، قەرسین(وەکی قەرسینا دوهنی).

**ماش(Maş):** ماش.

**ماشو(Maşû):** موخەل، موخل.

**ماکیان(Makîyan):** مریشکێن کو ل ناڤ مـالێ مـرۆڤ بۆ خـوە مـاتی ژێ بکەت، بۆ هەر مـەبەسـتـا کـو هەبیت.

**مـالامـال(Malamal):** لێـڤـولێڤ، تژی، پڕ.

**مـالە(Malê):** مـالنجـا بەنـنایا ـ ئالاڤـەکـە کـو پەرۆک پێ دهێـتـە گەمار کرن.

**مـالیـدن(Malîden):** ڤـەمـالین، پەرخاندن، دەست تێ هوسین.

**مام(Mam):** دەیک.

**مـامـا(Mama):** دەیک ـ پیـرک ـ ژنکا کو سەرەگوهی و چاڤدێری یا ژنکا زهسـتـانی(یا کـو بچـویک بووی) و بچـویکێ وێ بکەت، تا کو رادبیتەڤە سەر خوە. هەروەسا بۆ ڤێ مەبەستێ پەیڤێن (ماماچە، مـــام ناف، بازاج، پازاچ و پیش نشین) ژی لکارن.

**مان(Man):** خانی و ناڤمالی(خان و مان) ـ هەڤتا ـ جیناڤێ گرێدای بۆ ئێکەم کـــەسێ کـــۆم، وەکی: (کتابـمان = پەرتوکێن مە).

**ماندن(Manden):** مـان ـ ل جـهێ خوە راوەسـتـیـان ـ شتی تشـتـەکی بوون، رەنگێ تشتەکی دان.

**مـــاندە(Mandê):** مـــایی، تمام نەبووی ـ وەستیای، هەرشی.

**مـــانستن(Manêsten):** شـــتـی تشـتـەکی بوون، رەنگێ تشـتـەکی دان.

**مـانـگ(Mang):** هەیڤ(هەیڤـا ل ئەسمانی).

**مـانند(Manend):** وەکی، مـــینا، شتی.

**مانیدن(Manîden):** بنێرە پەیڤا: (مانستن).

**مـــاه(Mah):** هەیڤ: (هەیڤـــا ل ئەسـمـانی ـ هەیڤـا کـو بۆ دەمی دهێـتـە بکار ئینان کـو ٢٩ تا ٣٠ رۆژانە، کـــو ئەو ژی گـــرێدایە ب دیتنا هیـلالێ و هەتا دیسـاڤـە هیلال دەردکەڤیتەڤە).

**مـاهپـاره(Mahparê):** جـوان وەکی هەیڤێ.

**ماهتاب(Mahtab):** تاڤهەیڤ.

**ماهرخ(Mahrux):** مەهـ روی.

**مـاه گرفـتگی(Mah gêrêftêgî):** هەیڤ غەییرین.

**ماهنامه(Mahnamê):** کۆڤارا کو هەیڤێ جارەکێ بهێتە وەشاندن.

**مـــاهواره(Mahvarê):** هەیڤـــێـن دەستکرد(قمر صناعي).

**ماهوت(Mahût):** جۆرەکێ پەرۆکی یە کو ژ هریێ دهێتە چێکرن.

**مـاهور(Mahûr):** ئەردێ پر کـەند و کـۆر ـ نهـال، دۆل ـ ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن مـــوزیکا ئیـــرانی یە ـ هەروەسا جۆرەکێ گولێ یە و دبێژن هەگـەر ئاوازا مـاهور ل کێلەک ڤێ گـولێ بهـێـتـە ژەنین، ئەڤ گـوله پەرێت خوە د وەرینت.

**ماهه(Mahe):** ئالاڤێ کـو تشـتـەک پێ بهێتە کونکرن.

**ماهی(Mahî):** ماسی.

**مـایی(Mayî):** خـوە پەراستن، خـوە مەزن کرن، گەلەک د خوە گەهشتن.

**مـبـاد ـ مـبـادا(Mebad- Me-bada):** هەرگیز، نەکو، نەکویت، بۆ نموونە: (هەرگـیـز وە نـەکـەی!، نەکـو(نەکـویت) ب فـلان کـاری رابیی!) ـ خودێ نەکەت.

**مـــتـــرس(Meters):** هەلامـــەت. هەروەسا ناڤێن (مترسک، هراسه، داهل و افچه) ژی لکارن.

**متل(Metel):** ئەفسانە، چیڤـانوک ـ کـورتە چیـرۆک ـ ئاخفـتنا کـو ب ئنیەتا ترانەپێکرنێ بهێتە گۆتن.

**متلک(Metelek):** ترانە ـ درکە.

**متە(Mette-ê):** ئالاڤەکێ کونکرنێ یە کـو نەجـجـار و ئاسنگەر بکار دئینن. هەروەسـا ناڤـێن (پرمـا، ماهه و بهرمه) ژی لکارن.

**متیل(Mêtîl):** روی لحێف یان روی بالیفک.

**مج(Mec):** کورتکریا پەیڤا (ماج)، ئانکو هەیڤ ـ بۆ وی کەسی دهێتە

گۆتن یێ کو هۆزانا کەسەکێ دی ل جڤاتەکێ بخوینت.

**مـجری(Mêcrî):** سندۆقکا ئاسنی یان داری.

**مچاله(Muçalê):** تشتێ کو د ناڤ دەستی دا هاتبیتە قورمچاندن(وەکی کاغەزا قورمچاندی).

**مچک(Meçek):** نیسک ـ ماش.

**مچـول(Muçûl):** بچویک ـ دەلال، خشکوک.

**مـچیـدن(Meçîden):** ب نازداری رێڤەچوون ـ دیتن.

**مغ(Mux):** لغاڤ ـ ئاگر ـ زرکێتک ـ دارا خورمێ.

**مـخت(Muxt):** هیڤی، ئومێدوار، دەمێ دبێژن: (من بمخت شما بودم = ئەز ب هیڤی یا تەڤە بووم، یان ژی ئەز ب تە ئومێدوار بووم.).

**مـخنده(Mexendê):** خشۆک ـ لڤۆک.

**مـخیـدن(Mexîden):** خوشین ـ لڤین.

**مد(Med):** تێلە ـ داڤ ـ ناڤێ رۆژا شەشێ یە ژ هەمی هەیڤێن سالا هەتاڤی.

**مدنگ(Medeng):** کلیل، کێلون، دارێ کو دادننە پشت دەری دا بهێتە گرتن.

**مر(Mer):** تیپا پێکڤەگرێدانێ یە و د زمانێ کوردی دا بەرامبەر تیپا پێکڤەگرێدانێ(ب)ێ یە، و هندەک جاران ژی زێدەیە و بەس بۆ جوانکرنا پەیڤێ دهێت ـ حساب، هژمار(هەر ژ ڤێ پەیڤێ یە، پەیڤا «بی مر: بێ حساب، بێ هژمار»).

**مـراش(Meraş):** دلرابوون، هلاڤێتن. هەروەسا (هراش و مرش) ژی لکارن.

**مرجمک(Mercumek):** نیسک. هەروەسا (نسک، دانچە، مرجومک، مرجو و مژو، عدس) ژی لکارن.

**مـرخشـه(Merexşe):** کور، بێ ئیفلەح، بەش.

**مـرد(Merd):** زەلام، مرۆڤێ نێر ـ مێر، دلێر، ئازا.

**مـرداب(Murdab):** حەود، مەلەڤانگەه ـ گۆم.

**مرداد(Murdad):** هەیڤا پێنجێ یە ژ سالا هەتاڤی ـ ناڤێ رۆژا

حەفتێ یە ژ هەمی هەیڤێن سالا هەتاڤی.

**مردار(Murdar):** مرار، گیانەوەرێ مرار.

**مردانه(Merdanê):** هەر تشتەکێ کو یێ زەلامان بت یان هێژا و لایقی مێرا بت.

**مـــردک(Merdek):** مـــێـــرک، زەلامۆک( بۆ کێمکرنا زەلامی پتر بکار دهێت).

**مردم(Merdum):** خەلک، عالەم ـ بیبیکا چاڤی.

**مـردمک(Merdumek):** بیبیکا چاڤی، نیسکا چاڤی. هەروەسا (مردم، مردمه، کیک و کاک) ژی لکارن.

**مــردمــه(Merdumê):** بنێـــرە: (مردمک).

**مـردن(Murden):** مـرن، بێ گـیـان بوون.

**مـرده(Murdê):** مـری، بێ گـیـان بووی.

**مردەشو(Murdêşû):** مری شۆ.

**مـرز(Merz):** ئەرد ـ لێـڤێـن باغ و زەڤیا ـ سنوور، توخیب. هەروەسا (مرزو و مرزوی) ژی لکارن.

**مرز(Murz):** قۆن، کونا قۆنێ.

**مرزغان(Merzexan-xen):** گۆڕ، گۆڕستان.

**مرزیدن(Merzîden):** دەستکرن، لەمسکرن ـ گوهنێلیکرن.

**مـرس(Mers-Meres):** فـێـقـیـێ مـز، فـێـقـیـێ ترش و شـرین ب هەڤرە.

**مرغ(Murx):** هەر گیانەوەرەک کو چەنگ و پەڕ پێــــڤـــە بن و ل ئەسمانی بفرت ـ مریشک.

**مرغ(Merx):** چیمەن، کەسکاتی ـ فریز(جۆرەکێ گیایە).

**مرغابی(Murxabî):** وەردەک.

**مــــرغـــــانه(Murxanê):** هێکا مریشکێ.

**مـرغـزار(Merxzar):** چیـمـەنزار، جهێ ب شینکاتی.

**مـــرغـــزن(Merxzen):** گـــۆڕ، گۆڕستان.

**مـرغـسـانان(Murxsanan):** ئەو گیانەوەرێن کـو هێکا دکەن و ب چێکن ژی.

**مرغول(Merxûl):** پرچا خەلەک.

**مرگ(Merg):** مەرگ، مرن، نەمان.

**مرگبار(Mergbar):** هەر تشتێ کو

ببیته ئەگەرێ مرنێ.

**مرگو(Murgû)**: چویچک. هەروەسا (مرغو و مرتکو) ژی لکارن.

**مروارید(Murvarîd)**: مراری.

**مروسیدن(Murûsîden)**: خوە واستاندن ب کارەکیقە ژ بۆ بدەستڤەئینانا تشتەکی ـ فێربوون یان عەدەت کرن ب تشتەکی.

**مزگ(Mezg)**: باهیڤا تەحل.

**مزگت(Mezgêt)**: مزگەفت.

**مزمزە(Mezmezê)**: تام کرن، چێشتن.

**مزە(Mezê)**: تام، چێژ.

**مزیدن(Mezîden)**: چێشتن، تام کرن ـ مێهتن.

**مژدگانی(Mujdeganî)**: خەلاتێ کو بەرامبەر مزگینیەکا خوەش ددەنە وی کەسی یێ کو مزگینی خەبەرێ خوەش گەهاندی.

**مژدە(Mujde)**: مزگینی، موژدە، خەبەرێ خوەش.

**مژگان(Mujgan)**: کوّما پەیڤا (مژە)، ئانکو: مژویلانک.

**مژمژ(Mejmej)**: کەرموّز.

**مژە(Muje)**: مژویلانک.

**مس(Mês)**: سفر.

**مس(Mes)**: مەزن، مەزنتر.

**مست(Mest)**: مەست، سەرخوەش.

**مست(Must)**: گلە و گازندە، دالەهی ـ گری و زێمار ـ خەم.

**مستگر(Mustger)**: خەمدیتی، خەمگین، پەریشان.

**مستمند(Mustmend)**: هەژار، دەستکورت، بێچارە ـ خەمگین ـ گلەدار، خودان گازندە.

**مستە(Muste)**: خەم ـ زۆر و ستەم ـ خوارنا فرندێن نێچیرێ.

**مسری(Musrî)**: ڤەگر(ئێشا کو ژ ئێکی بچیتە یێ دیتر).

**مسکە(Meske)**: نیڤشک.

**مسگر(Mêsger)**: کەسێ کو ئامانێن سفری چێدکەت.

**مشاش(Meşaş)**: هێنگڤین.

**مشت(Muşt)**: بوکس، مست.

**مشت(Mêşt)**: جۆکا ئاڤێ.

**مشتی(Muştî)**: جوٚرەکێ پەرۆکێ نەرمێ ئارمویشی یە.

**مشک(Mu-Mêşk)**: مسک.

**مشکو(Muşkû)**: بوتخانە ـ کوشک ـ ئالیەک ژ خانی کو تایبەت یێ ژن و حورمەتا بت.

**مشگ(Meşg)**: مەشک.

**مشگچه(Mêşgçê)**: جۆرەکێ گولا رەنگ سۆر و بێهن خوەشە کو پتر ل دەهمەنێن چیا شین دبن.

**مشگدانه(Mêşgdanê)**: ناڤێ ئاوازەکێ یە ژ سیه ئاوازێن باربەدی(باربەد سترانبێژ و موزیکڤانێ تایبەتێ خسرو پەرویزی بوو).

**مشگدم(Muşgdem)**: فڕندەکێ رەش و خوەش ئاوازە.

**مشگمالی(Muşgmalî)**: ناڤێ ئاوازەکا موزیکێ یە ـ ناڤێ ئاوازەکێ یە ژ سیه ئاوازێن باربەدی.

**مشگی(Mêşgî-kî)**: رەش، رەنگێ رەش، رەنگێ بسەر رەشی ڤە.

**مشگین(Mêşgîn-kîn)**: رەنگ رەش ـ هەر تشتێ کو بێهنا مسکێ بدەت.

**مشنج(Mêşenc)**: مێشا رەنگ کەسک. هەروەسا (مشنگ و مژمژ) ژی لکارن.

**مشنگ(Meşeng)**: دز، رێگر، جەردەچی. هەروەسا (مشتنگ، مشنگک، منگ و منگل) ژی لکارن.

**مشیانه(Meşyane)**: حاوا(د ئۆلێ زەردەشتیان دا، ئێکەمین ژنە کو هاتیە ئافراندن.. مشیە؛ ئادەمە و مشیانە ژی حاوایە).

**مغ(Mux)**: زەلامێ خودێناس و پێشەوایێ مەزهەبی یە د ئۆلێ زەردەشتیان دا.

**مغ(Mex)**: کویر ـ رویبار.

**مغاک(Mexak)**: کویر، جهێ کویر ـ چال.

**مغز(Mexz)**: مەژیێ سەری ـ مەژیێ هەستی ـ کاکلک(وەکی کاکلکێن گیز و باهیڤا).

**مغند(Muxund)**: قونێر ـ گرێ، گرێک ـ هەر تشتەکێ گروڤر وەکی گلولکا.

**مفت(Muft)**: بەلاش، ب هەروە، بێ بەرامبەر.

**مک(Mek)**: مێژ ـ فەرمانە ب مێهتنێ، ئانکو: بمێژە ـ رما بچویک(ب ڤێ ئانکوێ پەیڤا ناڤهاتی Muk ژی دهێتە بلێڤکرن.).

**مکل(Mekêl)**: زێری، زێلی.

**مکیاز(Mêkyaz)**: سنێلێ کو هێشتا ریه و سمبێل لێ نەهاتبن.

**مکیدن(Mekîden)**: مێهتن.
**مگر(Meger)**: ژ بلی، بژلی ـ ژ ئالاڤێن پرسیاریێ یە، ما، وەکی: (مگر فلانی نیامد؟ = ما فلان کەس نەهات؟) ـ دێ بلا ـ بەلکی.
**مگرمج(Megermec)**: تیمساح.
**مگس(Meges)**: مێش.
**مگسک(Megesek)**: مێشا بچویک ـ هەر تشتێ وەکی مێشێ.
**مل(Mul)**: مەی، عەرەق ـ هرمیک.
**ملا(Mulla)**: مەلا ـ خواندەڤا.
**ملاز(Melaz)**: ئەزمانکێ بچویک کو دکەڤتە دویماهیا گەوریێ ـ گەوری.
**ملخ(Melex)**: کولی(مورەکە).
**ملس(Meles)**: مز، فێقییێ کو تاما وی مز(ترش و شرین) بت.
**ملک(Mêlk)**: خال یان پنیکێن سپی کو هندەک جارا لسەر نینۆکا دیار دبن.
**ملماز(Melmaz)**: رەنگێ کو خندار جلکا پێ رەنگ دکەن. هەروەسا (ملمیز) ژی لکارە.
**ململ(Melmel)**: جۆرەکێ پەرۆکێ سپی و تەنکە کو ژ بەنکا دهێتە چێکرن.
**ملنگ(Meleng)**: مەست، سەرخوەش.
**ملوس(Melûs)**: دەلال، خشکوک، جوان.
**من(Men)**: جیناڤێ ئێکەم کەس یێ تاک «من، ئەز»، وەکی: (من میخواهم بروم = من دڤێت بچم. یان ژی؛ من خوابیدم = ئەز نڤستم.) ـ من(بۆ پیڤانێ لکارە و بەرامبەری سێ کیلویانە).
**منبک(Mênbek)**: گیاگێسک.
**منبل(Menbel)**: تەمبەل، کەدوەر ـ نە جهێ باوەریێ، وەکی: (او را منبلم = من باوەری ب وی نینە، ئەو نە جهێ باوەریێ یە).
**منج(Munc)**: مێش، زرکێتک، مێشا هنگڤینی ـ تۆڤێ گیای.
**منجک(Mencek)**: ئێک ژ کارێن جادووگەرانە، ئەو ژی راکرنا تشتەکی وەکی گوستیرکێ یە، کو ژ ئەردەکی رادکەن و دادننە جهەکێ دیتر.
**مند(Mend)**: ئێک ژ پاشگرێن سالۆخدانێ یە و ئانکوا (دار،

خـــودان) دگـــەهینت، وەکی: (خردمند = عـاقلدار، زانا، خودان زانین، یان ژی؛ دردمند = نەساخ، نەخوەش، خودان ئێش).

**مندک(Mendek)**: نزم ـ کـــێم، هندک، پچەک.

**مندور(Mendûr)**: خـــەمگین، پەریشـــان ـ بەخت ب رەش، بێ ئقبال ـ بێچارە، سست، بێ هێز ـ پویـچـەمـرۆڤ، بێـخـێـر، رەزیل، قەلس، دەخەس.

**منده(Mende)**: گـوزک، گـوزکێ شکەستی.

**منش(Menêş)**: ســـروشت، طبعەت(مەبەست ژێ سروشت یان طبـعـەتێ مـرۆڤی یە، کـا بێ بێ طبعەتە یان بەشوشە و......هتد).

**منگ(Meng)**: بێ عـاقـل، گـێـژ، دەبەنگ ـ ئەحـمـەق ـ دز، رێگر، جەردەچی ـ قومار ـ رێباز و شێواز ـ ئاخـفـتنێن پوبچ و بێـهـودە ـ رها رێڤاسێ.

**منگل(Mengul)**: دز، رێگر.

**منگوله(Mengule)**: گولیفینک.

**منگیا(Mengya)**: قـــومـــار، قومارخانە.

**منگیدن(Mengîden)**: هێـدی ئاخفتن، د بن لێڤانڤە ئاخفتن.

**منوچهر(Menûçêhr)**: روی بەهشت ـ ناڤێ کورێ ئیرەجی یە د شەهناما فردوسی دا.

**منی(Menî)**: ئـەز ئـەزۆکـی، مـەدحـۆک، کـەسێ کـو گـەلەک پەسنێن خوە بدت و چ ئاخفتنا کو بکەت، بێـژت من هۆ کـرێ و ئەز دێ هۆ کەمێ.

**مو(Mow)**: دارمێو، دارا تری.

**مو(Mû)**: موی.

**موبد(Mobed)**: سـەرۆکێ مـوغـا، زانا و پێشـەوایێ روحانی د ئولێ زەردەشتی دا.

**مویز(Mûbîz)**: موخل، موخەل.

**موچینه(Mûçînê)**: موبچینک.

**مور(Mûr)**: مێری.

**مورچال(Mûrçal)**: کونمێری.

**مورچه(Mûrçê)**: مێری.

**مورش(Mûrêş)**: موهرک، موریک.

**موریانه(Mûryanê)**: جـورەکێ مێریێ یە کو ب ناڤێن: (مورانە، مـورچانە، تافـشـک، ریونجـو، ریونجـە، رونجـو، ردنجـو، رشـمـیز و چوبخوارک) ژی دهێتە نیاسین.

**موزه(Mûze):** جەزمە.

**موژ(Moj - Mojê):** حەود، برک، هەر جهێ کو ئاڤ لێ خرڤە ببت.

**مـوژان(Mojan):** چاڤـێـن جـوان، چاڤـێـن خـەوتە ـ نێـرگـزا نیڤ بشکفتی.

**مـوسـتـره(Mûsuture):** دەفک، مۆس، گویزان.

**موسه(Mose):** زرکێتک.

**موش(Mûş):** مشک.

**موشک(Mûşek):** کورتکریا پەیڤا (موش)، ئانکو: مشک ـ مشکێ بچویک ـ سارۆخ.

**مـول(Mûl):** درەنگاتی، هێدیاتی، ڤـەهێـلان ـ یارکێ ژنا ب مـێـر ـ بیژی.

**مـولنجـه(Mûlence):** پێـشـک (پێشکا ئاری و گەنمی).

**مولیدن(Mûlîden):** درەنگ کرن، تەئخیربوون.

**مویز(Mûvîz):** مێویژ.

**مویه(Mûye):** گری، زێمار.

**مـوییـدن(Mûyîden):** گـرین، زێمارکرن.

**مـه(Me):** پەیڤـا نەرێنییێ، ئانکو: نە، نەخێر.

**مه(Mêh):** مەزن ـ مژ.

**مه(Meh):** کورتکریا پەیڤا (ماه)، ئانکو: هەیڤ.

**مـهپاره(Mehparê):** خوشکۆک، جوان، دەلال ـ ژن یان زاروکێ روی دەلال، کو وەک دڕکە جوانیا رویێ وان ب جوانیا هەیڤێ ڤە گرێددەن.

**مهتاب(Mehtab):** تاڤهەیڤ.

**مهتر(Mêhter):** مەزنتر ـ مەزن و سـەرۆکێ مللەتی ـ کـەسێ کـو سەرەگوهیا هەسپا دکەت.

**مــهـــر(Mêhr):** هەڤـالینی ـ خـوشـەویسـتی ـ هەتاڤ، بەری زەردەشتی و زەردەشتیەتێ، ناڤێ ئێک ژ خـوداوەندان بوو ـ هەیڤـا حـەفـتێ ژ هەر هەیڤـەکـا سـالا هەتاڤی و هەیڤا ئێکێ یە ژ وەرزێ پاییزێ. دیسـان ناڤێ رۆژا شـازدێ یە ژ هەر هەیڤـەکـا سـالا هەتاڤی. هەروەسا ناڤێ وێ جەژنێ یە یا کو دکـەفـتـە د رۆژا شـازدێ ژ هەیڤـا حەفتێ ژ هەر سال، ژ بەر کو ناڤێ رۆژ و هەیڤا وەکو ئێک لێ دهاتن. بۆ ڤێ جەژنێ پەیڤا (مهرگان) ژی لـکارە کـو عـەرەب ژ بەر نەبوونا تیپا (گ)، دبێژنێ (مهرجان).

**مهر(Muhr)**: موهر، مۆر، ختم.

**مهربان(Mêhrban)**: میهرەبان.

**مـهـرگـانی(Mêhrganî)**: ئێک ژ ئاوازێن مـوزیکا ئیرانـی یە و ناڤێ ئێک ژ هەر سیـهـ ئاوازێن باربەدێ موسیقارێ خسرو پەرویزی یە.

**مـــهـــره(Muhre-ê)**: مـــوهرک، موریک ـ موهرکێت ستوینا پشتێ کـو هەر سـتـوینەک ژ سیـهـ و سێ موهرکا پێک دهێت.

**مهست(Mehêst)**: مەزنترین.

**مهستی(Mêhsêtî)**: بانوو، خانم، خانما مەزن.

**مهستی(Mehsêtî)**: مەه خانم، مەهبانوو.

**مەسیما(Mehsîma)**: مـەهروی، جوان، دەلال.

**مهشید(Mehşîd)**: تاڤهەیڤ.

**مهمان(Mêhman)**: مێهڤان.

**مـهـوار(Mehvar)**: وەکی هەیڤێ ـ هەیڤانە، مۆچە، دەرماله.

**مـهین(Mêhîn)**: مـەزن، مـەزنتـر، مەزنترین.

**می(Mey)**: مەی، عەرەق.

**مـیـان(Miyan)**: دناڤـرا، دناڤـدا. هەروەسـا هەگـەر دگـەل هندەک پەیڤێـن دی بهێت، ئانکوێن جۆراوجۆر ددەت، وەکـی: (مـــیـــان بسـتن = ئامـــادەبوون ژ بۆ ئەنجـــامـــدانا کـارەکی، یان: مـیـان بـالا = بەژن ناڤنجی«نە گـەلەک درێژ و نە ژی کـورت»، یان ژی: مـیـان بند = شیتک، کەمەربەند و......هتد.).

**مـــیـــانجی(Mîyancî)**: بەرەڤـــان (کەسێ کو دو کەس یان دو ئالیان پێک بینت یان ژی ژ شـەرکـرنێ بدەتە پـاش و پێکولێ بـکەت بۆ نەهێلانا وێ نەخوەشیـا د ناڤـبەرا وان هەردوان دا).

**مـــیـــانگین(Mîyangîn)**: ناڤین (متوسط، معدل).

**میـانە(Mîyanê)**: دناڤـدا، دناڤـرا، نیڤەکا تشتەکی.

**میترا(Mîtra)**: ناڤێ فریشـتەکێ یە کو میهر و خوشەویستی پێ هاتیە سـپـارتـن، فـریشـتێ پارێزڤـانێ راستیێ و عـەهد و پەیمانایە ـ ئەوە یێ کـو رۆناکی ژێ دەردکـەڤت، هەتاڤ.

**مـیـتین(Mîtîn)**: تەڤـر، تەڤـرک ـ قازمە، کولنگ.

**میخ(Mîx):** بزمار.

**میخچە(Mîxçê):** کورتکریا پەیڤا (میخ) ئانکو: بزمار ـ بزمارک، بزمارا بچویک ـ بزماروک(وەرمتنەکا رەقە کو ل دەست و پێیان دەردکەڤت).

**میخوش(Meyxoş):** تام مز، فێقیێ کو تاما ترشی و شرینیێ بهەڤرە بدەت.

**میخی(Mîxî):** بزماری(مەبەست ژێ خەتێ بزماری یە).

**میدان(Meydan):** مەیدان، گۆرەپان.

**میراندن(Mîranden):** کوشتن، مراندن.

**میروک(Mîrûk):** مێری.

**میره(Mîre):** مالخێ، زەلام، مێر(مەبەست ژێ زەلام یان مێرێ ژنکێ یە)ـ مەزنێ مالێ.

**میز(Mîz):** مێز.

**میزبان(Mîzban):** مێهڤاندار.

**میزد(Meyezd):** خواردەمەنیێن کو د رێ و رەسمێن مەزهەبی دا دادنە سەر سوفرێ ـ جڤاتا مەی و خوەشی و مێهڤانییێ.

**میزک(Mîzek):** میز(دەستاڤا زراڤ).

**میزیدن(Mîzîden):** میزتن.

**میش(Mîş):** پەزێ سپی یێ مێ.

**میغ(Mîx):** مژا دژوار ـ ئەور. هەروەسا (مغ و ماغ) ژی لکارن.

**میگ(Mîg):** کولی.

**میگو(Mîg-Mêyg-Meygû):** کولیا دەریایی.

**میلاو(Mîlav):** شاگرد، بەردەستک(کەسێ کو وەک شاگرد یان بەردەستک ل بەر دەستێ خودانێ دوکانێ کار دکەت).

**میمون(Mê-eymûn):** مەیمونک.

**مینو(Mînû):** بەهشت.

**مینوی(Mînevî-Mînûyî):** بەهشتی.

**میوه(Mîvê):** مێوە، فێقی.

**میهن(Mîhen):** وەلات، مەوطن.



**ن(Nûn):** تیپا بیست و نەهێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی.

**نا(Na):** پێشگرێ نەرێنیێ یە، وەکی: (نابینا: کۆرە) ـ بۆریێت هەوای(قصبات الهواء) ـ نم، شە.

**ناب(Nab):** خوری، بێ غش(خالص).

**ناباب(Nabab):** نە موناسب، نە هێژا، نە لایق.

**ناباور(Nabaver):** نە جهێ باوەریێ.

**نابجا(Nabêca):** نە ل جهێ خوە، نە دجهدا.

**نابخرد(Nabêxred):** بێ عاقل، هەبلە، نەزان.

**نابکار(Nabêkar):** خرابکار ـ بێ مفا.

**نابود(Nabûd):** نەمای، پویچ بووی.

**نابودمند(Nabûdmend):** مفلس، هەژار، فەقیر، دەستکورت.

**نابیوسان(Nabeyûsan):** ژ نشکەکیڤە.

**ناپدری(Napêderî):** زڕباب.

**ناپدید(Napedîd):** بەرزە، وون، هندا.

**ناپسری(Napêserî):** نەڤسی (نەڤسیێ کوڕ).

**ناتنی(Natenî):** خویشک و برایێن کو نە ژ بابەکێ یان دەیکەکێ بن.

**ناتوان(Natevan):** سست، خاڤ، بێ هێز، بێچارە ـ هەژار، دەستکورت.

**ناجور(Nacûr):** نە ڤێککەتی.

**ناچخ(Naçex):** رما کورت. هەروەسا (نچک) ژی لکارە.

**ناچیز(Naçîz):** پچەک، کێم،

بەرنەکەتی، بێ قیمەت.

**ناخدا(Naxuda)**: خودانێ بەلەمێ یان ئەو کەسێ کو بەلەمێ دهاژۆت.

**ناخن(Naxun)**: نینۆک.

**ناخوش(Naxoş)**: نەخوەش، نەساخ ـ کرێت، نە لایق.

**نادار(Nadar)**: نەدار، هەژار، دەستکورت.

**نادان(Nadan)**: نەزان، بێ عاقل، نەخوەندەڤا.

**نادختری(Naduxterî)**: نەڤسی (نەڤسی یا کچ).

**نادرست(Nadurut)**: شکەستی، عێبەلۆ ـ مرۆڤێ خرابکار و نە پێ باوەرییێ.

**نار(Nar)**: هنار.

**ناراست(Narast)**: خوەهر، خوار ـ درەو، نەوەبی ـ خائین، فێلباز.

**ناربن(Narbun)**: دارا هنارێ.

**نارس(Nares)**: نەگەهشتی، کاڵ(فێقییێ نەگەهشتی و کاڵ).

**نارسا(Naresa)**: کورت، ب کێماسی.

**نارکند(Narkend)**: جهێ کو مشە دارێن هنارا لێ بن.

**نارکوک(Narkûk)**: تریاک، ئەفیون.

**نارگیل(Nargîl)**: گویزا هندێ.

**نارنج(Narenc)**: نارنج(ب عەرەبی ژی هەر دبێژنێ نارنج).

**نارنجک(Narencek)**: نارنجۆک، رومانە(ئەو ژی رەنگەکێ تەقەمەنییێ یە).

**نارنگی(Narêngî)**: لالنگ.

**نارو(Naro)**: فێل، حیلە ـ خیانەت.

**ناروا(Nareva)**: حەرام ـ نەژ هەژی، نەلایق ـ پارێ سەختە، قەلپ.

**نارە(Nare)**: میلێ ترازیێ، بەرێ قەپانێ.

**ناز(Naz)**: ناز، نازداری.

**نازا(Naza)**: ستەور، ژن یان هەر گیانەوەرەکێ مێ کو زک پڕ نەبت و نەزێت.

**نازان(Nazan)**: ب نازداریڤە.

**نازبو(Nazbû)**: رحان.

**نازک(Nazuk)**: تەنک ـ نەرم ـ زراف.

**نازنین(Nazênîn)**: نازدار ـ بەژن زراف ـ دلڕاکێش.

**نازیدن(Nazîden)**: خـــــوه نازدارکرن، شانازی بخوه برن.

**ناژو(Najû)**: دارا کـــاژێ، دارا صنوبەرێ.

**ناساز(Nasaz)**: دژ ـ بەروڤاژ.

**ناسره(Nasere)**: قـەلپ، سـەختـە، پارە یان زێرێ سەختـە ـ ئاخفـتنا کرێت و نە د جهدا.

**ناسزا(Nasêza)**: خەبەر، فـەحش، ئاخفتنێن کرێت و نەلایق.

**ناشـتـا(Naşêta)**: برسی، کـەسێ برسی کـو هەر ژ سـپـێـدێ دەمێ ژ خەو رادبت تشتەک نەخواربت.

**ناشناس(Naşênas)**: نەنیـــاس، بیانی، غەریب.

**ناشی(Naşî)**: نویکار، بێ تەجریبە، کەسێ کـو هێشـتا د کـارێ خوە دا شارەزا نەبووی.

**ناغوش(Naxûş)**: سەر نقۆکرن د بن ئاڤێ ڤە.

**ناغـول(Naxûl)**: پێـــســـتـــرک، دەرەجک، پەیبیسک.

**ناف(Naf)**: نافک.

**نافرمان(Naferman)**: یاخی.

**نافه(Nafe)**: وەکی نافکێ ـ مسک و نافکا خەزالا مسکێ.

**نـاک(Nak)**: ئـێـک ژ پـاشـگـرێـن وەکــهـــەڤی و ســالۆخـــدانێ یە و ئانکوێن جۆراوجۆر ددەت کـو ئەڤ ئانکوە ب وێ پەیڤێ ڤە گرێدایە یا کــــو دگـــــەلدا دهێـت، وەکـی: (اندوهناک = خـەمگین، دردناک = ب ئێش، نمناک = شــــهـــدار و......هتـد) ـ تێـڤـەدای، دناڤ ڤەدای، د ناڤ گەڤازتی.

**ناکام(Nakam)**: بێ مـراد، کـەسێ کو نەگەهشتبتە ئارەزو و مەخسەدا خـوە.

**ناکس(Nakes)**: نەلایق، نەهێـژا، پویچـــەمـــرۆڤ، بێـــخـــێـــر، بێ سەروچاڤ.

**ناگاه(Nagah)**: ب بێدەنگی ڤە ـ ژ نشکەکیڤە ـ بێ وەختی، نەلدەم، نەلوەخت.

**ناگـــرفت(Nagêrêft)**: بنێـــرە: (ناگاه).

**ناگـــــزیر(Naguzîr)**: نەچار، ژ نەچاری.

**ناگه(Nageh)**: کورتکریا (ناگاه)، بنێرە: (ناگاه).

**ناگـــهـــان(Nagehan)**: بنێـــرە: (ناگاه).

**نال(Nal)**: لەڤەن.

**نـالان(Nalan)**: ب ئـاخ و ئـۆف و نالین ڤـه ـ کـەسێ ب ئاخ و ئۆف، کەسێ کو ئاخینکا رادهێلت و کول و کەسەران دادکەت.

**نالش(Nalêş)**: ئاخ و ئۆف و گری و زێمار.

**ناله(Nalê)**: ئاخینک یان ئۆفێنا کو ژ دلێ سـوّتی و داخـدیتی دەردکەڤت.

**نالیـدن(Nalîden)**: ئاخـینک راهێلان ـ گرین، زێمارکرن.

**نام(Nam)**: ناڤ، پەیڤا کو کەسەک یان تشـتەک پێ دهێتـه ناڤکرن و گازیکرن.

**نـام آور(Nam aver)**: ناڤدار، ب ناڤ و دەنگ.

**نامادری(Namaderî)**: ژنباب، زڕ دەیک.

**نامـبـردار(Nambe-burdar)**: ناڤدار، ب ناڤ و دەنگ.

**نامـبرده(Namburdê)**: ناڤـبری، ناڤئینای، کەسێ کو ل جهەکی یان د نڤیـسینەکێ دا ناڤێ وی بەری هینگێ هاتبیت.

**نامدار(Namdar)**: ناڤدار.

**نامـرد(Namerd)**: نەمـەرد ـ ترسنۆک، کۆلافە ـ بێ غیرەت.

**نامزد(Namzed)**: بەربژار، کـەسێ کـو بۆ کـارەکی هاتبـیتـه دەستنیشـانکرن ـ دەزگـر، کچ یان کوڕ کو پەیمانێن زەوجینێ د ناڤبەرا واندا هاتبنه گرێدان.

**نامور(Namver)**: ناڤدار، ب ناڤ و دەنگ.

**نامـه(Namê)**: نامـه، پەڕکێ نڤیسی، پەرتووک.

**نامـەبر(Namêber)**: پـیـلـک، قاسد.

**نامی(Namî)**: بنێرە: (نامور).

**نامیدن(Namîden)**: ب ناڤ کرن، ناڤ لسـەر کـەسـەکی دانان ـ ب ناڤ گازی کەسەکی کرن.

**نان(Nan)**: نان.

**نانکور(Nankûr)**: بێ نان و خوێ، نان حەرام.

**نـانو(Nanû)**: لـەهـنـدک، لاندک ـ لالایی یا کـو دەیک د بەر لاندک هەژاندنێ را دبێـژت دا کـو زارۆکێ خوه بنڤینت.

**نانوا(Nanva)**: نانپێژ، نان فروش.

**نانیـوشـان(Naniyûşan)**: نه

گولێبووی ـ بێ ئاگەهـ، های ژێ نە، ژ نشکەکیڤە.

**ناو(Nav):** هەر تشتێ کو درێژ بت و ناڤک ڤالە وەکی بۆریێ ـ رێڤەچوون یان رەفتارێن ژ نازداری ـ بەلەم، بەلەمێن جەنگی.

**ناوانیدن(Navanîden):** خوەهر کرن، چەماندن.

**ناورد(Naverd):** جەنگ، شەڕ ـ زڤرین لدۆر هەڤدو.

**ناوک(Navek):** کورتکریا پەیڤا (ناو) ئانکو: بەلەم، بەلەما بچویک، قایک ـ تیرا کڤانێ(ناوک انداز = تیرهاڤێژ).

**ناوگان(Navgan):** بەلەمێن جەنگی.

**ناویدن(Navîden):** خوەهر بوون، چەمیان ـ ب نازداری رێڤەچوون.

**ناویژە(Navîjê):** ب غش، غشدار، سەختە، قەلپ.

**ناهار(Nahar):** بنێرە: (ناشتا)ـ فراڤین، خوارنا دانێ نیڤرۆ.

**ناهید(Nahîd):** ستێرا «زوهرە» ـ د ئیرانا کەڤن دا خوداڤەندێ ئاڤێ بوو.

**نای(Nay):** نەی، بلوول(ئێک ژ ئالاڤێن موزیکێ یە کو ب دەڤی دهێتە لێدان)ـ بۆریا هەوای(بۆریەکا کرکرۆکی یە کو هەوای ژ گەوریێ دبەتە پشا. ب عەرەبی دبێژنێ «قصبة الرية»).

**نایاب(Nayab):** نایاب، تشتێ زێدە باش کو کێم پەیدا ببت یان بدەست بکەڤت.

**نایژە(Nayjê):** هەر ئێک ژ چەقێن بۆریا هەوای کو د ناڤ پشا دا بەلاڤە دبن(قصبات الهواء)، هەروەسا (نایچە) ژی لکارە ـ لویلکا گوزکی یان هەر لویلکا کو ئاڤ تێرا دەرباز ببت.

**نبات(Nebat):** شەکر نەبات (جۆرەکێ شریناهیێ یە وەکی شویشێ کو ژ شەکرێ بخوە دهێتە چێکرن).

**نبرد(Neberd):** شەڕ، جەنگ.

**نبردە(Neberde):** شەڕکەر، شەڕڤان، دلاوەر، دلێر.

**نبسە(Nebese):** نەڤی، هەروەسا (نوە، نبیرە، نبس، نبیسە و نواسە) ژی لکارن.

**نبش(Nebş):** کنار(کنارێن گورەپان و چوار رێیانا) ـ ئیشکێن خانی و

کۆلانا.

**نبشتن(Nebêşten)**: نڤێسین.

**نبک(Nebek)**: ئاڤزە، جهەک لبەر لێڤا کانیێ یان رویباری کو ئاڤ ژێ بزێت.

**نبی(Nubî)**: قورئان، مسحەف.
هەروەسا (نپی و نوی) ژی لکارن.

**نبیره(Nebîre)**: بنێرە: (نبسه).

**نبیسه(Nebîse)**: بنێرە: (نبسه).

**نج(Nuc)**: د ناڤ دەڤی دا، هوندری دەڤی ـ دۆرماندۆری دەڤ و لێڤا.

**نجک(Necek)**: رما بچویک.

**نجوغ(Necûx)**: کوریشکێن پوبستێ لەشی.

**نخ(Nex)**: بەنک، دەزی ــ دێو، ناڤێ دێوەکی یە.

**نخجل(Nexcêl)**: قورینجک.

**نخجیر(Nexcîr)**: نێچیر.

**نخجیرگان(Nexcîrgan)**: ئێک ژ ئاوازێن کەڤنێن موزیکا ئیرانی یە و ناڤێ ئێک ژ هەر سیە ئاوازێن باربەدێ موسیقارێ ناڤدارێ خسرو پەرویزی یە. هەروەسا (نخچیرگان ونخچیرگانی) ژی لکارن.

**نخجیرگاه(Nexcîrgah)**: جهێ نێچیرێ.

**نخجیروال(Nexcîrval)**: نێچیرڤان.
هەروەسا پەیڤێن (نخجیروان، نخجیربان، نخجیرزن، نخجیرگیر، شکارچی و شکاربان) ژی لکارن.

**نخری(Nuxrî)**: نەخری، زاروکێ دەستپێکێ کو دهێتە سەر دنیایێ.

**نخست(Nuxust)**: ئێکەم، ئێکەمین.

**نخود(Nu- exod)**: نۆک.

**نخیز(Nexîz)**: پویچەمرۆڤ، رەزیل، قەلس، دەخەس ـ کەمین، جهێ کەمینێ.

**نر(Ner)**: نێر، مرۆڤ یان گیانەوەرێ نێر.

**نرخ(Nêrx)**: نرخ، بها، قیمەت.

**نرد(Nerd)**: یاریا تاولە ـ قورمێ داریَ(هەر ژ ئەردی تا کو دگەهیتە چەقا).

**نردبان(Nerdeban)**: پێسترک.

**نرده(Nerde)**: طانێ بیستانا یان محەجەلێ دەرەچکێن خانیا.

**نرسک(Nersek)**: نیسک.

**نرگ(Nerg)**: دەستەک یان کۆمەڵەکا مرۆڤان یان رەڤدێت گیانەوەرا و رەفێت فرندا.

**نرگس(Nergês)**: نێرگز، گولا

نێرگز.

**نرم(Nerm):** هەر تشتێ کو هاتبیتە قـوتان و مـوخل کـرن ـ نەرم(د رسـتێ دا ئانکوییێن خـوە یێن تایبـەت ددەت، بۆ نموونە چێـدبت بەحـسێ نەرم یان رەق ئاخـفـتنێ بت، یان ژی بەحـسێ رەقـاتی و نەرماتیا تشتەکی یان کەرەستەکی بت و......هتـد)، هەر ژ ڤێ پەیڤێ یە: (نرم کـردن = نەرم کـرن، نەرمـژاندن ـ قـوتان ـ فـێـرکـرن هەڤـۆت کـرن ـ نەرم کـرن، هێـدی کـرن، دلەی دلی دان تـا کـو ئەعـصـابێت وی بهـێنە خـوارێ و......هتد).

**نرمـە(Nermê):** گـوشـتێ نەرمـە ـ نەرمێ گوهی کو گوهارک دکەڤیتێ ـ هەر تشتێ کو نەرم و هێدی بت.

**نرە(Nere):** کیر(ئامیرێ گوهنێلییێ زەلامی) ـ پێلێن ئاڤێ.

**نرە(Nerre):** نێـر، مـرۆڤ یان گیانەوەرێ نێر.

**نریمان(Nerîman):** کـەسێ کـو طبعەتێت مێرانی و نێراتیێ لجەم هەبن، دلێر، پەلەوان ـ ناڤێ بابێ «سام»ی، کـو سام بخوە باپیرێ روستەمێ پەلەوانە.

**نرینە(Nerînê):** نێراتی.

**نزار(Nezar):** لەغـەر، لاواز ـ بێ هێز، وەستیای، بێچارە ـ گوشتێ بێ بەز و دەینگ.

**نزد(Nezd):** نک، دەف، جەم.

**نزدیـک(Nezdîk):** نـێـزیـک ـ لبـەردەست ـ لدەف، لنـک، لجەم ـ جیران ـ کەس و کار، خزم.

**نزم(Nêzm):** مژا دژوار کو دنیا پێ تاری ببت.

**نزیدن(Nezîden):** هلکێـشـان، کـێـشـانەدەر. هەروەسـا (نژیدن، تـژیـدن، تـزیـدن و تـریـدن) ژی لکارن.

**نـژاد(Nêjad):** نـەژاد، کـنـێـت، قنێت(ئەصل و نەسەب).

**نژغـار(Nejxar):** فـریاد، دەنگێن بلند، نرین(وەکی نرینا شێرا).

**نژم(Nêjm):** مژ.

**نژند(Nejend):** خەمگین، پەریشان ـ چرمسی ـ تۆرە، تۆرەبووی.

**نژنگ(Nejeng):** تەلهـە، تەلی ـ رەکەه، قەفەس.

**نژە(Neje):** چەقێ دارێ ـ نیـرێن داری کـو بـان پێ دهێنە داپۆشین ـ

پویلەک کـــو ژ زێڕی یـان زیـڤی دهێـتـە دروسـتکرن دا کـو ل ڕۆژێن دەهواتا ب سـەرێ بویک و زاڤـایا دا بکەن.

**نس(Nus):** دۆرمـــــاندۆری دەڤ و لێـڤـا. هەروەسـا (پوز، نج و نول) ژی لکارن.

**نسـا(Nesa):** بنێـــڕە: (نســـار)ـ کەلەخێ مری، مرار، کەلواش.

**نسـار(Nesar):** نزار، پشـتـەتاڤ ـ سـە و سـیـبـەر. هەروەسـا (نسـا و نسر) ژی لکارن.

**نسک(Nesk):** پەرتووک ـ پشکەک ژ پەرتووکێ ـ هەر پشکەک ژ هەر بیـسـت و ئێـک پشـکێن پەرتووکـا ئاڤـێـسـتـایێ کـو هەر پشـکەکێ ناڤەکێ تایبەت یێ هەی. هەروەسا بۆ ڤێ مـەبەسـتێ (نسکا و نسکە) ژی لکارن ـ نیـسک. هەروەسـا بۆ ڤێ مـەبەسـتێ (نرسک و نرسنک) ژی لکارن.

**نسـوز(Nesûz):** هەر تشـتێ کـو د نـاڤ ئاگـری دا نـەسـوژیت، وەکی هنـدەک (کـــەرپیچ و سـندوق و پەنبیێ تایبەت).

**نسیلە(Nusîlê):** گاڕانا دەوارا.

**نشاختن(Nêşaxten):** دامەزراندن، دانان، جـهـێ وی د جـهـەکی دا ڤـەکـرن. هەروەسـا (نشـاسـتن، بنشـاختن، نشـاخـیـدن، نشـاندن، نشانیدن و جادادن) ژی لکارن.

**نشان(Nêşan):** نیـشـان(عـلامة) ـ نیـشـان(أثـر) ـ ئارمـانج، کـێـل ـ مـەدالی(ویسـام). هەروەسا ژ ڤێ پەیڤێ یە، پەیڤـا (نشـان دادن = نیشادان).

**نشاندن(Nêşanden):** دامـەزراندن ـ کـەسـەک نەچار کـرن کـو روینیتەخوارێ ـ ڤەمراندنا ئاگری.

**نشانە(Nêşane):** کێل، ئارمانج.

**نشانی(Nêşanî):** نیشان(عـلامة) ـ ناڤ و نیشان، ئەدرێس.

**نشبیل(Nêşbîl):** شـۆکـا مـاسـیـا. هەروەسا (نشـپیل، نشل، چنگک و قلاب) ژی لکارن.

**نشست(Nêşest):** روینشت.

**نشستن(Nêşesten):** جـە گـرتن(د جهەکی دا جە گرتن) ـ ئارام بوون ـ روینشتن.

**نشـسـتنگاە(Nêşestengah):** جهێ روینشتنێ.

**نشستە(Nêşestê):** روینشتی.

**نشک(Neşk)**: دارا کاژێ.
**نشگرده(Nêşgêrde)**: گویزانێ کو کەڤلی پێ دبڕن یان مووی پێ دتراشن ژ بۆیی کو ژ کەڤلی جودا ببیت. هەروەسا پەیڤێن (شفره و گزن) ژی لکارن.
**نشگنج(Nêşgunc)**: قورینجیک.
**نشگون(Nêşgûn)**: قورینجیک.
**نشل(Neşel)**: هلاویستنا تشتەکی ب تشتەکێ دی ڤە ـ شۆکا ماسیا.
**نشلیدن(Neşelîden)**: هلاویستن.
**نشیب(Nêşîb)**: نشیڤ، سەراوژێر، خوارێ.
**نشیم(Neşîm)**: روینشتنگەه ـ خانی ـ هێلین.
**نشیمنگاه(Nêşîmengah)**: بنێرە: (نشیم).
**نشین(Nêşîn)**: بن، وەکی: (بنێ دەریایێ) ـ قۆن، کونا قۆنێ، چەرم و گوشتێ د هوندرێ قۆنێ دا(سۆریچک) ـ فرمانە ب روینشتنێ، ئانکو: روینە. هەروەسا «نشین» ئانکوێن (روینشتی و جهگیر) ژی ددەت دەمێ کو دگەل هندەک پەیڤێن دی دهێت، وەکی: (جانشین = جێگر، دلنشین = ئاخفتن یان ئاوازێن کو جهێ خوە لسەر دلی دکەن، کرایە نشین = کرێدار، کەسێ کو ب کرێ د خانیەکێ ڤە روینت و......هتد).
**نغز(Nexz)**: باش، قەنج ـ هەر تشتێ کو دیتنا وی سەیر بت و مرۆڤ خوەشیێ ژێ ببینت.
**نغل(Nexul)**: کویر ـ چالا کویر ـ هەڤشیێ پەزی چ ل چیای بت یان ژی ل بیابانێ بت.
**نغنخواد(Nexnxad)**: رەشرەشک (هندەک دندکێت رەشێت تەمەت کونجیانە کو ب نانی وەردکەن لدەمێ پەحتنێ).
**نغنغ(Nexnex)**: ئامانەکە بەرامبەری چار خرارایە.
**نغوشا(Nêxûşa)**: گوهدار ـ دویکەفتیێن ئۆلێ مانی، یانژی چقەک ژ مانەوییان.
**نغوله(Nexûle)**: بسک ـ کەزی.
**نفاغ(Nêfax)**: جاما مەیێ.
**نفام(Nefam)**: رەنگ رەش ـ کرێت و بێ تام و چونە.
**نفت(Neft)**: نەفت، گاز.
**نفج(Nefc)**: کاغەز، پەرک.
**نفریدن(Nefrîden)**: نفرین کرن،

لەعنەت کرن.

**نفـــرین(Nê- efrîn)**: نفـــرین، لەعنەت، دوعابێن خراب.

**نفله(Nêfle)**: پویچ و خراب بووی.

**نفـــیـــر(Nefîr)**: زرنا ـ نالین و زێمارکرن.

**نک(Nuk)**: بنێرە: (نوک).

**نک(Nek)**: کـــورتکریا پەیڤـــا (اینک)؛ ئانکو: ئیشارەت کرن بۆ نێزیکاتییێ، ئەڤە، ئەڤەیە ـ نۆکە، نهۆ.

**نکاپ(Nêkap)**: دەســـتگورکـــا چەرمی کو نێچیرڤانا دکرنە دەستێ خـــوە دا تەیرێ بازی خـــوە لســـەر دەســـتێ وان بگریت. هەروەســـا پەیڤـــێن (نکاب، نکاف و بهلە) ژی لکارن.

**نکو(Nêkû)**: باش، قەنج.

**نکوە(Nêkûh)**: فـــەرمـــانە ب نصحەت لێکرنێ؛ ئانکو: گازندا ژێ بـکـە، گـلـەیـیـێ لـێ بـکـە، نصحەتا لێ بکە.

**نکوهش(Nêkûhêş)**: گـــازندە، گلەیی، نصحەت.

**نـــکـــوهـــنـــده(Nêkûhendê)**: شـــیـــرەتکەر، گـــازندەکـــەر، نصحەتکەر.

**نکوهیدن(Nêkûhîden)**: گـازندە ژێکرن، نصحەت لێکرن.

**نکوهیـــده(Nêkûhîdê)**: گـــازندە لێکری، نصـحـەت لێکری(کـەسێ کو هاتبیتە نصحەتکرن).

**نگار(Nêgar)**: بـوت ـ ئەڤـــیندار، خوشتڤی، خوشەویست ـ نەخش، وێنە ـ فـەرمـانە ب وێنەکـێـشـانێ یان نڤیـسـینێ؛ ئانکو: بنڤیـسـە، وێنەی بکێـشـە ـ هەروەسـا ئانکوا نڤیسەر یان وێنەکێش ددەت دەمێ دگـەل هندەک پەیڤـێن دی دهێت، وەکـی: (روزنـامـــــــەنـگـار = رۆژنـامــەنڤـیس، چهـــرەنگـار = وێنەکێش).

**نگارخانه(Nêgarxanê)**: بوتخانە ـ جـهـێ کـو ب نەخش و نیـگـاران هاتبیتە خەملاندن.

**نگارش(Nêgarêş)**: نڤیسین.

**نگارگـر(Nêgarger)**: وێـنەکـێش، نەخشکێش، نیگارڤان.

**نگارنده(Nêgarendê)**: نڤیسەر ـ وێنەکێش.

**نـگـاری(Nêgarî)**: چـراکـێ تـریـاک کێشانێ.

**نگاريدن(Nêgarîden)**: نقيسين.

**نگارين(Nêgarîn)**: رەنگين، هەر تشتێ كو هاتبيتە رەنگ كرن ـ خەملاندى ـ نەخشاندى ـ ئەڤيندار يان خوشەويستا روى دەلال.

**نگاشتن(Nêgaşten)**: نقيسين ـ وێنەكرن، نەخشكرن.

**نگاشتە(Nêgaştê)**: نقيسى ـ وێنەكرى، نەخشكرى.

**نگاه(Nêgah)**:سەحكرن. بخوە يا دروست: (نگاه كردن، دبتە سەحكرن).

**نگاهبان(Nêgahban)**: زێرەڤان، پاسەوان ـ چاڤدێر ـ پارێزەر(كەسێ كو تشتەكى لدەڤ خوە هلگرت و بپارێزت).

**نگاهداشتن(Nêgahdaşten)**: پاراستن، لجەم خوە هلگرتن ـ راوەستاندن.

**نگر(Nêger)**: بەرێخوە بدێ، بنێرێ، سەحكێ.

**نگران(Nêgeran)**: بينەر ـ چاڤەرێ ـ هزركەر.

**نگرانى(Nêgeranî)**: چاڤەرێياتى ـ دلنەخوەش، نيگەران، دل ب ترس(كەسێ كو دلێ وى تروڤرو بت و د هزرەكا ب ترس دا بت).

**نگرش(Nêgerêş)**: بەرێخوەدان، سەحكرن.

**نگرندە(Nêgerendê)**: بينەر، كەسێ كو دنێرِتە تشتەكى.

**نگريدن(Nêgerîden)**: نێرين، سەحكرن، بەرێخوەدان.

**نگريستن(Nêgerîsten)**: بنێرە: (نگريدن).

**نگژده(Nêgejde)**: گۆزك.

**نگون(Nêgûn)**: نوخين، دەرنشيڤ، سەرابن ـ چەمياى.

**نگون بخت(Nêgûn bext)**: بەخت ب رەش، بێ ئقبال.

**نگونسار(Nêgûnsar)**: سەرنوخين، دەرنشيڤ، سەرابن ـ هەروەسا ناڤێ جۆرەكێ گولێ يە ژى كو پيچەكێ يا سەرنوخينە، لێ نهۆ پەيڤا بنيات فرەنسى يا «سيكلمە» بۆ ڤێ گولێ پتر لكارە.

**نگە(Nêgeh)**: بنێرە: (نگاه).

**نگهبان(Nêgehban)**: بنێرە: (نگاهبان).

**نگين(Nêgîn)**: موهرك يان بەرەكێ پر بها كو دادننە سەر گوستيركا

یان هەر تشتەکێ دی. هەروەسا (نگینە) ژی لکارە.

**نلک(Nêlk)**: حولیکا چیایی، حولیترش.

**نلم(Nelm)**: باش، قەنج ـ خوەش ـ جوان.

**نم(Nem)**: نم، شەه ـ چپک.

**نما(Nêma)**: رویێ ژ دەرڤەیێ تشتی.

**نمار(Nemar)**: ئیشارە (ئیشارەکرن).

**نماز(Nemaz)**: پەراستن ـ خوە چەماندن ژ بۆیی کو بەنیاتی و بجه ئینانا فەرمانا لسەر خوە دیار بکەت ـ نڤێژ، نمێژ.

**نمازگزار(Nemazguzar)**: نڤێژکەر.

**نماک(Nemak)**: خوێ ـ جوانی و دەلالی ـ تشتێ ب رەواج.

**نمایان(Nemayan)**: ئەشکەرا، خوەیا.

**نمایاندن(Nemayanden)**: ئەشکەراکرن، خوەیاکرن، دەرەهیکرن.

**نمایش(Nemayêş)**: ئەشکەرا، خوەیا ـ شانۆ، تیاتر.

**نمایشگاه(Nemayêşgah)**: پێشانگەه.

**نمایشنامە(Nemayêşnamê)**: شانۆنامە.

**نمایندە(Nemayendê)**: نوینەر ـ نیشاندەر ـ نیشان(علامة).

**نماییدن(Nemayîden)**: نیشاندان.

**نمج(Nemc)**: نم، شەه.

**نمد(Nemed)**: تەحتی.

**نمدار(Nemdar)**: نمیای، شهدار.

**نمشک(Nemeşk)**: سەرتیک ـ قەیماغ ـ نیڤشک.

**نمک(Nemek)**: خوێ.

**نمکدان(Nemekdan)**: خوێدان ـ درکەیە ژ دەڤێ یارێ.

**نمکزار(Nemekzar)**: ئەردێ پڕ خوێ.

**نمک سود(Nemek sûd)**: گوشت یان هەر تشتەکێ دی یێ خوێ کری.

**نمک شناس(Nemek şênas)**: ب نان و خوێ، ب وەفا، وەفادار.

**نمک ناشناس(Nemek naşênas)**: بێ نان و خوێ، بێ وەفا، نان حەرام.

**نـمکین(Nemekîn)**: ب خویَ ـ ب تام ـ دەلال.

**نـمناک(Nemnak)**: نـمـیـــای، شهدار.

**نـمـــودار(Nemûdar)**: خـــوەیا، ئەشکەرا، بەرچاڤ ـ وەکی، مینا ـ نیـشـان(عـلامـة) ـ هێـلا پیـڤـانا بلندبوون و نزمـبـــوونا چەنداتیـا دەرامـەتی کـو لسـەر کـاغـەزەکـا تایبـەت وەکی جـەدوەلا شـەترنجیَ دهێته رسم کرن.

**نـمودن(Nemûden)**: نیشان دان، پێـــشـکێـــشـکرن ـ خـــوەیابوون، ئەشکەرابوون ـ کرن.

**نـموک(Nemûk)**: نمیای، شهدار ـ نیشان، ئارمانج.

**نـمونه(Nemûne)**: وەکی، نموونه ـ برامبـەر ڤیَ گـۆتنا کـوردی یە: «ژ گـای گـوه نیـشـا دان» ـ نەتمام، ب کـێـمـاسـی ـ ژ کـارکـەفـتی، پوبچ بووی ـ کرێت.

**نـمید(Numîd)**: بیَ هیڤی.

**نـمـیـدن(Nemîden)**: نـمـیـــان، شهداربوون ـ پویتەدان ب کەسەکی یان تشتەکی.

**نـنر(Nunur)**: مەللاق.

**ننـگ(Neng)**: شـــەرم، حـــەیا ـ کرێتاهی ـ رسوایی.

**ننگین(Nengîn)**: شـەرمـزار ـ بیَ ناڤ ـ کرێت ـ رسوا.

**ننو(Nenû)**: جۆلانک.

**ننه(Nene)**: دایک.

**نو(Nuw)**: نوی، تازە.

**نوا(Neva)**: ئاواز ـ ناڤیَ ئێـک ژ ئاوازێن مـــوزیکا ئیـــرانی یە ـ پێـدڤیـاتیـێن ژیاریَ(چ خـوارن بت یان ژیَ جل و بەرگ و...هتـد)بن ـ گرەو.

**نواخـــانه(Nevaxanê)**: زیندان، گرتیگەهـ، حەبس.

**نـــواخـتن(Nevaxten)**: نـــەوازش کرن، دەستیَ رەحمیَ ب سەری دا ئینانەخـوار ـ ساز ژەنین ـ تشـتەک ب ئـــەردی دادان یـــان ل ئـــەردی خستن.

**نواده(Nevade)**: نەڤی.

**نوار(Nevar)**: شریت.

**نـــوازش(Nevazêş)**: نـــەوازش، دەستیَ رەحمیَ ب سەریَ کەسەکی دا ئینانە خوار، دلەی دلی کەسەکی دان.

**نوازیدن(Nevazîden)**: بنێـــرە:

(نواختن).

**نواسه(Nevase)**: نەڤسی ـ نەڤی.

**نواگـــر(Nevager)**: ســـازژەن ـ سترانبێژ.

**نواله(Nevalê)**: گرکێن هەڤیری ـ ئەو باهرا خوارنێ کو بۆ کەسەکێ نە ئامادە دانئە رەخەکی.

**نوانخـانه(Nevanxanê)**: جـهێ بخودانکرنا هەژار و دەستکورتان.

**نوانیـدن(Nevanîden)**: هەژاندن، لڤاندن ـ گرین و زێمارکرن.

**نوباوه(Nuwbavê)**: نـوی هاتـی، نوی دیاربووی ـ فـێـقـیێ نـوی گەهشتی ـ زاروک.

**نوبهاران(Nuwbeharan)**: بهار، وەرزێ بهارێ.

**نوبهـــاری(Nuwbeharî)**: ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن کەڤنێن ئیرانی یە ـ ناڤێ ئێک ژ هەر سیه ئاوازێن باربەدی یە.

**نوپا(Nuwpa)**: زاروکێ کـو ژ نـوی ب پیا کەفتبیت.

**نوپان(Nûpan)**: سەلک، سەلکا کو ژ چەقێن دارا ببێ هاتبتە چێکرن.

**نوج(Nûc)**: دارا کاژێ.

**نوجـبـه(Nuwcebe)**: لهی، ئاڤ رابوون.

**نوجوان(Nuwcevan)**: سنێلە.

**نود(Neved)**: هژمارا نوت(٩٠).

**نورد(Neverd)**: تیـرۆک ـ شـەڕ و جەنگ ـ جوان و دەلال.

**نوردیدن(Neverdîden)**: زڤـرین ـ تاکرن، ڤەچەماندن ـ پیڤان، قوناغ ڤەبرین.

**نورنجـــه(Nuwrence)**: حـــەودا ئاڤێ، مەلەڤانگەهـ.

**نوروز(Nuwrûz)**: نیـرۆژ، نەورۆز، جەژنا نەورۆزێ.

**نورهان(Norhan)**: خەلات(خەلاتێ کـو سەفـەرچی بۆ کەسەکی دئینت لدەمێ ژ سەفەرەکێ ڤەدگەریێت)ـ مـزگـینی(خـەلاتێ کـو بـەرامـبـەری مـــزگێن گـــەهـانـدنێ ددەنـه مزگیندەری).

**نوز(Nûz)**: هێژ، هێشتا، هەتا نهۆ.

**نوزاد(Nuwzad)**: نویزادە، زاروکێ کو ژ نوی ژ دایک بووی.

**نـوزده(Nûzdeh)**: هـژمـــــارا نوزدە(١٩).

**نـوس(Nûs)**: کـــەسکوســـور، کەسکوئالا(قـوس قزح). هەروەسا (نوسه و نوشه) ژی لکارن.

**نوساز(Nuwsaz)**: نوی ئاڤاکری، نوی چێکری.

**نوسنگی(Nuwsengî)**: دەورەکە پشتی «عصر حجری» کو مرۆڤی ئالاڤێن ژ بەری چێکری بکار دئینان کو ناڤدارە ب (عصر حجري الجديدة) ئەو ژی دبیتە پشکا ئێکێ ژ خولا دووێ یا چەرخێ چوارێ یێ ئەردناسیێ(Néolithique).

**نوش(Nûş)**: شرینی ـ هنگڤین ـ هەر تشتەکێ خوەش و شرین بو خوارنێ و ڤەخوارنێ ـ فەرمانە ب ڤەخوارنێ، ئانکو: ڤەخوە ـ دەمێ وەک پەیڤەکا لێکدای دگەل هندەک پەیڤێن دی دهێت، ئانکوێن ژێک جیاواز ددەت، وەکی: (بادە نوش = مەی ڤەخور، نوشانوش = دەنگێ مەی ڤەخورا کو دبێژنە هەڤدو «چريو»).

**نوشابە(Nûşabê)**: ئاڤا خوەش بۆ ڤەخوارنێ ـ عەرەق، مەی ـ کۆک، پێپسی.

**نوشاد(Nuwşad)**: زاڤا (گەنجێ کو ژ نوی دبیتە زاڤا). هەروەسا (نوشاه) ژی لکارە.

**نوشاندن(Nûşanden)**: پێ دانە ڤەخوارن.

**نوشانندە(Nûşanendê)**: کەسێ کو ئاڤێ یان مەیێ ب کەسەکێ دی بدەتە ڤەخوارن.

**نوشتن(Nê- evêşten)**: نڤیسین.

**نوشتن(Neveşten)**: پێچان ـ قۆناغ ڤەبرین، رێ ڤەبرین.

**نوشتە(Nê- evêştê)**: نڤشتی ـ نڤیسی.

**نوشتە(Neveşte)**: پێچای، قوناغا ڤەبری.

**نوش خند(Nûşxend)**: گرنژین.

**نوشدارو(Nûşdarû)**: دەرمانێ نەخوەشیا ـ دەرمانێ کو کارتێکرنا ژەهرێ نەهێلیت.

**نوشکفتە(Nuwşêkuftê)**: ژ نوی بشکفتی، گولا ژ نوی ڤەبووی.

**نوش لب(Nûş leb)**: لێڤ شرین.

**نوش لبینا(Nûş lebîna)**: ناڤێ ئاوازەکا کەڤنا موزیکی یە.

**نوشنجە(Nûşence)**: خوەش بۆ ڤەخوارنێ.

**نوشندە(Nûşendê)**: ڤەخور(کەسێ کو ئاڤ یان مەیێ ڤەدخوت).

**نوشە(Nuwşeh)**: شاهێ نوی ـ

شاهێ گەنج ـ گەنجێ ژ نوی دبیتە زاڤا.

**نوشـە(Nûşe)**: هەردەم، هەروهەر ـ خوەشبەخت، کامەران ـ خوەش بۆ ڤەخوارنێ.

**نوشیدن(Nûşîden)**: ڤەخوارن.

**نوشین(Nûşîn)**: هەر تشـتـەکێ شـرین ـ هەر تشـتـەکێ خـوەش بۆ ڤەخوارنێ.

**نوشین بادە(Nûşîn badê)**: مـەیا خـوەش ـ ئێک ژ ئاوازێن کـەڤنێن مـوزیکا ئیـرانی یە ـ ناڤێ ئێک ژ هەر سیهـ ئاوازێن (باربد)ی یە.

**نوغـان(Nuwxan)**: هێکا کـرمێ ئارمویشی.

**نوف(Nûf)**: دەنگ و دۆر، هۆسـە ـ دەنگڤـەدانا دەنگی ل چیـای ـ دەنگێ رەوینا سەی.

**نوفـیـدن(Nûfîden)**: گـازیکرن ـ قـێـری راهێـلان ـ نڕین ـ هژیان، لڤین.

**نوک(Nuk)**: نـکل، دم ـ سـەرکێ تیـژێ تشـتـێـن وەکی شـویژنێ یان قەلەمی یان خەنجەرێ.

**نوکار(Nuwkar)**: نویکار، کـەسێ کـو بێ سـەربۆر بت و ژ نوی دەست ب کـارەکی کـربت ـ خـولام، خزمەتکار.

**نوکدخدا(Nuwkedxuda)**: زاڤا ـ کـەسێ کـو ژ نـوی دبیـتـە خـودان مال و مەزەل.

**نـوکـر(Nuwker)**: خـولام، خزمەتکار.

**نوکرباب(Nokerbab)**: کەسێ کو ژ تەخا خولام و خزمەتکارا بت.

**نوکیسە(Nuwkîse)**: کەسێ کو ژ نوی زەنگین بووی.

**نول(Nûl)**: دۆرمـاندۆری دەڤی ـ نکل، دم.

**نومید(Nuwmîd)**: بێ هیڤی، بێ ئومێد.

**نون(Nûn)**: نۆکـە، نهـۆ ـ چالا ئەرزنکێ.

**نوند(Nevend)**: توند و سـرت ـ ژیر، یێ کو زوی فێری وی زانستی یان کاری ببیت یێ کو نیشا ددەن ـ هەسپ یان هێسـترێ کـو توند بچـیت، بەزەک ـ پیلک یان سویارێ کو بلەز بچیت.

**نوە(Neve- Nevê)**: نەڤی.

**نوید(Nuvîd)**: مزگینی، موژدە.

**نویدن(Nevîden)**: نالین، گـرین،

زێمــــارکـــرن ـ لەرزین، هژیان، د جهدا لڤین.

**نویسا(Nevîsa)**: نڤیسەر.

**نویسندە(Nevîsendê)**: نڤیسەر.

**نـوین(Nevîn- Nuvîn)**: نـوی، تازە.

**نوییـــــدن(Nûyîden)**: گـــرین و زێمارکرن.

**نە(Ne)**: نەء، نۆ، نەخێر.

**نە(Nuh)**: هژمارا نەه(٩).

**نە(Nêh)**: شار، باژێر، جهێ ئاڤا ـ فەرمانە ب دانانێ، ئانکو: بدانە.

**نهاد(Nêhad)**: سروشت، طبعەت، دەروون.

**نهـادن(Nêhaden)**: دانان، دانانا تشتەکی ل جهەکی.

**نهادە(Nêhadê)**: دانای.

**نهار(Nêhar)**: کێمکرن، کـێمکرنا کێشا لەشی، لەغەری.

**نهاز(Nuhaz)**: سەرکێشا پەزی.

**نهاز(Nêhaz)**: ترس.

**نهازیدن(Nêhazîden)**: ترسیان.

**نهازیدە(Nêhazîdê)**: ترسیای.

**نهال(Nêhal)**: شتلا دارێ، دارا کو ژ نوی هاتبیتە چاندن.

**نهـالە(Nêhale)**: بنێـرە: (نـهـال) ـ چەقـەکێ داری یە کـو نێـچـیـرڤـان دکەتە هەلامەت دا کو نێچیرا خوە پێ بهاژۆت بۆ لایێ تەلهێ.

**نهـالی(Nêhalî)**: جـهێ نڤـسـتنێ، دۆشەک، نالیک.

**نهان(Nêhan)**: ڤەشارتی، نەپەن.

**نهـفتن(Nêhuften)**: ڤـەشـارتن، داپۆشین.

**نهـمــار(Nehmar)**: بێ هژمـار، گەلەک، فـراوان ـ بێ سـینور، بێ دویماهی ـ سەیر، عـنتیکە ـ دژوار، ب زەحمەت.

**نهــبـــان(Nêhban)**: قـــەپاخ، دەرقەدامک.

**نهنبــــیــــدن(Nêhunbîden)**: ڤەشارتن، داپۆشین.

**نهنج(Nêhenc)**: جهال.

**نـهــنـگ(Neheng)**: نـەهـەنـگ (گیانەوەرەکێ مەزنێ دەریایی یە).

**نـهـــــــــور(Nuhûr)**: چـاڤ ـ بەرێخوەدان، نێرین.

**نهیب(Nehîb)**: ترس.

**نهیدن(Nehîden)**: دانان ـ هزرکرن و خەم خوارن.

**نی(Nî)**: نەء، نۆ، نەخێر ـ نینە.

**نی(Ney)**: قـەڕام، لەڤـەن ـ بلوول،

ئێک ژ ئالاڤێن موزیکێ یە.

**نیا(Niya):** باپیر و بابکالک.

**نیـــاز(Niyaz):** پێـــدڤـیــــاتی ـ حـەژێکرن و داخـوازی، عـەشق و ئارەزوو.

**نیـازمند(Niyazmend):** پێـدڤی، موحتاج.

**نیام(Niyam):** کاڤلان.

**نیایش(Niyayêş):** دوعاکرن.

**نیرم(Neyrem):** دلێر، پەهلەوان ـ ناڤێ بابێ ســـامی و باپیـــرێ روستەمێ پەهلەوانە.

**نیرنگ(Neyreng):** فێل، حـیلە، بسەردابرن ـ سحر، جادوو.

**نیرنگ(Nêyreng):** دوعا، د ئۆلێ زەردەشتی دا دبێژنە هندەک رێ و رەســـمێن تایبـەت و دوعـــایێن تایبەت ب وان رێ و رەسمانڤە.

**نیرو(Nîrû):** زاخ، هێز.

**نیـــرومند(Nîrûmend):** ب زاخ، ب هێز.

**نیـز(Nîz):** ژی، هەم، وەکی:(رزگـار ژی هات، هەم رزگـــار هات و هەم ســـەربەست)ـ هەروەســـا، دیســـا، دیساڤە.

**نیزک(Neyzek):** نەیزەک.

**نیـــزە(Neyze):** دارەکێ مـــوکـــوم و درێژ کـــو ئاسنەکی ســـەرتیـــژ ب سەریڤە کەن ـ روم.

**نیـــــساری(Nîsarî):** لـەشکـەری، کـەسێ کـو ب گـێـولێ خـوە ببـیـتـە سەرباز.

**نیـــــــســـــان(Neysan):** وەکی نەیێ(بنێرە: نی Ney).

**نیست(Nîst):** پویچ بوون، نەمان.

**نیستو(Nîstû):** نشتەر.

**نیش(Nîş):** سـەرێ هەر تشـتێ کـو نـکل تیـــژ بت، وەکی: (ســـەرێ شویژنێ، سەرێ خەنجەرێ، سەرێ نشـــــتـــــەری) ـ زیـلـک(زیـلـکا گیـانەوەرێن ژەهردار کو ژەهرا خوە ب رێکا وی زیـلـکی دگـــەهینـنـە لەشێ مـرۆڤی) ـ کێلب(هەر چوار ددانێن سەر تیژێن مرۆڤی کو دو ل سلالن و دو ژی لخوارێ نە).

**نیشتر(Nîşter):** نشتەر.

**نیشـخند(Nîşxend):** کـەنییێ نە ژ دل و ژ قەهرڤە.

**نیـشـە(Neyşe):** بلوول(ئالاڤـەکێ موزیکێ یە).

**نیـفە(Nîfe):** مـالدۆخین، ئەو جـە ژ شەلوالی کـو دۆخینێ دکەنە تێرا ـ

کەڤلێ گیانەوەرێ مرار ـ مرار.

**نیک(Nîk)**: باش، قەنج ـ خوەش ـ دەلال، جوان ـ قەنجیکار، مرۆڤێ کو کارێن باش بکەت کو کۆما وان دبێژنێ «نیکان».

**نیک اختر(Nîk exter)**: بەختیار، خوەشبەخت، خوەش شانس.

**نیکخو(Nîkxû)**: طبعەت خوەش.

**نیکو(Nîkû)**: باش، قەنج ـ دەلال، جوان ـ قەنجیکار ـ طبعەت خوەش ـ روی دەلال.

**نیلک(Nîlek)**: رەش و شین بوونا پویستێ لەشی ـ بسەر رەنگێ نیلی ڤە ـ قورینجک.

**نیلگون(Nîlgûn)**: ب رەنگێ نیلی.

**نیله(Nîle)**: نیلی، رەنگێ نیلی.

**نیم(Nîm)**: نیڤ.

**نیم بسمل(Nîm bêsmêl)**: نیڤ کوشتی، گیانەوەرێ کو ستوێ وی نیڤ تمام هاتبیتە برین و لدەمێ گیان دانێ بت.

**نیم تخت(Nîm text)**: بنێرە: (نیمکت).

**نیمچه(Nîmçê)**: جلکێ کورت ـ شیر یان تڤەنگا کورت ـ هەر تشتەکێ کورت و ب کێماسی.

**نیم خورده(Nîm xurdê)**: بەرماییک.

**نیم رخ(Nîm rux)**: نیڤ روی(وێنێ کو ژ ئالیەکێ رویێ مرۆڤی دهێتە گرتن).

**نیمرو(Nîmrû)**: بنێرە: (نیم رخ) ـ رەخەکێ روی ـ هێکروین.

**نیمروز(Nîmrûz)**: نیڤا رۆژێ، نیڤرۆ، دەمێ نیڤرۆ ـ ناڤێ کەڤنێ باژێرێ «سیستان» ـ ناڤێ ئاوازەکا کەڤنا موزیکا ئیرانی یە ـ ئێک ژ هەر سیهـ ئاوازێن «باربد»ی یە.

**نیم کاره(Nîmkarê)**: نیڤەرو، کارێ کو نەهاتبیتە بدویماهیک ئینان.

**نیم کاسه(Nîm kasê)**: ترارکێ بچویک.

**نیمکت(Nîmket)**: کورسیکەکا پەحنە کو جهێ دو یان سێ کەسا لسەر بکەت. هەروەسا (نیم تخت و نیم دست) ژی لکارن.

**نیم کره(Nîm kurê)**: نیڤەکا گۆیا زەمین کو ب هێلا ئستیوایێ دبیتە دوکەرێن؛ نیڤکەرێ باکور و نیڤکەرێ باشوور.

**نیم گرم(Nîm grm)**: تێهن شیر.

**نیـمـور(Nîmûr):** ئالاڤێ گـوهنێلی یێ زەلامی، کیر.

**نیـمـە(Nîmê):** نیـڤـە، نیـڤـا هەر تشتەکی.

**نیـو(Nîv):** گـەنج، جـحـێل ـ دلێـر، ئازا، پەهلەوان.

**نیوارە(Neyvare):** تیرۆک.

**نیـــوش(Niyûş):** فـــەرمـــانە ب گوهداریێ، ئانکو: گوهێ خوە بدێ ـ لدەمێ دگـەل هندەک پەیڤێن دی وەک پەیڤـــەکـــا لێکدای دهێت، ئانکوا گـوهدار ددت، وەکی: سـخن نیـوش = کەسێ کو گوهـ ل ئاخفتنا دبیت.

**نیوشا(Niyûşa):** گوهدار. هەروەسا (نیوشنده و شنونده) ژی لکارن.

**نیوشە(Niyûşe):** گوهـ ل ئاخفتنێن خـــەلکی گـــرتن، ب دزیکیـــڤـــە گـوهداریا دانوسـتـاندنێن خەلکی کرن ـ هێدی گرین و کزکێت گری.

**نیـوشـیـدن(Niyûşîden):** گـوهـ لێ بوون، گوهدان.

**نیــوشــیــدە(Niyûşîdê):** گـوهـ لێ بووی.

**نیوە(Nîve):** نالین، گـرین، زێمـار ـ قیژی و لێخورینا ژ قەهر.

**نیین(Neyîn):** هەر تشـــتێ کـــو ژ نەیێ یان لەڤەنی هاتبیتە چێکرن.



**و(Vav):** تیپا سیهێ یە ژ ئەلفابێیا زمـــانێ فـــارسی ـ تیـــپـــا پێکڤەگرێدانێ یە ـ هەگەر کەفتە ناڤـبــەرا دو پەیڤــان دا، لدەمێ بلێڤکرنێ ئەڤ تیپە دێ مینتە ب دوماهیا پەیڤا دەستـپـێکێ ڤە، وەکـــی: (راه و چــــاه: Raho çah، خـــور و خـــواب: Xoro xab) ـ د هندەک پەیڤان دا ئێک (و) دهێتە نڤیسین، لێ ب (وو) دهێـتە بلێـڤکرن، وەکی پەیڤـێن: (کــاوس: Kavus، داود: Da-vud)، دبێــژنە ڤی رەنگی «واو اشـبــاع»ـ د هندەک پەیڤــان دا دهێــتـە نڤـیـسین، لێ ناهێــتــە بلێڤکرن، وەکی: (خواب: Xab، خــواهر: Xaher)، دبێــژنە ڤی رەنگی «واو معـدوله»ـ د هندەک پەیڤــان دا دەنگێ ضـەمما عـەرەبی ددەت، وەکی (دو، تو)ـ د هندەک پەیڤـان دا ژی دهێـتـە نڤـیـسین و دهێتە بلێڤکرن ژی، وەکی (خوب، نیکو، دور)، دبێــژنە ڤی رەنگی «واو معروف».

**وا(Va):** پێـــــشـگرە و ئـانـکـوبـێـن (ڤـــەکــــری ـ دوبارە) ددەت ـ هەروەسا بۆ هندەک خوارنێن رۆهن دهێــتــە گـۆتن، وەکی: (شــوربا، شوروا).

**وابسـتـە(Vabestê):** گـرێدای ـ نێزیکاتی یان خزمایینی.

**واپس(Vapes):** لدویڤ، لپـــەی، لپشت.

**وات(Vat):** ئاخفتن، سوحبەت ـ هەر تشـتێ کـو ژ کـەڤلێ گـیـانەوەرا هاتبیتە چێکرن.

**واتگر(Vatger):** ئاخـفـتـنکەر ـ شاعر ـ کەسێ کو کارێ وی دربارا

جل و بەرگ یان وان تشتایە کو ژ کەڤلێن گیانەوەرا دهێتە چێکرن.

**واج(Vac):** گـــۆتار، ئاخــــڤتن، سوحبەت ـ دوعایا کو زەردەشتی لسەر سوفرا زادی دخوینن.

**واجار(Vacar):** بازار، سویک.

**واچیــــــدن(Vaçîden):** ژێکرن، چنین، دوبارە چنین، چنینەڤــە ـ ژ ئەردی راکـــــرن، وەکی راکــــرنا چنیکێن نانی کو مریشک ژ ئەردی رادکەت ـ خرڤەکرن، کۆمکرن.

**واخ(Vax):**پەیڤا سەرسوورمانێ یان ئافــــەرین گــۆتنێ یە(وەی، وەی وەی) ـ ب راستی، ب دروستاهی.

**واخـــــواست(Vaxast):** خـــــوە نەرازیکرن ـ عــێب ل تشـــتــەکی ڤــەدیتن ـ پرســیـــارکـرن ل پێناڤ ئاگەهداربوون لسەر کێماسی یان گونەها کەسەکی.

**واخـــواهی(Vaxahî):** بنێــــرە: (بازخواست).

**واخوردن(Vaxorden):** جحنین(بۆ نموونە کـەسـەک یێ ل هیـڤـیێ کـو ئاخــڤــتنەکێ گــوهـ لێ ببت یان تشــتــەکی ببـینت و بەروڤـاژی وێ خەیالێ بۆ روی بدەت، ل ڤی دەمی ئەو کــەس ژ ســەرســورمــانێ دێ جـحنت) ـ بێ بهــا بوون، بازارێ تشتەکی نەمان.

**واخیـدن(Vaxîden):** ژ هەڤ جودا کرن.

**وادادن(Vadaden):** زڤــــراندن ـ رهاکــرن ـ جــودابوونا گــێــچێ ژ دیواری.

**وادیان(Vadyan):** رزیانک.

**وادیج(Vadîc):** سیـخمێت مـێوا ـ هەر جـهێ کـو تری پێـڤـە بهـێـتـە هەلاویستن.

**وار(Var):** پاشگرەکە و ڤان ئانکویا ددت: «وەکی، مــینا»، بۆ نموونە: (دایــرەوار: وەکــی بــازنــەی) و «خــودان، خـــاوەن»، بۆ نموونە: (ســـوگـــوار: خـــودانێ تازیێ، بەلادیتی، خەمـهـەلگر)، و «لایق، هێژا»، بۆ نموونە: (شاهوار: تشتێ باش و پڕ بهــا کــو هێــژا و لایـقی شـــاهی بت) ـ جــار، دۆر، نـورە، نوبەت، گەڕ، کەڕەت.

**وارسته(Varestê):** ئازاد، رەها.

**وارغ(Varex):** ئەو جهـ ژ جۆوێ کو ب بەرا و ئاخێ رێ لبەر چۆنا ئاڤێ هاتبـتـە گـرتن دا ئاڤ د مـشـارەکـا

دی یان جـــۆوەکـــا دی را بچت ـ کنف، وەریس ـ بەرک ـ بایێ کـو ب دەنگ ژ گەوریێ دەرکەڤت.
**وارن(Varen)**: ئەنیشک.
**وارو(Varû)**: سـەرابن، دەرنشـیڤ، نوخین ـ قولیپانک.
**واروزدن(Varûzeden)**: قولیپانک ڤەدان.
**واروک(Varûk)**: بالیل، بەهلیلک.
**وارون(Varûn)**: ســـــــەرابـن، دەرنشـیـڤ، نوخین ـ بێ ئیـڤلەح، پێ ب رەشک، بەش، کور.
**واره(Vare-ê)**: بنێـــــرە: (وار)ـ هندەک جـارا ژ بۆیی کـو صـفـەت بهـێـتـە گـوهارتن بۆ ناڤی، دێ (واره) ل دویماهیـا وی صـفـەتی ئێتە زێدەکـرن، وەکی: (گوشواره: گوهارک، گاهواره: لاندک).
**وارهـــانـــدن(Varehanden)**: ئازادکرن، خلاس کرن، قورتالکرن، رزگارکرن.
**وارهیــــــــدن(Varehîden)**: ئـازادبـوون، خـــــلاس بـوون، قورتالبوون، رزگاربوون.
**واژگـــون(Vajgûn)**: ســـەرابن، سەرنوخین، دەرنشیڤ، قولپی.
**واژون(Vajûn)**: بنێرە: (واژگون).
**واژه(Vaje-ê)**: پـەیڤ، ووشـــــە، واژە.
**واســتــدن(Vasêteden)**: دیسـان ستاندن، گرتنەڤە.
**واستریوش(Vastiryoş)**: جۆتیار.
**واسـرنگیـدن(Vaserengîden)**: هێرش برن ـ ئاخفتنێن رەق و دژوار گـۆتن(ئێـک لسـەر سـەرێ یێ دی بـکەتـە هەوار و قـــێـــری)ـ ئینکارکرن.
**واشـامـه(Vaşame)**: کـەفـینک، دەرسوک.
**واشـــدن(Vaşuden)**: ڤـەبوون ـ جـــودابوون ـ شی بوون، حـــەل بوون(حەلبونا پرسیارەکێ).
**واشنگ(Vaşeng)**: داهۆلقـوتێ کـو ل هەیڤـــا رەمـــەزانێ و ل دەمێ پاشیـڤێ مـرۆڤی هشـیـار دکـەت ـ زێرەڤـان، بـەرپرسێ دەســتــەکـا زێرەڤانا.
**وافـور(Vafûr)**: ئالاڤـەکـە کـو تریاکـــچی بکار دئیـنن لدەمێ کێشانا تریاکێ.
**واکـردن(Vakerden)**: ڤـەکـرن ـ شیکرن، حەلکرن.

**واکشیدن(Vakêşîden):** کێشانەدەر.

**واکوفتن(Vakûften):** دو تشت لێکدان.

**واگذاردن(Vaguzarden):** تشتەک ئێخستنە د خزمەتا کەسەکی دا، تەسلیم کرن ـ رەهاکرن، ژێڤەبوون، بەلا خوە ژێڤەکرن.

**واگرایی(Vagerayî):** دویری، ژ هەڤ دویرکەتن.

**واگردان(Vagerdan):** دوبارە زڤراندنەڤە ـ سەروبن کرن ـ سەروژنوی حساب کرن.

**واگویە(Vagûyê):** دوبارە گۆتنەڤە.

**واگیر(Vagîr):** ڤەگر(ئێشا کو ژ ئێکی بچیتە ئێکێ دیتر).

**وال(Val):** نەهنگ ـ جۆرەکێ پەرۆکێ ئارمویشی یە.

**والا(Vala):** بلند، بالا ـ پایەبەرز، پایەبلند.

**والاتر(Valater):** بلندتر، بالاتر.

**والاد(Valad):** بان ـ گونبەد، قوببە ـ دیوار ـ قالب، کەلواش.

**والادگر(Valadger):** بەننا، دیواردانەر، ئاڤاهی چێکەر.

**والان(Valan):** دەستەکەکە ژ گیانەوەرێن دەریایی یێن ب مەمک ـ رزیانک.

**والانە(Valane):** برین(جرح).

**والە(Vale):** سەراب، لەیلان ـ جۆرەکێ پەروکێ ئارمویشی یە ـ گرین ـ ئیصرارکرن، رژدی ـ ب ئانکویێن خوە یێن عەرەبی ژی د زمانێ فارسی دا لکارە کو ئەڤەنە: (عاشق، دل دۆڕای، کەسێ کو د دەردێ عەشقێ دا سەرگێژ و حەیران مابیت ـ خەمگین).

**والیدن(Valîden):** شین بوون، مەزن بوون، وەرارکرن، نەموکرن.

**وام(Vam):** دەین، قەر.

**وامانden(Vamanden):** ڤەمان، پاشدەمان ـ وەستیان و ژ پیا کەتن.

**وامخواه(Vamxwah):** کەسێ کو داخوازێ ژ کەسەکی بکەت کو دەستگرتنێ ب دەین دگەل بکەت ـ کەسێ کو داخوازا دەینێ خوە ژ دەینداری بکەت.

**وامدار(Vamdar):** دەیندار، قەردار.

**وامی(Vamî):** دەیندار، قەردار ـ سست و بێ هێز، وەستیای.

**وان(Van):** ئـێـک ژ پـاشـگـرێـن خـاوەنداری و پارێزڤـانـیێ یە و واتایێن (وەک، مـینا ـ پارێزەر، پارێزڤان ـ خودانکەر) ددت.

**وای(Vay):** دەنـگـێ ئـاخ و ئـوف و وەی و وایێن کو ژ مرۆڤێن خەمدار یان نەخوەش دهێت.

**وجب(Veceb):** بهوست.

**وجین(Vêcîn):** ئادەکرن.

**وچر(Veçer):** فەتوا.

**وچرگر(Veçerger):** مفتی(کەسێ کو فەتوایێ ددەت).

**وخ(Vex):** پەیڤا سەرسوورمانێ و ئافـەرین گـۆتنێ یە لـدەمێ مـرۆڤ تشتەکێ جوان دبینت و خوەشییێ ژ وێ جـوانیێ دبەت. ئەڤ پەیڤـە پتـرتر دەبل دهێـتـە بکارئینان(وخ وخ) و د کـوردی دا بەرامـبـەری: (وەی وەی، ئـەحـــــۆ، تـەهـ تـەهـ و......هتد)یە.

**وخشور(Vexşûr):** پێغەمبەر(بەس بۆ زەردەشت پێغەمبەری لکارە).

**ور(Ver):** پاشگرەکـە و ئانکوێـن (خـــودان ـ بجی هینەر)ددەت ـ کـنـار، ئـال، رەخ ــ پـەیـڤـــــــا مەرج(شرط)ی یە کو کورتکریا (و اگر : و هەکەر)ە ـ جێربـاندن یان ئەزمـوونەک بوو کو ل ئیرانا کەڤن دهاتە ئەنجـامــدان بۆ دیارکـرنا گـونەهکاری ژ بێ گـونەهی و ب رێکێن خوراندنا ئاڤا تێکەل کری ب کـبـریتێ و دناڤ ئاگـری را بوراندنا وان کەسا.

**ور(Vêr):** پربێژی.

**وراج(Vêrrac):** پربێژ.

**وراز(Vuraz):** بەرازێ نێر.

**وراغ(Verax):** ئاگـر ـ رۆناهی و گوریا ئاگری.

**وریوشـه(Verpûşê):** عـەبا ـ دەرسۆک، کەڤینک.

**ورج(Verc):** بها، قەدر، رێز.

**ورجاوند(Vercavend):** پایەبەرز، رێزدار.

**ورجـمند(Vercmend):** رێزدار، هێژا، بهاگران.

**ورخج(Verexc):** پیس، قـرێژی، قـیـڤـارگـرتی ـ پیس، چەپەڵ، پوبچـەمـرۆڤ، مـرۆڤێ چوننە، مرۆڤێ بێخێر.

**وردان(Vêrdan):** بەهلیلک، بالیل.

**وردک(Verdek):** کوزۆت و جهێزا بویکێ.

**وردنه( Verdene ):** تیرۆک.

**ورز( Verz ):** کـاریّ بەردەوام، کـاریّ لدویڤێک ـ کاریّ چاندنیّ.

**ورزا( Verza ):** کـێـلانا ئەردی ب گاییّ جۆتی.

**ورزش( Verzêş ):** وەرزش.

**وەرزشکار( Verzêşkar ):** کـەسیّ کو وەرزشیّ دکەت، وەرزشڤان.

**ورزکار( Verzkar ):** جۆتیار.

**ورزگـاو( Verzgav ):** گـاییّ جۆتی(گاییّ نێر کو بۆ جۆتی مفا ژیّ دهێته وەرگرتن).

**ورزگر( Verzger ):** جۆتیار.

**ورزگن( Verzgen ):** گۆزک، گۆزکیّ پری ئاڤ.

**ورزم( Verezm ):** ئاگـر ـ گـوریا ئاگری ـ تێهن و گەرماتیا ئاگری.

**ورزنده( Verzendê ):** وەرزشکـەر، وەرزشڤان.

**ورزیدن( Verzîden ):** وەرزش کـرن ـ کـارکـرن، لدویڤـێک کـارکـرن ـ سەعی کرن، خوە واستاندن.

**ورزیده( Verzîdê ):** وەرزش کـری، ب هێز ـ ب دەستڤەئینای.

**ورس( Vers ):** داریّ کو دکەنە د دفنا حێشتریّ را.

**ورس( Verês ):** وەریس ـ کنف.

**ورساز( Versaz ):** گـەنجیّ دەلال و کەشخە.

**ورستاد( Verestad ):** حەقدەستیّ رۆژانە ـ مۆچیّ هەیڤانە، دەرماله.

**ورسیج( Versîc ):** دەرازینک.

**ورشـتـاد( Vereştad ):** بنێـره: (ورستاد).

**ورشکست( Verşêkest ):** دۆڕای، خوسارەتبووی.

**ورشـکـسـتن( Verşêkesten ):** دۆڕاندن، خـوسـارەتبـوون، زیان ڤـێکەفتن، پاشـدەمـان د کـاریّ بازرگانی دا.

**ورغ( Verx ):** سکر(سکریّ بچـویک کو ژ دار و بەر و ئاخ و گیای لسەر ڕێیا ئاڤیّ بهێته دانان) ـ ڕۆناکی، ڕۆناهیاتی.

**ورغـلانیـدن( Verxelanîden ):** پالدان(تەحریک کرن).

**ورکاک( Verkak ):** تەیریّ کەلەخا.

**ورگوش( Vergûş ):** گوهارک.

**ورم( Verm ):** هـش و بیـــــر ـ ژ بەر(حفظ).

**ورمـالیـدن( Vermalîden ):** دەهمـەن هلدان، دەلنگ هلدان،

هچک هلدان ــ درکـــــــهیه ژ (رەڤین)ێ.

**ورنا(Vurna):** گەنج، جەحێل، تۆلاز.

**ورواره(Vervare):** زۆر، زۆرێـــــت هاڤینی.

**وروت(Vurût):** قـــــــــەهرین، تویرەبوون.

**وروغ(Vurûx):** بایێ کو ب دەنگ ژ گەوریێ دەردکەڤت ـ تاریاتی، رەشاتی.

**ورهمین(Verhemîn):** نانێ کو ژ ئاریێ گەنم و جەهی دناڤێکدا هاتبته چێکرن.

**وریب(Vurîb):** خوەهر، کەج.

**وریز(Verîz):** ستورک، جۆرەکێ ستورکێ یە.

**وز(Vêz):** دەنگێ پێشی و مێشا.

**وزغ(Vezex):** بەق.

**وزیدن(Vezîden):** لڤینا هەوای، هاتنا بای.

**وژولیدن(Vêjûlîden):** پەریشان بوون، چرمسین، تێکچوون.

**وژه(Veje):** بهوست.

**وستا(Vesta):** ئاڤێستا.

**وستاخ(Vustax):** نەترس، دلێر ـ بێ ئەدەب، ئەدەب سز. هەروەسا پەیڤێن (گستاخ، بستاخ، استاخ، اوستاخ و بیستاخ) ژی لکارن.

**وسه(Vese):** گۆپال.

**وش(Veş):** پاشگرەکە و ئانکوا (وەک، وەکی) ددت، وەکی: (شیروش: وەکی شێری ـ پریوش: وەکی پریا) ـ قەلپیشکێ پەمبی ـ خوەش ـ باش، قەنج ـ دەلال، جوان ـ هەلبژارتی.

**وشت(Veşt):** باش، قەنج.

**وشتن(Veşten):** زڤرین(لدۆر تشتەکی زڤرین) ـ رەقسین، سەماکرن.

**وشکردن(Veşkerden):** چالاکی کرن، کارەک ب باشی بجهـ ئینان.

**وشکول(Veşkûl):** زەلامێ چست و چەلەنگ.

**وشکولیدن(Veşkûlîden):** ب چالاکییا رابوون، چەلەنگی کرن.

**وشگون(Vêşgûn):** قورینجک.

**وشم(Veşm):** هلم.

**وشن(Veşen):** باران ـ بەفر.

**وشی(Veşî):** پەرۆکێ ئارمویشی یێ رەنگین(دیبا و اطلس).

**وشینه(Veşîne):** زری و کومزری.

**وغست(Vexest)**: خوەیا، ئاشکەرا.

**وغستن(Vexesten)**: خوەیاکرن، ئاشکەراکرن، دەرەهیکرن.

**وغوغ(Vexvex)**: دەنگێ رەوینا سەی ـ دەنگێ بەقێ.

**وغیش(Vexîş)**: زێدە، گەلەک، فراوان، مشە ـ بیش، جهێ کو مشە قەرام لێ بت.

**وک(Vek)**: بەق.

**ول(Vêl)**: رەها، ئازاد، سەربخوە.

**ولانە(Velane)**: برین(جرح).

**ولرم(Vêlerm)**: تێهن شیر.

**ولغونە(Vulxûne)**: سۆراڤ.

**ولگرد(Vêlgerd)**: فەلیتە، کۆلانی.

**ولنگار(Vêlengar)**: بێ هەڤسار، سەربەردای.

**ولو(Vêluw)**: رەها، ئازاد، سەربخوە ـ ژێک بژالە، پەلاتە.

**ولی(Velî)**: لێ، لێ بەلێ، بەلێ پا، بەس.

**ونج(Venc)**: چویچک.

**وندیداد(Vendîdad)**: پشکەکە ژ پەرتوکا ئاڤێستایێ.

**ونگ(Veng)**: دەنگێ گریێ بچویکا ـ ڤالە، خالی ـ دەست ڤالە، مفلس.

**وننگ(Veneng)**: چەق یان شاکێت دارمێوێ.

**وە(Veh)**: وەه، پەح(پەیڤا سەرسوورمانێ یە لدەمێ تشتەکێ جوان یان سەیر دهێتە دیتن).

**وە(Vêh)**: باش، قەنج.

**وهنگ(Veheng)**: هەچک (دارکەکێ دو چەقە کو چەقەک ژ یێ دیتر درێژترە و ئالیێ درێژتر ب وەریسی ڤە دهێتە بەندکرن و بۆ گرێدانا باری دهێتە بکارئینان. نوکە شوینا وی هەچکی، خەلەکێن ئاسنی بکار دهێن.) ـ فرا ئاڤێ، قورچا ئاڤێ.

**وهیزک(Vehîzek)**: بنێرە: (بهیزک).

**وی(Vey-Vêy)**: ئەو، وی، جیناڤێ کت بۆ سێیەم کەسێ نە ئامادە، وەکی: (وی آمد: ئەو هات ـ وی گفت: وی گۆت).

**وی(Vey)**: چەنداتی ـ زێدەکرنا تشتەکی ب چەند جارکی، وەکی:(دە وی: دەه بەرامبەر، دەه جار هند) یان:(وی کردە است:

یێ زێده بووی.) ـ پەیڤا مـخـابنییێ یه(وەی، وای، ئاخ و......هتد).

**ویار(Viyar)**: مەهبیران، ئەو حالەته کـو دەمێ ژنکا ب حـال، دلێ وێ دچیتـه هندەک جۆرێن خـوارنا و ژ هندەکێن دی رەش دبیت.

**وید(Vîd)**: کـێم، پچـەک، هندک ـ بەرزە، هندا، ون.

**ویر(Vîr)**: هش و بیـر ـ فـەهم ـ زێمار، نالین ـ فریاد، قێری.

**ویرا(Vîra)**: زیرەک، کـەسێ کـو هزر و بیرێن وی باش کار دکەن.

**ویراستن(Vîrasten)**: رێکخـستن، تەرتیفکرن.

**ویران(Vîran)**: وێـران، خـــراب، کاڤل.

**ویژه(Vîjê)**: تایبەت.

**ویل(Vîl)**: سـەرکـەفتن ـ دەستپێشخەری و تشتەک بدەستڤه ئینان.

**ویلان(Veylan)**: سـەرگـەردان، حـەیـران ـ دەربەدەر، ئاوارە ـ پەریشان، تێکچۆی.

**ویله(Vîle)**: دەنگ و دۆر، قـێـری، دەنگێ بلند.

# هـ

**ه(Ha):** تیپا سیه و ئێکێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی و ب دو رەنگایە: (ه)یا کو ل دەستپێک، نیڤەک و دویماهیا پەیڤا دهێت و بلێڤ ژی دبت، وەکی: (هر ـ شهر ـ گاه)، و (ه)یا کو بلێڤ نەبت و تنێ ل دویماهیا هندەک پەیڤا دهێت، وەکی: (بنده، خنده، زنده).

**ها(Ha):** پەیڤا بەرسڤ دانێ یە(ها، هۆ، ئا، ئۆ، بەلێ، چی یە و......هتد) ـ نیشانا کۆمێ یە د تشتێن بێ گیان دا، وەکی: (خانەها، چوبها، سنگها).

**هاج(Hac):** سەرسوورمای، حەیران. (هاج و واج)بهەڤرە پتر لکارە.

**هاچە(Haçe):** دارەکێ دوچەقە کو وەک پالپشت دادننە بن چەقێن دارێ داکو نەچەمیێت.

**هادوری(Hadûrî):** خوازخوازۆک، گەدا، گەدایێ زک ئێش کو زوی ب زوی ژ مرۆڤی ڤەنەبیت و داخوازا خوە بکەتە چیرۆک و هەر بێژیت و بێژیتەڤە ـ مرۆڤێن بێ سەروچاڤ، بێخێر.

**هار(Har):** رستکا مراری یان لەعل و یاقویت و تشتێن ژ ڤی رەنگی، گەردەنی ـ ستۆ، موهرکێت ستۆی ـ هەر تشتێن کو رێکخستی و تەرتیفکری هاتبنە رێزکرن.

**هاژ(Haj):** بنێرە: (هاج).

**هاژیدن(Hajîden):** سەرسوورمای بوون، حەیبیرین ـ وەستیان، بێچارە بوون ـ گرین.

**هاس(Has):** کورتکریا پەیڤا (هراس)، ئانکو: ترس، سەهم ـ دیسان، هەروەسا.

**هاک(Hak):** تۆڤ ـــ هێکا

مریشکێ.

**هال(Hal):** قـــەرار، ئارام، بێـــهن فرەهی.

**هـــالـــو(Halû):** زوی بـــاوەر، دل سافی، دلپاک.

**هاله(Hale):** پویـچـــــەمـــــرۆڤ، فتنەچی.

**هامـــون(Hamûn):** دەشت، ئەردێ راست.

**هـامـی(Hamî):** حـــــــــەیـران، سەرگەردان.

**هان(Han):** پەیڤـا تەمـــبـیکرن و ئاگـەهدارکـرنێ یە، د کـوردی دا بەرامــبــەری (نـهێ)یە، هەروەکی دبێـژین: (نهێ هەگـەر تو جـارەکـا دی هۆ بکەیەهە......!).

**هاون(Haven):** هاون. هەروەســـا (کابیلە) ژی لکارە.

**های(Hay):** پەیڤـــا گـــازیکرنێ یە(هۆی، ئوهۆی و......هتـــد) ـ پەیڤـــا مـــخـــابنییێ یە(ئاخ، ئۆف......هتد).

**های های(Hay hay):** دەنگێ گری و زێمارێ یە.

**هـای هـوی(Hay hûy):** دەنـگ و دۆر، هۆسە و قـەرەبالغ(د جڤـاتێن ب کەیف و خوەشی دا).

**هباک(Hebak):** راستکا سەری.

**هبر(Heber):** کێم و ئەداڤا برینێ.

**هبک(Hebk-bek):** کەڤا دەستی، نیڤا دەستی.

**هج(Hec):** راست راوەستیای، لسەر پێ راوەستیای، هەر تشتەکێ کو د ئەردی ڕا هاتبتە چکلاندن و راست راوەستیای بت، وەکی: (ئالا و رم و......هتد).

**هجاور(Hecaver):** کۆمەکا مرۆڤا، دەستەکەکا مرۆڤا.

**هـجـــــدە(Hêcde):** هـژمـــــارا هەژدە(١٨). هەروەسـا (هـیـجـدە، هشتدە، هشدە، هژدە) ژی لکارن.

**هچه(Heçe):** بنێڕە: (هاچە).

**هدنگ(Hedeng):** هەسپێ سپی.

**هـدە(Hude):** راسـت و دروسـت ـ حەق ـ سوود و مفا.

**هر(Her):** هەمی، لسەرێک.

**هر(Hêr):** ئاخـفـتـنەکـە کـو لدەمێ هاژۆتنا کـەسـەکی یان گـیـانەوەرا دهێتە گۆتن.

**هرا(Herra):** دەنـگ و هەرا، دەنـگ و قـــێـــریێـن ترسناک ـ دەنـگێ گیانەوەرێ درندە.

**هراس(Heras)**: ترس، سەهم.
**هراسناک(Herasnak)**: ترسناک، ب سەهم.
**هراسە(Herase)**: هەلامەت.
**هراسیدن(Herasîden)**: ترسیان.
**هراسیدە(Herasîdê)**: ترسیای، ترساندی.
**هراش(Heraş)**: دلڕابوون، هلاڤێتن.
**هرجایی(Hercayî)**: ئاوارە ـ عەتارک ـ فەلیتە، کۆلانی.
**هرز(Herz)**: بێهودە، بێ مفا ـ بێ شۆل، بێ کار.
**هرس(Hers)**: بانێ خانی ـ نیرە یان کاریتێن کو د بانێ خانی دا دهێنە بکارئینان.
**هرس(Heres)**: کەزاخە.
**هرشە(Herşe)**: دارئالینک(هەر گیایەکێ کو خوە لدۆر دارێ بئالینت).
**هرکارە(Herkare)**: مەنجەلا کو ژ بەری هاتبیتە چێکرن ـ یێ کو مایێ خوە د هەمی کاران بکەت و شارەزایی د وان کاران دا هەبیت ـ پیلک، قاسد ـ جەهسیس.
**هرگز(Hergêz)**: هەرگیز، ئەبەد، قەد ـ هەردەم.
**هرم(Hurm)**: گەرمها ئاگری، گوڕیا ئاگری.
**هرماس(Hurmas)**: شەیتان، ئەهریمەن.
**هرمز(Hurmuz)**: ئاهورامەزدا ـ ناڤێ ستێرا موشتەری یە ـ ناڤێ رۆژا ئێکێ یە ژ هەمی هەیڤێن سالا هەتاڤی ـ ناڤێ رۆژا پێنجشەمبی یە.
**هرو(Herv)**: دلێر، نەترس ـ کەلە.
**هروانە(Hervane)**: نەخوەشخانە ـ جهێ کو مرۆڤێن شێت لێ دهێنە چارەسەرکرن و خودانکرن ـ ئەشکەنجە ـ جهێ ئەشکەنجەدانێ.
**هروهل(Hervehel)**: تیشکلێ کونجی یا پشتی کو دوهنێ وان ژێ هاتبیتە گرتن.
**هرە(Hurre)**: قۆن، کۆنا قۆنێ ـ جۆرە گیایەکێ ژەهراوی یە کو لناڤ زەڤی یێن گەنم و جەهی شین دبت.
**هرهر(Hêrhêr)**: حیل حیل(دەنگێ کەنیێ بلند).
**هرهری(Herherî)**: بێ ئیمان، بێ باوەر.
**هرهفت(Herheft)**: پێدڤیاتیێت

جوانکاریێن ژنکا کو د کەڤن دا ژ هەفت تشـــتـــان پێک دهاتن، وەکی: (سۆراڤ، سپیاڤ، خەنا، کلێ چاڤا و......هتد).

**هریمن(Herîmen):** کـــورتکریا پەیڤا (اهریمن): ئەهریمەن.

**هرین(Hurîn):** دەنگێن ترسناک، دەنگێ گیانەوەرێن درندە.

**هزار(Hezar):** بلبل، هزار ـ هژمارا هزار(١٠٠٠).

**هزارپا(Hezarpa):** زیڤزیڤە.

**هزارتابە(Hezartabe):** دڕکـەیە ژ هەتاڤێ، رۆژ.

**هزارچشـــمـــە(Hezar çêşmê):** سەرەتان، پەنجەشێر، ئێشا پیس ـ قونێر.

**هزاردســـتـــان(Hezardestan):** بلبل، هزار.

**هزارمیخ(Hezar mîx):** دڕکەیە ژ جلکێن زڤر و جلکێ دەرویشا کو جـهێ دریار و پنیـا زێدە لســەر هەبت ـ دڕکـەیە ژ ئەسـمـانێ پڕ ستێر.

**هزارە(Hezare):** هزارە(هزارا ئێکێ و هزارا دووێ و......هتد)ـ هزارەمین ـ رێ و رەسـمێن کو ب هلکەفتا زندیکرنا هزارەمین سـالا بوون یان مرنا کەسەکی دهێنە کرن.

**هزاک(Hezak):** هەبلـە، نـەزان ـ کەسێ کو زوی فێل لێ بهێنە کرن و بهێتە خاپاندن.

**هزبر(Huzebr):** زیرەک، چەلەنگ ـ دلێر، ئازا.

**هزد(Hezed):** سەقاڤ.

**هزوارش(Huzvarêş):** شـرۆڤـە و تەفسیر ـ بلێڤکرنا پەیڤەکێ نە ب وی رەنگێ کو هاتیە نڤیسین، بۆ نموونە؛ پەهلەڤیـا دەمێ پەیڤـا (جلتـا) یان (ملکا)ییێن ئارامی دکـەفـتـە بەرچاڤـێن وان، هەر ئێکســـەر دا هەڤـــواتایا وان یا پەهلەڤی بلێڤ کـەن و بێـــژن: (پوست) و (شاە).

**هزینە(Hezîne):** هەزینە، خەرجی.

**هژهار(Hejhar):** دەانەکێ زێدەیە کو د دەڤێ هەسپی دا دەردکەڤت و تا نەهێتە هلکێشان نەشێت ئالفی بخۆت.

**هژیر(Hejîr):** زیرەک ـ هشـیـار ـ لایق، هێـژا. هەروەسـا (هجیـر و خجیر) ژی لکارن.

**هست(Hest):** هەبوون(وجـــود ـ

موجود).

**هسته(Hestê):** بەرکێ فێقییێن وەکی مژمژە و خوخ و حولیک و......هتد ـ پارچا ناوەندی یا ئەتومێ ـ د زاراوێ فیزیۆلۆژی دا تشتەکێ خڕ و گروڤرە کو دکەڤتە د ناڤ سیتوپلاسمێ دا.

**هسر(Heser):** قەڕاسە، بەستی.

**هسک(Hesek):** ملهێب.

**هشپلک(Huşpulek):** فیتی (دەنگێ فیتیا).

**هشت(Heşt):** هژمار هەشت(٨).

**هشتاد(Heştad):** هژمار هەشتێ(٨٠).

**هشتصد(Heştsed):** هژمار هەشسەد(٨٠٠).

**هشتم(Heştum):** هەشتەم، تشتێ کو کەفتبیتە د پلەیا هەشتێ دا.

**هشتن(Hêşten):** هێلان.

**هشدار(Huşdar):** پەیڤا هوشداریێ یە، هەروەکی دبێژن: ئاگەهداربە، هشیار بە.

**هشنگ(Heşeng):** بێ سەروچاڤ، بێخێر، پویچ.

**هشوار(Huşvar):** هشدار، هشیار.

**هشومند(Huşûmend):** ژیر، عاقل، هوشیار، هوشمەند. هەروەسا (هوشیار، هشیوار، هوشمند و باهوش) ژی لکارن.

**هفت(Heft):** هژمار حەفت(٧).

**هفت آباء(Heft aba'i):** دڕکەیە ژ هەفت ئەسمانا. هەروەسا ناڤێن (هفت اورنگ، هفت ایوان، هفت بام، هفت بناء، هفت بنیان، هفت پرگار، هفت پوست، هفت خضراء، هفت سقف، هفت طارم و هفت طبق) ژی لکارن.

**هفتاد(Heftad):** هژمار حەفتێ(٧٠).

**هفت تیر(Heft tîr):** دەبانجا کو هەفت گوللا دخۆت.

**هفت جوش(Heft cûş):** ئاسنەکێ گەلەک رەقە کو ژ تێکهلکرنا هەفت کەرەستێن دی یێن ئاسنی پێک دهێت. (طالیقون) ژی لکارە ـ دڕکەیە ژ مرۆڤێ ب تاقەت و تەحەمل.

**هفت سین(Heft sîn):** سوفرەکە کو لدەمێ نوی بوونا سالێ دهێتە دانان و هەفت رەنگە خواردەمەنیا لسەر دادنن ب مەرجەکی کو تیپا دەستپێکێ یا هەر هەفت

خواردەمەنیان ب پیتا (س) دەست پێ بکەت؛ وەکی: (سیر، سرکە، سیب، سماق، سمنو، سنجد، سبزی) و خوە ب وێ چەندە دلخوەش دکن کو دێ بڤێ چەندێ سلامەتی و خوەشبەختی قەست کەتێ. بۆ زانین بەری ئیسلامێ لشوینا تیپا (س)، تیپا (ش) لکار بوو، لێ ژ بەر بیر و باوەرێن ئیسلامەتیێ و حەرامبوونا (شەراب)ێ د ئۆلێ ئیسلامێ دا، سوفرا حەفت شین گوهارتن ب سوفرا حەفت سین، داکو (شەراب) لسەر سوفرێ نەهێتە دانان.

**هفتصد(Heftsed):** هژمارا حەفتسەد(٧٠٠).

**هفته(Heftê):** حەفتی(اسبوع) ـ حەفتیک.

**هفده(Hefde):** هژمار هەڤدە(١٧).

**هفهف(Hefhef):** حەفحەف(دەنگێ سەی).

**هکچه(Hukçe):** ئیسک.

**هکک(Hukek):** ئیسک.

**هکل(Hukel):** کڤارک.

**هکهک(Hukhuk):** ئیسک ـ کزگربوک.

**هگرز(Hegêrz):** هەرگیز، چو دەمەکی، ئەبەد.

**هلا(Hela):** پەیڤا گازیکرنێ یە(ئەی، یا) ـ پەیڤا تەنبیهـ کرنێ یە(نهێ).

**هلاشم(Helaşem):** هەر تشتەکێ نەباش و کرێت و بێخێر. (لهاشم) ژی لکارە.

**هلاکت(Helaket):** ئەڤ پەیڤە ژ پەیڤا (هلاک) یا عەرەبی هاتیە چێکرن و د زمانێ عەرەبی بخوە دا نینە، ئانکو: پویچ بوون، نەمان، هیلاک بوون.

**هلالوش(Helalûş):** فتنە، شورش و سەرهلدان.

**هلک(Hulek):** ئالاڤەکێ مینا سینیکا ترازیێ یە کو د مەنجەنیقێ دا بکار هاتیە و بەر دکرنە د نیڤا وێ «هلک»ێ دا و دهاڤێتنە نەیاری.

**هلو(Hulû):** خۆخ.

**هله(Hele):** بنێرە: (هلا).

**هله(Hêlê):** بهێلە، ژێ بگەرهە، دەست ژێ بەردە.

**هلیدن(Hêlîden):** هێلان، دەست ژێ بەردان.

**هم(Hem)**: هەڤ؛ پێشگرەکە و واتایێن (وەکهەڤی، هەڤکاری و شریکاتیێ) ددەت، وەکی: (همسایە: جیران، همکار: هەڤکار، همراە: هەڤرێ، همدم: هەڤدەم، هەڤال) ـ وەک پێشگر دگەل هندەک پەیڤێن عەرەبی ژی دهێت؛ وەکی: (همسفر، همصورت و......هتد) ـ هەم، وەکی: (هەم ئەڤە و هەم ژی ئەڤێ دی) ـ ژی، وەکی: (ئەو ژی هات).

**هما(Huma)**: هوما، فڕندەکێ چیڤانۆکی یە.

**همار(Hemar)**: ئامار ـ هژمار ـ حیساب.

**همال(Hemal)**: هەڤتا، هەڤال ـ وەکی، مینا.

**همانند(Hemanend)**: وەکهەڤ ـ وەکی، هەروەکی.

**همایون(Humayûn)**: پیرۆز، مبارەک ـ ناڤێ ئێک ژ ئاوازێن موزیکا ئیرانی یە.

**همباز(Hembaz)**: هەڤال، شریک، هەڤتا.

**همبازی(Hembazî)**: کەسێ کو دگەل کەسەکێ دی یاریا بکەت.

**هم بالا(Hem bala)**: تەمەت هەڤ، ئێک بەژن، هندی ئێک.

**همباور(Hembaver)**: هەڤبیر، هەڤ باوەر.

**هم بند(Hem bend)**: پێکڤە گرێدای.

**همتا(Hemta)**: هەڤتا، هەڤال، شریک ـ وەکی، مینا ـ هەڤژین ـ بەرابەر، ئێکسان.

**همچنان(Hemçunan)**: هەروەسا ـ وەکی وی.

**همچنین(Hemçunîn)**: هەرهوسا ـ وەکی ڤی.

**همچو(Hemço)**: وەکی، مینا، شتی.

**همگی(Hemêgî)**: ب هەڤڕە، تەڤایی.

**هملخت(Hemlext)**: پێلاڤ.

**هموار(Hemvar)**: راست(ئەردێ راست).

**همواره(Hemvarê)**: هەردەم، بەردەوام ـ لدویڤێک. هەروەسا پەیڤێن (همار، همارە، همارا، هاموار و هاموارە) ژی لکارن.

**همه(Hemê)**: هەمی، تەڤایی.

**همەدان(Hemêdan)**: هەمی تشت

زان، زێدە ئاگەهدار.

**همی(Hemî)**: ئەڤـە ـ هەرهوسـا ـ هەردەم، هەمیشە ـ هەگەر لسەرێ کارێ رابردۆ بهێت، ئەو نیشانە ژ بەردەوامیا کاری، وەکی: (همی رفت: دچۆ. همی گفت: دگۆت.) ـ هەروەسا لسەرێ کارێ نهۆ و کارێ فەرمان ژی دهێت، وەکی: (همی رود: بێ دچت. همی رو: هەرە.).

**همیان(Hemyan)**: هنبان، کیسێ پارا.

**همیشه(Hemîşê)**: هەردەم، هەمیشە.

**هاینده(Henayendê)**: کارتێکەر (مؤثر).

**هناییدن(Henayîden)**: کارتێکرن.

**هنجار(Hencar)**: رێ، رێباز ـ رێ و رەسم ـ رێکا راست، جـادده ـ تەرز و شێواز ـ شەنگستە.

**هنجام(Hencam)**: تەمبەل، کەدوەر، کەسلان.

**هنجیدن(Hencîden)**: کێشانەدەر.

**هند(Hend)**: بنێرە: (هنجار).

**هندوانه(Hênduvane)**: وەکی هندی یا ـ زەبەش، شتی.

**هنر(Huner)**: هونەر ـ پیشە ـ کارەکی بەرچاف.

**هنرپرداز(Hunerperdaz)**: هونەرمەند.

**هنرپیشه(Hunerpîşê)**: هونەرمەند(هونەرمەندێ شێوەکاری و موزیکی و شانۆ و سینەمایێ).

**هنرمند(Hunermend)**: هونەرمەند. هەروەسا (هنرور، هنرپرور، باهنر، هنری) ژی لکارن.

**هنگ(Heng)**: زاخ، هێز ـ قەدر، قیمەت، بها(بۆ مرۆڤێ خودان قەدر و قیمەت و بها دهێتە گۆتن)ـ دەستەک، گرۆپ ـ مللەت ـ هۆز ـ سوپا.

**هنگار(Hengar)**: لەزاتی، توند و سرتی.

**هنگام(He- êngam)**: دەم، وەخت، زەمان.

**هنگامه(Hengame)**: هنگامە، دەنگودۆر ـ وەخت، زەمان، دەم.

**هنگفت(Henguft)**: مەزن، گر، ب کەلەخ ـ زێدە، گەلەک، مشە.

**هنوز(Henûz)**: هێشتا، هەتا نۆکە. هەروەسا پەیڤێن (نوز، هنیز، هنی) ژی لکارن.

**هواپیما(Hevapêyma)**: فرۆکە،

بالەفڕ، تەیارە.

**هوار(Hevar):** هەڕفتە، کاڤل.

**هواری(Hevarî):** خیڤەتا مەزن.

**هوازی(Hevazî):** هەر زیندەوەرێ کو ب هەوای بژیت ـ ژ نشکەکیڤە.

**هوبە(Hûbe):** مل، شان.

**هوتن(Hûten):** خوەش قەد و قامەت، بەژن و بال دەلال.

**هود(Hûd):** جوهی(یهودي)ـ تۆبەکەر ـ ناڤێ پێغەمبەرەکی یە ـ پویش و پەلەخێ کو ئاگر پێ بهێتە هلکرن ـ قەمیای.

**هودر(Hûder):** کرێت و بێخێر.

**هودە(Hûde):** سود، مفا، قازانج ـ راست، دروست.

**هور(Hûr):** خۆر، تاڤ، هەتاڤ. هەروەسا (خور، خورشید، هوررخش، هورشید)ژی لکارن ـ شەنس، بەخت.

**هورمزد(Hormezd):** ئاهورامەزدا.

**هوش(Hûş):** هش، عەقل، هەست ـ زیرەکی، چەلەنگی ـ گیان، جان ـ مرن، مەرگ.

**هوشمند(Hûşmend):** هشیار، زیرەک، ژیر، عاقل.

**هشیار(Huşyar):** بنێرە: (هوشمند).

**هوشیدر(Huşîder):** ئێکە ژ ناڤێن خودایێ بێ هەڤتا.

**هولناک(Holnak):** ترسناک، ب سەهم.

**هولە(Holê- e):** خاولی.

**هولی(Holî):** جانی هەسپێ کو هێشتا نەهاتبیتە زین کرن ـ ئێک ژ جەژنێن هندی یا کو ل دەستپێکا وەرزێ بهارێ دهێتەکرن.

**هوو(Hevû):** هەوی(دو ژن کو ب مێرەکی بن، هەردو ژن دبنە هەوییێن هەڤدو). هەروەسا ناڤێن (بناغ، بناج، بنانج، بنانچە، بنج، همشوی، آسنی، آموسنی و وشنی) ژی لکارن.

**هوی(Hoy):** هۆی(پەیڤا هشداردان و ترساندن و مخابنییێ یە)ـ ترس، سەهم ـ بێهن، نەفەس ـ ئاخینک.

**هویج(Hevîç):** گێزەر.

**هوید(Hevîd):** پارچەکا تەحتی یە کو لدۆرماندۆری پشتا حێشترێ دهێتەدانان ـ زینا کو ژ تەحتی هاتبیتە چێکرن.

**هویدا(Huveyda):** پەیدا، ئەشکەرا، خویا.

**هی(He- êy):** هێی (پەیڤە هشداردان و ئاگەهدارکرنێ یە)ـ لدەمێ ئافەرین گۆتنێ ژی دهێتە گۆتن ـ هەروەسا پەیڤا تەهدیدکرن و ترساندنێ یە ژی.

**هیاهو(Heyahû):** غەوغا، شەڕ و شەڕەدەڤ، دەنگ و دۆر و هۆسە و قەرەبالغ.

**هیپی(Hîpî):** ژ پەیڤا (Hip) یا ئنگلیزی هاتیە وەرگرتن کو د زمانێ ئنگلیزی دا ئانکو پەریشانی و تێکچوون و حالەتێ مالیخولیایی یە، لێ نهو ل ئیرانێ بۆ هندەک گەنجا دهێتە بکارئینان کو سەر و ریهێن خوە بەرددەن و جلکێن نێزیکی یێن ژنکا دکەنە بەرخوە و کارێ خوە بەس یێ کری عەشق و ئەڤین.

**هیچ(Hîç):** هیچ، چونە ـ بێهودە ـ کێم، پچەک. هەروەسا (ایچ و هیش) ژی لکارن.

**هیچکارە(Hîçkarê):** کەدوەر، کەسێ کو ب کێر چو کارەکی نەئێت.

**هید(Heyd):** ملهێب.

**هیدخ(Heydex):** هەسپێ گەنج و توند و سرت ـ هەسپێ کو هەڤۆتکرنا وی ب زەحمەت بت ـ هەسپێ شەڕی. هەروەسا (هیدج و بیدخ) ژی لکارن.

**هیربد(Hîrbed):** پێشەوایێ ئۆلی ـ مامۆستایێ زانستێن دینی و قازیێ زەردەشتی ـ بۆ وان مۆبەدا دهاتە گۆتن کو ژ بلی مۆبەدیێ وەک مامۆستا ب فێرکرنا قوتابیان ژی رادبوون.

**هیز(Hîz):** سەرژنک ـ نێرامێ ـ خرابکار ـ بێ شەرم.

**هیزم(Hêyzum):** دار و چقێن هشک کو بکێر سۆتنێ بهێن.

**هیش(Hîş):** بنێرە: (هیچ).

**هیگر(Heyger):** هەسپێ کو رەنگێ وی سۆرێ بناڤ رەشی ڤە چۆی بیت.

**هیمە(Hîme):** بنێرە: (هیزم).

**هین(Hîn):** ئەڤ، ئەڤە ـ پەیڤا ترساندن و هوشداردانێ بهەڤرەیە، وەکی دبێژن (نهێ!).

**هیون(Heyûn):** حێشتر، حێشترێ کو توند بچیت، حێشترێ مەزن ـ بۆ هەسپی ژی دهێتە گۆتن.

# ێ

**ی(Ya):** تیپا سیە و دووێ و دویماهیێ یە ژ ئەلفابێیا زمانێ فارسی و ب دو رەنگایە؛ مەعروف و مەجهول. هندی «ی» مەعروفە، دبێژنە وێ «ی» یا کو ب تمامەتی دهێتە بلێڤکرن، وەکی: (بیخ، تیر، پیش، ریش) و هندی «ی» مەجهولە، ئەو «ی»یە یا کو وەکی کەسرەیەکا تێر و تژی دهێتە بلێڤکرن، وەکی: (دلیر، شمشیر)، بەلآم ئەڤرۆکە چو جیاوازی نەهێلاینە د ناڤبەرا هەردو «ی»ان دا و هەردویان ب ئێک ئاوا لێڤدکن. هەروەسا ئەڤ تیپە لداوییا هندەک پەیڤان دهێت و رەنگێن خوە هەنە: «ی» ژێدەری، وەکی: (دوستی، دشمنی)، «ی» نسبەت پێدانێ، وەکی: (تهرانی، شیرازی)، «ی» نەنیاس کو نیشانە ب کەسەک یان تشتەکی نەدیار، وەکی: (مردی، زنی، سنگی، کتابی)، «ی» جیناڤی، وەکی: (رفتی، دیدی، بردی)، «ی» زێدە کو دکەڤتە ناڤبەرا دو پەیڤان و هەروەسا دکەڤتە داوییا وان پەیڤێن کو ب (ا، و) دهێنە بدویماهی ئینان، وەکی: (بوی گل، نوای بلبل) و «ی» بەردەوامییێ، وەکی: (رفتنی، گفتنی).

**یا(Ya):** پەیڤا پێکڤەگرێدانێ یە (یان، ئان).

**یاب(Yab):** فەرمانە ب ڤەدیتنێ، ئانکو: ڤەبینە ـ پوبچ بووی، نەمای ـ بێهودە، بێ مفا، بکێرنەهاتی.

**یابر(Yabêr):** ئاڤ و ئەرد یان گوندێ کو پاشای داباڤ کەسەکی ژ بۆیی کو خوە پێ بخودان کەت.

**یابش(Yabêş)**: پەیدا بوون.

**یابندە(Yabendê)**: پەیداکەر.

**یابو(Yabû)**: هەسپێ دوقۆر، هەسپێ کو نە ژ نەژادەکێ رەسەن بت، هەسپێ باری، هەسپێ بارهلگر.

**یابیدن(Yabîden)**: پەیداکرن ـ بدەستڤەئینان.

**یاختن(Yaxten)**: کێشانەدەر، ئینانەدەر(وەکی شیر ژ کاڤلانی ئینانەدەر).

**یاد(Yad)**: بیر، یاد.

**یادآمدن(Yad ameden)**: بیرهاتن.

**یادآوردن(Yad averden)**: ب بیرئینانەڤە.

**یادبود(Yadbûd)**: یادگاری، پێشکێشکرنا تشتەکی وەک بیرهاتن بۆ کەسەکێ دی ـ بیرئینانەڤە(رێ ورەسمێن کو ل بیرهاتنا کەسەکی بهێنە ئەنجامدان).

**یاددادن(Yad daden)**: نیشادان، فێرکرن.

**یادداشتن(Yad daşten)**: ژ بەربوون(حفظ)، ئاگەهداربوون.

**یادکردن(Yad kerden)**: بیریا کەسەکی کرن.

**یادگار(Yadgar)**: بنێرە: (یادبود).

**یادگرفتن(Yad gêrêften)**: فێربوون، عەلمین.

**یادە(Yade)**: بیر( هزر و بیر)ـ بەرتیل(رشوة).

**یار(Yar)**: دوست، هەڤال، هەڤدەم ـ یار، خوەشتڤی، ئەڤیندار ـ هاریکار ـ وەکی، شتی، مینا.

**یارا(Yara)**: هێز ـ وێریان.

**یارایی(Yarayî)**: هێزداری، دلێری ـ بوێری، نەترسی.

**یاررس(Yar res)**: هاریکەر، هاریکار.

**یارستن(Yaresten)**: شیان، ژ دەرحەق دەرکەتن.

**یارک(Yarek)**: کورتکریا پەیڤا (یار) ئانکو: یارک(دەمێ دبێژین: یارکێ وێ)ـ یارا بچویک ـ هەڤال بچویک.

**یارگی(Yaregî)**: بنێرە: (یارایی) ـ دەلیڤە.

**یارمند(Yarmend)**: هاریکەر ـ یار، دوست.

**یارو(Yarû)**: کورتکریا پەیڤا (یار:

دوست، هەڤـال)ـ نیـشـانە ب کەسەکی کو نەڤێن ناڤێ وی بێن.

**یارە(Yare):** بازنک، دەستـبەند ـ تۆک، تۆق ـ بنێرە: (یارا).

**یاری(Yarî):** هەڤالینی، دوستینی ـ هاریکاری ـ ژن تی (هەگەر چەند برا ب ژن بن، ژنێت وان دبنە ژن تی بێت هەڤدو).

**یاریگر(Yarîger):** هاریکار.

**یازیدن(Yazîden):** کـێشـانەدەر، ئینانەدەر ـ دەست درێژکـرن بۆ ئالیێ تشتەکی ـ مەزن بوون، نەمو کرن، وەرارکرن ـ پیـشان، قـوناغ ڤەبرین.

**یاسج(Yasêc):** تیر (تیرا کڤانێ کو سـەرکـەکێ پەحن و تیـژ بناڤێ پەیکان یێ پێڤە).

**یافتن(Yaften):** ڤـەدیتن، پەیداکرن ـ بدەستڤەئینان.

**یافـە(Yafe):** بێـهـودە، بێ مـفـا ـ بەرزە، هندا ـ بێ رێ و کـولان، پەریشان.

**یاکند(Yakend):** یاقوت.

**یال(Yal):** گـەردەن، سـتـۆ ـ زەند ـ مویێ ستۆێ هەسپی و شێری.

**یان(Yan):** ئەو پەیڤـێن کـو دەمێ مرۆڤ ژ بەر دئاخڤت بێی حەمد ژ دەڤێ مرۆڤی دەردکەڤن.

**یاور(Yaver):** هاریکار، پشتـەڤان ـ پلەیەکا ئەفسەری یە دناڤ رێزێن لەشکەری دا ـ دەستکێ هاونی.

**یاوە(Yave):** بێـهـودە، بێ مـفـا ـ سەربخوە، بێ خودان.

**یاهو(Yahû):** پەیڤـەکـە کـو پرانیـا دەروێشـا بکار دئینن و مـەبەسـتـا وان ژێ زاتێ خودێ یە ـ هەروەسـا ناڤێ رەنگەکێ کـوترێ یە یێ کـو دەنگێ «یاهو» ژ دەڤی دەردکەڤت.

**یب(Yeb):** بنێرە: (یاسج).

**یخ(Yex):** قـەراسـە، بەسـتی، جەمـەد. هەروەسـا (هسـر، هسـیر، هتشە و کاشە) ژی لکارن.

**یخ بستن(Yex besten):** بەستن، جەمدین، قەرسین.

**یخ بندان(Yexbendan):** سـر و سەقـەما دژوارا زڤـستـانێ کـو ئاڤ لێ دهێتە قەرسین.

**یخـچـال(Yexçal):** کـونبـەفـر ـ سەلاجە، بوزدولاب.

**یخـچـە(Yexçê):** کـورتـکریا پەیڤـا (یخ) کو هەمان جەمەدە ـ گژلۆک.

**یخە(Yexe):** یاخە، پستۆک.

**یدک(Yedek)**: هەسپێ زین کری یێ بێ سویار(کەس لسەر ن) کو کەسەکێ دی(چ سویار با لسەر هەسپەکێ دی یان ژی پەیا با)، دا هەڤساریێ وی هەسپێ زین کری گرت و ل پێشیا مەوکبێ شاهی کەڤتە ریێ. هەروەسا (بالاد، بالادە و کتل) ژی لکارن.

**یدکی(Yedekî)**: یەدەک، ئحتیاط.

**یزدان(Yezdan)**: یەزدان، خودێ.

**یزدان پرست(Yezdan perest)**: خودێ پەرێس.

**یزک(Yezek)**: پێشرەوێ سوپای، کەسێ کو ل پێشیا سوپای دچیت.

**یزنە(Yezne)**: زاڤا (مێری خوبشکێ).

**یسنا(Yesna)**: ئێک ژ پشکێن ئاڤێستایێ یە کو لدەمێ ریێ و رەسمێن ئۆلی دهێتە خواندن.

**یشت(Yeşt)**: پەراستن ـ پشکەکە ژ ئاڤێستایێ کو پەسنێن خودێ و فریشتا دکەت.

**یشتن(Yeşten)**: پەراستن ـ پەسن دان، مەدح و ثەنا کرن.

**یشتەکردن(Yeştekerden)**: دوعاکرن، نڤێژکرن.

**یشک(Yeşek)**: ددان، ددانێن تیژ و بڕەکێن گیانەوەرێن درندە.

**یشمە(Yeşme)**: کەڤلێ گیانەوەرا.

**یغام(Yexam)**: دێو، ئافەریدەکێ چیڤانۆکی یە کو ب کەلەخێ خوەڤە زێدە مەزن و روی کرێتە.

**یغتنج(Yextenc)**: جۆرەکێ ماریێ رەنگ زەرە کو لناڤ بیستانا دیار دبت و بێ زیانە ژ بەر کو یێ بێ ژەهرە. هەروەسا (بفتنج و بفتج) ژی لکارن.

**یغلا(Yexla)**: ئاغلەویک. هەروەسا ناڤێن:(یغلاو، یغلاوی، یغلوی و یغلو) ژی لکارن و ل دەڤەرا خوراسانێ پەیڤێن (لغلاو و لغلاوی) ژی بۆ دهێتە گۆتن.

**یغما(Yexma)**: تالان.

**یغمایی(Yexmayî)**: مەبەست ژێ هەر تشتەکێ دەڤەرا «یەغما»یە ل ترکستانێ، نەخاسمە کو روی دەلالێن وان د ناڤدارن.

**یک(Yek)**: هژمار ئێک(۱).

**یکان(Yekan)**: ئێکانە، بێ هەڤتا ـ د زانستێ بیرکاریێ دا ئانکو ئەو هژمارێن کو دکەڤنە د خانا یەکان دا، بۆ نموونە د هژمارا (٣٤٥٦)دا،

هژمارا (٦) يا د خانا يەكان دا.

**يـــك انـــداز(Yek endaz):** ئێكسان، بەرابەر، تەمەت هەڤ.

**يـكـان يـكـان(Yekan yekan):** ئێک ئێکە.

**يكايک(Yekayek):** ئێک ئێکە، ئێک لدويڤ ئێکێ.

**يكپارچه(Yekparçê):** ئێکپارچە، هەمی بهەڤرە.

**يک پهلو(Yek pehlû):** دڕکەیە ژ مـرۆڤێ سـەررەق کـو بەس بۆچۆنا وی پـێ دروسـت تـر بـت ژ هـەمـی بۆچۆنان.

**يكتـا(Yekta):** ب تنێ، ئێکانە، بێ هەڤتا.

**يک تنه(Yek tenê):** ب تنێ.

**يک تهی(Yek tehî):** جلکێ ئێک بەر و تەنک.

**يک تيغ(Yek tîx):** ئێک دەست و ئێک دەنگ د ناڤ مەیدانا شـەڕی دا، هەڤگرتی.

**يكجا(Yekca):** هەمی بهەڤرە، ب تمامەتی.

**يک چشم(Yek çeşm):** مرۆڤێ کو ب چاڤەکی بت و چاڤێ وی یێ دی کـورە بت ـ دڕکـەیە ژ مـرۆڤـێن کـو تشتا ب سەرڤە سەرڤە دبینن و کویر ل وی تشـتـی نافکرن ـ هەروەسـا دڕکەیە بۆ مرۆڤێ منافق ژی.

**يک چند(Yek çend):** دەمـەکی، رۆژگارەکی، سال وەختەکی.

**يكدانه(Yekdanê):** هەر تشـتـێ هێـژا و بێ وێنە ـ گـەردەنیـا کـو مـراریەکـا پڕبهـا تێـدا هاتبـیـتـە بکارئینان.

**يكدست(Yekdest):** مـــرۆڤێ ب دەستەکی ـ ئێکجۆر، ئێک رەنگ، وەکی ئێک ـ ئێکسـان، بەرابەر، تەمەت هەڤ.

**يكدش(Yekdeş):** دوقـۆر(مـرۆڤ یان گـیـانەوەرێ کـو ژ دو نەژادان بـت، ئـانـکـو بـاب ژ نـەژادەکـی و دەیـک ژ نـەژادەکێ دیـتـــــر) ـ خوەشتڤی ـ خواستی.

**يكدک(Yekdek):** تێـهن شـیـر، نیڤ گەرم.

**يـكـدل(Yekdêl):** ئـێـکدل، ئـێـک دەنگ، ئێکدەست، بهـەڤـرە ـ دلپاک، کەسێ کو سەرڤە و بنڤەیێ وی وەکی ئێک بن.

**يكدنده(Yekdendê):** بنێـــرە: (يک پهلو).

**یکران(Yekran):** هەسپ، هەسپێ رەسەن، هەسپێ کو رەنگێ وی زەرێ بناڤ سۆرێ ڤەبۆی ڤە چۆی بت.

**یک زخم(Yek zexm):** کەسێ کو ب دربەکی نەیارێ خوە بێخت ـ نازناڤێ سامێ نەریمانی یە، ژ بەرکو وی ئەژدەهایەک ب دربەکی کوشتبوو ـ ناڤێ گورزێ سامی یە.

**یکسان(Yeksan):** ئێکسان، بەرابەر، وەکهەڤ.

**یکسو(Yeksû):** ئێک ئال، ئێک لا، ئێک رەخ. هەر ژ ڤێ پەیڤێ یە ئەڤ پەیڤێن ژێری: (یکسو شدن: خوە دانە رەخەکی، خوە دانە پاش ـ یکسو نهادن: ل ئالیەکی دانان ـ یکسو کردن: ڤاڤێرکرن، جوداکرن).

**یکسون(Yeksûn):** بنێرە: (یکسان) ـ بنێرە: (یکسو).

**یک شنبە(Yek şenbê):** ئێک شەمبی، دویەمین رۆژا حەفتیێ.

**یک گره(Yek gêrêh):** ئێکگرتی، هەڤپەیمان.

**یک گونە(Yek gûnê):** هەڤرەنگ، وەکهەڤ.

**یک لا(Yek la):** ئێک بەر، پەرۆکێ ئێک بەر ـ جلکێ بێ بەتەن.

**یکە(Yekke):** ب تنێ، ئێکانە، بێ هەڤتا.

**یکەخوردن(Yêkê xorden):** جحنین.

**یگانە(Yegane):** ئێکانە، بێ هەڤتا، بێ هەڤال.

**یل(Yel):** پەهلەوان، دلێر، دلاوەر ـ ئێلەک.

**یلمان(Yelman):** دەڤێ شیری (ئەو جهێ برەک ژ شیری).

**یلە(Yele):** رەها، ئازاد، سەربخوە.

**یوخە(Yoxe):** دەنگێ کو لدەمێ تام دیتن ژ کریارا گوهنێلیێ ژ مرۆڤی دهێت، وەکی: (ئوخ، ئوخەی، ئوف و......هتد) ـ هەروەسا پەیڤەکا بنیات ترکی یە ل ناڤ زمانێ فارسی دا ژی مشە لکارە و واتایا (نانێ تەنک) ددەت.

**یوزیدن(Yûzîden):** داخوازکرن ـ پەیداکرن.

**یوسە(Yûse):** مشار.

**یولاخ(Yolax):** ئەردێ بەیار.

**یون(Yon):** زین.

## ژ کتێبێن چاپکری و بەلاڤبوویێن دانەری



* **ڤیانا جێمک** (ئەڤ کتێبە کۆمەکا هەلبەستێن ب کوردی ڤەهاندی و هۆزانێن وەرگێڕاینە ژ زمانێ فارسی بۆ زمانێ کوردی)
* ڤەهاندن و وەرگێڕانا مسعود خالد گولی
* چاپا ئێکێ، ١٩٩٥، چاپخانا اخلاص، دهۆک



* **ئاوازێن دلی** (ئەڤ کتێبە وەرگێڕانا کۆمەکا پەخشان و هۆزانانە ژ زمانێ فارسی بۆ زمانێ کوردی)
* وەرگێڕانا مسعود خالد گولی
* ژ وەشانێن پرۆژێ یوبیلا زێرین
* چاپا ئێکێ، ١٩٩٦، چاپخانا هاوار، دهۆک




* **بیا از اینجا کوچ کنیم** (ئەڤ کتێبە وەرگێڕانا کۆمەکا هۆزانێن هۆزانڤان «مؤید طیب»ینە ژ زمانێ کوردی بۆ زمانێ فارسی)
* وەرگێڕانا مسعود خالد گولی
* چاپا ئێکێ، ١٩٩٧، چاپخانا کۆلیژا شەریعێ، دهۆک




* **أبر و أنبار و كابوس** (ئەڤ كتێبە كۆمەكا پوستەرە شعر و پۆستەرە چیرۆكێن كوردی یێن «هزرڤان برجینی، باییزێ عەمەری، خالد صالح و اسماعیل بادی»نە بۆ زمانێ فارسی)
* وەرگێرانا مسعود خالد گولی
* ژ وەشانێن كۆڤارا مەتین
* چاپا ئێكێ، ١٩٩٨، چاپخانا خەبات، دهۆك




* **نەخشێ ل بەرا** (ئەڤ كتێبا فولكلۆری، كۆمكرن و شرۆڤەكرنا پەند و ئیدیەمێن كوردینە)
* كۆمكرن و شرۆڤەكرنا مسعود خالد گولی
* ژ وەشانێن لقێ١/نڤێسینگەها راگەهاندنێ
* چاپا ئێكێ، ١٩٩٩، چاپخانا خەبات، دهۆك



* **فەرهەنگۆكا كلاسیكێن كورد** (ئەڤ كتێبە ڤەكۆلین و شرۆڤەكرنا چەندین پەیڤ و ئیدیەم و ناڤ و زاراڤێن صۆفیانەیە د ناڤ هۆزانێن هۆزانڤانێن مە یێن كلاسیك دا)
* نڤیسینا مسعود خالد گولی
* ژ وەشانێن دەزگەهێ موكریانی
* چاپا ئێكێ، ٢٠٠١، چاپخانا خەبات، دهۆك

* **ئەلفـابێـیـا کـوردی و بنگەهێن گـرامـەرا کوردمانجی** (ئەڤ کـتێبە ڤەگوهاستنا کتێبا رێزمـــانا جـــەلادەت ئالی بەدرخــــانی یە ژ رێنڤیـسیا لاتینی بۆ رێنڤیـسا عـەرەبی کو ژ لایێ «عـارف زێرەڤان» ڤە هاتیە کۆمکرن)
* ڤەگوهاستنا مسعود خالد گولی
* ژ وەشانێن دەزگەهێ موکریانی
* چاپا ئێکێ، ٢٠٠١، چاپخانا خەبات، دهۆک

* **بنگەهێن راستنڤیساندنا کوردی(کرمانجی)** (ئەڤ کتێبە ڤەگوهاستنا کتێبا راستنڤیساندنێ یا نڤیسـەر «عـارف زێرەڤان»ی یە ژ رێنڤیسا لاتینی بۆ رێنڤیسا عەرەبی)
* ڤەگوهاستنا مسعود خالد گولی
* ژ وەشانێن دەزگەهێ سپیریز
* چاپا ئێکێ، ٢٠٠٢، چاپخــــانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر

* **فـەرهەنگا گـولی(فـارسی ـ کـوردی)** (ئەڤ کتێبە ئەوە یا کو د دەستێن وەبێن هێژا دا)
* دانانا مسعود خالد گولی
* ژ وەشانێن دەزگەهێ سپیریز
* چاپا ئێکێ، ٢٠٠٢، چاپخــــانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر